زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی
٦






# پەیام و پەیامبەران

وەرگێڕانی

ئارامی گەلالی

نوسینگەی تەفسیر بۆ چاپکردن و بڵاوکردنەوە — هەولێر

بیروباوەڕ لەبەر ڕۆشنایی

قورئان و سوننەتدا

# پەیام و پەیامبەران


نوسینی

دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر

وەرگێرانی

ئارامی گەلالی

زنـــجـــیرەی: بیروبـــاوەڕ لەبـــەر ڕۆشـــنایی قورئان و سوننەتدا
ناوی کتێب بە عارەبی: الرسل والرسالات
ناوی نوسەر: دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر
نۆرەی چاپ: سێیەم
ساڵی چاپ: ١٤٠٥ك - ١٩٨٥ز
ناوی کتێب بەکوردی: پەیام و پەیامبەران
ناوی وەرگێڕ: ئارامی گەلاڵی
ئەرکی چاپ: پرۆژەی وەرگێڕان
پیتچنین: نووسینگەی تەفسیر بۆ کۆمپیوتەر
نۆرەی چاپ: یەکەم
ساڵی چاپ: ١٤٢٠ك - ٢٠٠٠ز
چاپکردن: چاپخانەی پەروەردە
تـــیراژ: ١٥٠٠
ژمارەی سپاردن: ٥٤ ساڵی ٢٠٠٠

# پێشەکی وەرگێڕان

بیروباوەڕی ئیسلامی بناغەی ئاینی ئیسلامی پیرۆزە، تا بەهێزتر بێ موسڵمانێتی بەرهەمدارترو بەرهەمی بەپێزترو پێزی فرەوانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی بو کە گەورەترین وەرچەرخانی بێوێنەی خستە مێژوی مرۆڤایەتی، مرۆڤایەتی لە نشێویو داڕوخان و وێرانی رزگار کرد، رەوشی ستەمئامێزی تارومار کرد، دەستی رەشی زۆردارانی بڕی، کۆیلەو چەوساوانی رەهاکرد، باڵی بەزەییو دادگەری بەسەر جیهاندا راهێڵاو سەرجەم گەل و توێژی خەڵکی لەبەر سێبەرە فێنك و ئارامەکەی هەسایەوە، ئاگری خراپەکاریو کوشت وبڕو تاڵان و بڕۆ و بەرهەڵداییو بێئابڕویی کوژایەوە، روحی مرۆڤپەروەریو رێزی مرۆڤ ژیایەوە.

گەشانەوەی گوڵی چاکەکاریو خۆشیو دادو رێزو هێمنیو خۆشگوزەرانیو ئازادیو سەربەستی بەهۆی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە دێتەدی، بەڵام تەقینەوەی بورکانی وێرانیو خراپەکاریو ناخۆشیو ستەم و بێهودەییو نیگەرانیو تاڵگەردیو ژێر دەستەییو کۆیلایەتیش بەهۆی بیروباوەڕی نائیسلامییەوە بەرپادەبێ، چونکە هەموویان لەسەرچاوەی هەواو هەوەست و ئاوەزی بەرژەوەندیناسی و هێزی کاریگەر بەدەوروبەرێکی دیاریکراو دێنەکایەوە.

بیروباوەڕ ئەگەر ئیسلامی نەبێ وێرانەو وێرانی دەنێتەوە ئەگەرچی بانگەشەی بنیات نان و چاکسازیش بکات. مێژو لەم وێرانکاریانە سیخناخ بوە کە هەرجارەی بیروباوەڕێکی قرپۆك پەیدابوەو مرۆڤایەتی کردۆتە قوربانی ، ئەدی بیروباوەڕە سەفسەطیەکەی نەسرانیەکان نەبو کەبەر لەئیسلام و تاکو ئێستاش کێشەیانە ئاخۆ (مەسیح) خوایە یان مرۆڤ! هەزاران هەزار مرۆڤی کردە قوربانیو سەدان شەڕو کوشتاری درێژخایەنی نایەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی ئەستێرەناسی گەندەڵی فیرعەونەکان نەبو کە هەزاران هەزار رەش و روت و هەژاری کردە کۆیلەو بەبێگاری گاشەبەردە زلەکانی ئەهراماتی پێ دەگواستنەوە؟!، ئەدی بیروباوەڕی شوفێنیزمی ئەوروپا نەبو کە دوجەنگی گەورەی جیهانی بەرپاکرد و بەملیۆنان مرۆڤیان کرد بە قوربانی؟!، ئەدی هەر بیروباوەڕە شەیتانیەکان نیە کە وای کردوە هەموو رۆژی بۆمبای ئەتۆمیو هایدرۆجینیو نیوترۆنی بۆ وێرانکردنی مرۆڤایەتیو زەوی وەبەرهەم بێ؟!

چاك سازانەوەی رەوشی مرۆڤایەتی، رەوینەوەی ترسی وێرانی، گەڕانەوەی خۆشیو ئارامی، بەرپاکردنەوەی دادگەری لەسەرتاسەری جیهاندا؛ بەهۆی بزاڤێکەوە دەبێ کە لەسەر بیروباوەڕێکی پاك و بێگەرد دامەزرا بێو لەقورئان و سوننەت هەڵێنجرا بێ، ئەگەر نا هەر وێرانی لەناو وێرانی بەرپادەبێو مرۆڤایەتی وێرانتر دەبێ.

بیروباوەڕی ئیسلامی کاریگەرێکی قوڵ و گەورەی لەخۆ گرتوە، کاریگەرێکی ئەوتۆ کە ئەگەر مرۆڤ هەرچەندی تاوانکارو دڵڕەق و بێبەزەییو وێرانکاریش بێ، سەرلەبەری کیانی ئەم مرۆڤە دەگۆڕێت، گۆڕانێك هەمو لایەنەکانی بگرێتەوە، چونکە بیروباوەڕی ئیسلامی چارەسەرو

ئامۆژەکانی بۆ رەگ و ریشاڵی مرۆڤە، هزرو ئاوەزو دەرونی رێك دەخاتەوەو تەپ و تۆزی شەیتان و هەوەست و خۆپەرستی لەسەر دەرونی لادەدات و پاکی دەکاتەوە، ئەمجار رێوشوێنێکی راستاڵی بۆ رادەنوێنێ‌و پێی دەڵێ فەرمو ئەمەش ژیانی خۆشبەخت و بێوێنەو نمونەیی.

هەر نوسەرێکی موسڵمان لەهەر دەرگایەکەوە چوبێتە نێو ئەم بیروباوەڕەوە یان لەهەر گۆشە نیگایەکەوە تێی روانیبێ‌و خزمەتێکی پێشکەش کردبێ و متمانەی بەسەرچاوەی بێگەردو دور لە خورافات و شتی بێهودە کردبێ، هەڵبەت کارێکی گەورەی ئەنجام داوەو خزمەتەکەی بەشێکە لەم رزگاربونە سەرتاسەریەی کە مرۆڤایەتی دەمێکە بۆی عەوداڵە. دیارە ئەم زنجیرەیەی کە دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر نوسیویەتی‌و ناوی ناوە ((العقیدة في ضوء الکتاب والسنة)) بەشداربون و خزمەتێکی گەورەی ئەم مەیدانەیە، کە متمانەی کردۆتە سەر سەرچاوەو ژێدەرە رەسەنەکانی بیروباوەڕو بیروباوەڕە پوکەڵ و لاڕێ‌و ناتەواوەکانی لێ داوەشاندوەو پاك و پوختەکەی راگەیاندوە، کە هەڵبەت ئەمە خاڵی هەرە سەرەکیە لەرانواندنی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، ئوسلوبێکی سادەو رێك و پێك و زانستیانەی بەکارهێناوە بەتایبەتی لەپەرتوکەکانی دواییدا، ناوەڕۆکی پەرتوکەکەش پڕ ئایەت و فەرمودەو دەقی زانا بەرزەکانی هێناوەتەوەو لەبەرتیشکی ئەم دەقانەوە بیروباوەڕەکەی رۆشن کردۆتەوە، ئەم زنجیرەیە کە بڵاوبۆوە موسڵمانان بەگەرمی پێشوازیان لێکردو گەلێ زاناو نوسەریش لە نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ کردوە تا موسڵمانان بەهرەی لێوەرگرن، لەناو موسڵمانانی کوردیش سەیر دەکەین چەندین نۆرە چاپی لێ دەردەکرایەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە بۆ چاکی‌و سودی ئەم زنجیرەیە، بەم پێودانگە پێمان وایە

وەرگـێرانی ئـەم زنجیرەیـە گـەلێك پێویسـت بـو بـۆ رابونـی ئیسـلامی لەکوردستان، تا گەلی کوردیش لەبیروباوەڕە سازگارەکەی خۆی حاڵی بێت و لاڕێ نەبێ، لەبەر گرنگیو لەبەر چاکیو بەهرەی ئەم زنجیرەیە، پشت بەخوا بڕیارمان دا وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی، لەوەرگێڕانەکەدا هەوڵمان داوە ئاستێکی زمانەوانی باشی پێبدەین و ئیشکالات بۆ خوێنەر بەجێنەهێلین، وا بەرهەمەکان لەبەردیدی خوێنەرانەو ئەوان دەتوانن وەرگێڕانەکە هەڵسەنگێنن ، لەخوا داواکارین لەکارەکەماندا سەرکەوتووبین و توانیبمان خزمەتێك بەم رابونە پیرۆزەی کوردستان بکەین، خوا پاداشتی بەرهەراوی خۆی بەئێمەو ئێوەش ببەخشێ.

ژیوانی گەلاڵی　　　　ئارامی گەلاڵی

# ڕێخۆشەکی

﴿الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا، قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا، مَاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا﴾الكهف/١-٣.

**ستایش بۆ ئەو خوایەی پەڕتوکێکی بۆ ناردوین کە باسی پێشین و پاشینانی تێدایە، ناوبژێکار و دەرمانە، وتەکانی یەکلاکەرەوەیە گاڵتە نیە، ئەو کەسەی خۆی لێ لەساڵۆزی بدات خوا پشتی لە ئەرزی دەدا، ئەو کەسەی بیەوێ بە ڕێبازی‌تر ڕێنوێن ببێ گومڕا دەبێ، ڕێسمانی پتەوی خوایە، یادی فرەزانە، ڕاستەڕێیە، ئارەزوی پێ هەڵنافرێوێ، زمانی پێ تێکنائاڵێ، سەمەرەکانی بنی نایەت، زانایان لێی تێر نابن، ئەو کەسەی بە وتەکانی بدوێ ڕاستگۆیە، کرداری پێ بکا خەڵات دەکرێ، فەرمانڕەوایی پێ بکات دادگەر دەبێ، ئەو کەسەی بۆی بانگ بکرێ و بێتە سەرڕێ بۆ ڕێی ڕاست ڕێنوێن بوە.[1]**

**درودو سڵاو پێشکەشی موحەممەدی بەندەو پەیامبەری خوا کە (خوا ڕێنوێنیەکی ڕاست و ڕەوای پێ ناردوەو کردویە بە مۆژدە بەخش و هەڕەشەگار، بانگبەرێکی خوایەو بە ودمی خوا خەڵك بۆلای خوا بانگ دەکات، وەکو مانگی درەخشانە پەیامی پێ کۆتا بو، گومڕایانی پێ ڕێنوێن بو، گوێی کەڕی ژنەوا کرد، دڵی گاڵەدراوی واڵا کرد، پەیامەکەی تاریکستانی سەر زەوی**

---

١ ئەم وتانە وەرگێڕدراوی فەرمودەیەکی ئیسناد زەعیفی بێژانەوەی ترمزییە، بەڵام واتاکەی جوان و پڕپێزە، بۆیە ئێمەش بە پەسندمان زانیوە لێرەی بێنینەوە بەڵام ئاماژەمان نەکردوە فەرمودە بێ، چونکە زەعیفە.

تاراندو روناکی بەخشی، دڵانی پەرتەوازەی هۆگری یەك کرد، رێبازی چەوێڵی راستەقان کرد، ناوەندەڕێی روناك کرد، خوا سینەی گوشاد کرد، قورسی لە ئەستۆ هەڵگرت، یادی هەڵبڕی، دژکارو یاخییانی زەبون و ریسوا کرد، کاتێك ناردی کاتی خەفتانی پەیام و نەخوێندنەوەی پەرتوکان بو، وتەی خوا گۆڕدرابو، بەرنامەو پەیامی خوا دەست تێوەردرابو، هەمو کەس و گەل و نەتەوەکان پەیڕەویان لە هەزری تاریکی خۆیان دەکرد، بە ئارەزوی وتەی گەندەڵ و هەوەستی پەست و وتەی نابەجێیان بەخوا هەڵدەبەست، خوا بەسای ئەو پێغەمبەرە مەزنەوە ﷺ ئافەریدانی رێنوێن کرد، رێگای رۆشن کرد، خەڵکی لە تونەکی تاریکیەوە بۆ رۆشنی روناکی رەها کرد، تانەی نەفامی سەرچاوانی لابرد، رێی سەرفرازی نیشان دا، خوا کردی بە هاوێرکاری خەڵکانی بەهەشت و دۆزەخ، کردی بە جوداکاری نێوان بەدکار و چاکەکاران.

رزگاری و رێنوێنی لە رێی ئەو دایە، گومڕاییو نەگبەتی لە سەرپێچیکردنی ئەو دایە، لە گۆڕدا خەڵکانی پێ دەئەزموێ، لەبارەی ئەو پرسیاریان لێ دەکرێ.[٢]

هەروەها درود پێشکەش بۆ خانەوادەی خاوێن و پاکی، بۆ یارو یاوەرانی، کە چاکترین و زاناترین نەوەی نەتەوە بون، لە ژیندا بێ گرێو گاڵترین کەس بون، سڵاو بۆ ئەوانەش کە رێبازەکەیان دەگرن و بەچرای ئیسلام رێڕوناك دەبن و رێنوێنی قورئان دەئامێز دەگرن و شوێنپێی پێغەمبەری دواهەمینیان ﷺ هەڵدەگرن.

خوێنەری ئازیز!

ئەم پەرتوکەی بەردەستت بەشی چوارەمە لە زنجیرەی (بیروباوەڕ لەبەر رۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، ئەمەشیان ئەوانی تر ئاسا بە ئامانجی

---

٢ ئەم وتە جوان و ناسکەو بەپێزە هی زانای ناوداری ئیسلام ئیبنو تەیمیەی شێخی ئیسلامە، تەماشای (لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٢) بکە.

دەرخستنی بیروباوەڕێکەوە نوسراوە کە لە ژێدەرە رەسەن و بنەڕەتیەکانەوە سەرچاوەی گرتبێ، دورە لە وشکیو ئاڵۆزیو زاراوەی رەزا قورسی فەلسەفی و کەلامناسی.

هەڵبەت بابەتەکانی پەیام و بابەتەکانی پەیامبەران هێند تێکەڵاو و بەیەکەوە گرێدراون بۆیە بە پەسندم زانی هەردوکیان لەیەك بەرگدا کۆبکەمەوە، هەر لەبەر ئەوەشە دەروازەی یەکەم درێژی کێشاوەو دەروازەی دوەمیش هێندەی نەبردوە، ئەوەش چونکە جێباسەکانی پەیامبەران زۆر لە جێباسەکانی پەیامیشی لەخۆ گرتوە، دەروازەی یەکەم بریتیە لە هەشت بەند؛ لە بەندی یەکەمدا وشەی (النبي) و (الرسول)م پێناسە کردوەو جیاوازی نێوانیانم دەرخستوە، رونم کردۆتەوە کە بڕواهێنان بە پێغەمبەران واجبەو بڕوانەبون بە پێغەمبەران یا بڕوابەخوابونیشی لەگەڵدابێ هەر بێبڕواییە، یان ئەگەر جیاوازی بخاتە نێو پێغەمبەران ئەمەشیان هەر بێبڕواییە، ژمارەی پێغەمبەران و ناوی ئەوانەش کە لە قورئان و فەرمودەدا هاتوە هەمویانم رون کردۆتەوە.

لە بەندی دوەمدا ئەوەم رون کردۆتەوە کە ئێمە چەندە ئاتاجمان بە پەیام و پەیامبەران هەیەو مرۆڤ ئاوەزی بەس نیە تا دەستبەرداری سروشی خوایی بێ.

لە بەندی سێیەمدا کەمێك بە فرەونی ئەرکی پێغەمبەرانم رانواندوە.

لەبەندی چوارەمدا ئەو رێگایەم ناساندوە کە خوا پێغەمبەرانی پێ فێر دەکات کە سروشە، ئینجا پایەکانی سروش، پاشان سیفەت و شێوەی هاتنی فریشتەی سروش بۆلای پێغەمبەر ﷺ.

لەبەندی پێنجەمدا سیفەتەکانی پێغەمبەرانم باس کردوە، رونم کردۆتەوە پێغەمبەرانیش ئێمەئاسا مرۆڤ بون، رونم کردۆتەوە نەدەکرا مرۆڤ نەبن، بەبەڵگەوە باسی ئەوەشم کردوە کە پێغەمبەران گەیشتونەتە ترۆپی مرۆڤایەتی،

له کۆتاییەکەشدا هەندێ لەو کاروکردانەم هێناوەتەوە  کە تەنها بە پێغەمبەران تایبەتە.

لە بەندی شەشەمدا کەمێك بە درێژی باسی پارێزراوێتی پێغەمبەرانم کردوە، ئەو شتانەم رون کردۆتەوە کە مایەی پارێزراوێتین، هەروەها ئەو شتانەش کە لێیان پارێزراو  نین، رای جیاواز و بۆچونی چینە ناکۆکەکانم لەم بارەوە هێناوەتەوەو ناڕاستەکەم پوکەڵ کردۆتەوە.

لە بەندی هەفتەمدا قسە قسەی راکێشاوەو باسی بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتیو نیشانەکانی پێغەمبەرانی پێشوم کردوە، کەمێك بە  فرەوانیش باسی نیشانەو موعجیزەکانی پێغەمبەر موحەممەدم ﷺ کردوە، هەندێ لەو موژدانەشم هێناوەتەوە کە پێغەمبەران باسیان کردوە، هەروەها ئەوەشم رانواندوە کە (ژین وژیوارو بانگەوان)ی پێغەمبەران بەڵگەو نیشانەی پێغەمبەرایەتین، هەر کەسێکی بەرچاوڕون و رێنوێنیخواز لەم دوانە رامێنێ، چاری نیە هەر بڕوا دێنێ.  بەڵگەی پێنجەم کە هێناومە پشتیوانیو هاریکاری خوایە بۆ پێغەمبەرانی.

بەندی هەشتەمم تایبەت کردوە بە پایەو بەرزونزمی پێغەمبەران، پێغەمبەران باشترینی مرۆڤن، ئەوانیش لەنێو خۆدا بەرزو نزمییان هەیە، ئەو کەس و چینانەش کە هەندێ کەسیان لە  پێغەمبەران بە بەرزترو چاکتر داناوە گومڕان و لەگەڵ یەکدەنگی موسڵمانان پێژەوانەن و گەندەڵێ وتەکانیانم دەرخستوە.

دەروازەی دوەم دەربارەی پەیامە ئاسمانیەکانە، ئەویش دو بەندە:

بەندی یەکەم لە بارەی بڕوابونە بە پەیامەکانیان، رونم  کردۆتەوە بڕواهێنان بەسەرجەم پەیامەکانیان واجبەو، ئەم بڕوایەش چۆن دەبێ.

لە دەروازەی دوەمیشدا بەراوردێکم لەنێوان پەیامە ئاسمانیەکاندا کردوە، تا ئەم مەبەستانەی لێ رۆشن بێ:

یەکەم: ژێدەرو ئامانجی ئەم پەیامانە.

دوەم: کامیان گشتی و کامیان تایبەتە.

سێیەم: پاراستنیان لە گۆڕین و دەستکاری.

چوارەم: ئەو جێگایانەی وەکو یەك و نایەکن لەنێوان پەیامەکاندا.

پێنجەم: درێژو کورتی و ماوەی دابەزین.

لەکۆتایی ئەم دەروازەیەشدا باسی هەڵوێستی پەیامی کۆتاییم لە ئاست پەیامەکانی پێشودا کردوە.

ئیتر داواکارم لەخوا پێز بخاتە کات و کارمان، کردەوەمان پاك لەپێناو ئەودا بێت، لە وتەو کرداری نابەجێ بمانپارێزێ، ئەم پەرتوکەش بکاتە مایەی بەهرەمەند بونی بەندەکانی، خوایە خۆت ئاگاداری، درودوسلاو بۆ پێغەمبەری پێشەوامان.

دکتۆر عومەر سلێمان ئەشقەر

کوەیت

٢ رەبیعی یەکەم ١٤٠١ك

٨ کانونی دووەمی ١٩٨١ز

# دەروازەی یەکەم

# پەیامبەران

# بەندی یەکەم

# پێناسە و ڕونکردنەوە

## پێناسەی پێغەمبەر:[3]

وشەی پێغەمبەر (النبي) لە زمانی عەرەباندا لە ڕیشەی (نبأ) وەرگیراوە کە بە واتای هەواڵ (خبر) دێت، خوا دەفەرموێ:

﴿عَمَّ يَتَسَاءَلُونَ، عَنْ النَّبَإِ الْعَظِيمِ: ئەوانە لە چ دەپرسن لە هەواڵێکی گەورەو مەزن؟!﴾ النبأ/١-٢.

پێغەمبەر بۆیە پێی گوتراوە (النبي) چونکە هەواڵ پێدراو و هەواڵدەرە، هەواڵ پێدراوە چونکە خوا هەواڵی پێداوەو سروشی بۆ هەناردوە: ﴿قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا ؟ قَالَ نَبَّأَنِي الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ: بە پێغەمبەری گوت: کێ هەواڵی پێداوی؟ گوتی: خوای زاناو شارەزا هەواڵی پێداوم ﴾ التحريم/٣.

هەواڵدەریشە چونکە فەرمایشت و سروشی خوا بە خەڵکان ڕادەگەیەنێ: ﴿نَبِّئْ عِبَادِي أَنِّي أَنَا الْغَفُورُ الرَّحِيمُ: هەواڵ بدە بەندەکانم کەمن لێبوردەو

---

٣ بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: لسان العرب ٥٦١/٣، ٥٧٣،بصائر ذوي التمييز ١٤/٥، لوامع الأنوار البهية ٤٩/١، ٢٦٥/٢.

بەخشندەم ﴾ الحجر/٤٩، ﴿وَنَبِّئْهُمْ عَنْ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ: هەواڵی میوانەکانی ئیبراهیمیان پێ ڕاگەیەنە﴾ الحجر/٥١.

هەروەها هەندێك وتویانە (النبوة) لە ڕیشەی (النَّبوة) وەرگیراوە کە بە شوێنێك دەگوترێ لە ئاستی زەوی بەرزتر بوبێتەوە، هەروەها عەرەبەکان وشەی (النبي) بۆ نیشانەکانی زەوی بەکار دێنن تا ڕێوجێی پێ بناسنەوە.

واتای زاراوەیی و زمانەوانی وشەی (النبي) لەوە یەکدەگرنەوە کە پێغەمبەران هەم لە دنیاو هەم لەودنیا پایەی بەرزو ڕێزێکی فرەیان هەیە، چونکە پێغەمبەران بە شکۆترینی خەڵکانن و ئەوانن ئەو نیشانانەی کە خەڵك پێیان ڕێنوین دەبن و ژین و ژیانەوەیان پێ بەختەوەر دەبێ.

## پێناسەی ( پەیامبەر - الرسول )[4]

لە زماندا (الإرسال: ناردن) بە واتای ئاڕاستە کردن دێت، ئەگەر کەسێکت بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکێك نارد ئەو کەسە دەبێتە نێردراو، خوا وتەی شاژنی (سەبەء) دەگێڕێتەوە: ﴿وَإِنِّي مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِمْ بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌ بِمَ يَرْجِعُ الْمُرْسَلُونَ﴾ النمل/٣٥.

ڕەنگە بەو کەسەش بڵێن نێردراو کە سۆراغی هەواڵی نێردەیەك دەکات، ئەمەش بەگوێرەی ئەم وتەیەی عارەبان کە دەڵێن (جاءت الإبل رسلا: وشترەکان یەك لەدوای‌یەك و پەیتاپەیتا هاتن).

پەیامبەران لەبەرئەوە بە پەیامبەر ناودێر کراون چونکە لەلای خواوە ئاڕاستە کراون: ﴿ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا﴾ المؤمنون/٤٤. پەیامبەران پەیامێکیان پێ ئەرکبار کراوە و دەبێ بەخەڵکی ڕاگەیەنن و مشوری بخۆن.

---

٤ بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ: لسان العرب ٢/١١٦٦-١١٦٧، المصباح المنير ص٢٢٦.

## جیاوازی نێوان پەیامبەر و پێغەمبەر:

ئەو بۆچونەی پێی وایە جیاوازی لە نێوان پەیامبەرو پێغەمبەردا نیە بەهەڵەدا چوەو نەیپێکاوە، بەڵگەش ئەم فەرمودەیە[5] کە پێغەمبەر ﷺ باسی ئەوەی کردوە کە ژمارەی پێغەمبەران سەدو بیست و چوار هەزارە، ژمارەی پەیامبەرانیش سێ سەدو دە-پازدەیەکە.

ئەم ئایەتەش بەڵگەیە کە هەردوکیانی لەیەك جیاکردۆتەوەو (نبي) عەتف کردۆتە سەر (رسول): ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلاَ نَبِيٍّ إِلاَّ إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ﴾ الحج/٥٢.

هەندێ لە پێغەمبەرانی هەم بە پەیامبەر و هەم بە پێغەمبەر وەسف کردوە، ئەمەش وا نیشان دەدات کە (پەیام) شتێکی زیاترە لە (پێغەمبەرایەتی)، وەك خوای گەورە لە بارەی پێغەمبەر موساوە دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولاً نَبِيًّا﴾ مريم/٥١.

لەلای زانایاندا وا بڵاوە کە پەیامبەر لە پێغەمبەر گشتیترە، دەڵێن: پەیامبەر ئەو کەسەیە کە خوا شەرعی بەسروش بۆ ناردوەو فەرمانی پێکردوە رایگەنێ، پێغەمبەریش ئەو کەسەیە کە خوا سروشی بۆ کردوە بەڵام فەرمانی پێنەکردوە رایگەیەنێ، بەم پێوانە هەمو پەیامبەرێك پێغەمبەرە، بەڵام هەمو پێغەمبەرێك پەیامبەر نیە.[6]

---

٥ فەرمودەیەکی تەواوەو ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتیەوە

٦ شرح العقيدة الطحاوية (١٦٧)، لوامع الأنوار البهية (٤٩/١).

هەڵبەت ئەم بۆچونە نەپێکاوە لەبەر ئەوەی:

یەکەم: خوا ئایەتی فەرموە کە چۆن پەیامبەری ناردوە ئاوەهاش پێغەمبەری ناردوە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ ﴾ الحج/٥٢، جا ئەگەر جیاوازی لەنێوان پەیامبەر و پێغەمبەر راگەیاندن بوایە ئەوا ناردن کە لە (أرسلنا)ی ئایەتەکەدایە پێغەمبەریش دەگرێتەوە، کەواتە پێغەمبەریش بەرفەرمانی راگەیاندنە.

دوەم: رانەگەیاندنی پەیامی خوا شاردنەوەی سروشی خوایە، خواش سروش بۆ ئەوە دانابەزێنێ بشاردرێتەوەو لە سینگی یەك تاقەکەسدا مات ببێ‌و بە مەرگی ئەو بمرێ.

سێیەم: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((عرضت عليّ الأمم فرأيت النبيّ ومعه الرهط، والنبيّ ومعه الرجل والرجلان، والنبيّ وليس معه أحد...: نەتەوەکانم بۆ رانوێنرا، هەندێ پێغەمبەرم دیت هەشت-نۆ کەسی لەگەڵدا بو، هەندێکیتر یەك دو کەسیان لەگەڵدا بو، پێغەمبەریش هەبو کەسی لەگەڵ نەبو)).[7]

ئەم فەرمودەیەی سەرەوە بۆ (پێغەمبەر) بەڵگەیە کە فەرمانی پێکراوە پەیامی خوا بە خەڵك رابگەیەنێ.

پێناسەی راست و دروست ئەوەیە کە (پەیامبەر: ئەو کەسەیە سروشی شەرعێکی تازەی بۆ کراوە، پێغەمبەریش ئەو کەسەیە کە خوا دەینێرێ تا شەرعی پێشەخۆی بڵاو و نوێ بکاتەوە).[8]

---

٧ بوخاری‌و موسلیم و ترمذی و نەسائی گێڕایتیانەوە.

٨ تەفسیری ئالوسی (١٥٧/١٧).

لە فەرمودەیەکی[9] پێغەمبەردا هاتوە کە نەوەی ئیسرائیل پێغەمبەران کاروباری هەڵدەسوڕاندن، هەرکە پێغەمبەرێکیان بمردبا، ئەوا دەستبەجێ پێغەمبەرێکی دیکەیان بۆ دەهات.

پێغەمبەرانی نەوەی ئیسرائیل هەر هەمویان بەرنامەی موسایان رادەگەیاندەوە کە (تەورات) بو، فەرمانیشیان پێکرابو رایگەننەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الْمَلَإِ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ بَعْدِ مُوسَى إِذْ قَالُوا لِنَبِيٍّ لَهُمُ ابْعَثْ لَنَا مَلِكًا نُقَاتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قَالَ هَلْ عَسَيْتُمْ إِنْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ أَلَّا تُقَاتِلُوا﴾ البقرة/٢٤٦.

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێ کە پێغەمبەر ﷺ سروشی بۆ دەکرێو فەرمانیش بە گەلەکەی دەکات، ئەمەش ئەو کاتە رادەپەڕێنرێ کە راگەیاندن واجب بێ.

داود و سلێمان و زەکەریا و یەحیا هەمویان پێغەمبەر بون، کاروباری نەوەی ئیسرائیلیان هەڵسوڕاندوەو فەرمانڕەواییان لە نێواندا کردون و راست و رەوایان پێ راگەیاندون.[10]

---

٩ بوخاری لە صەحیحەکەیدا گێڕاپتیەوە، تەماشای فتح الباری (٦/٤٩٥) بکە.

١٠ هەڵبەت لە زمانی کوردیدا ئەم داتاشرانە بۆ وشەی پێغەمبەر نیە، هەروەها تەنها وشەی پێغەمبەر و پەیامبەرمان بۆ وشەی (الرسول) و (النبي) هەیە کە پێغەمبەریش لە بنەڕەتدا پەیغامبەر بوە، (پەیغام)یش واتە پەیام، بەڵام ئێمە تەنها لەم گۆشە زمانەوانیەدا بۆ وشەی (الرسول) پەیامبەرمان داناوەو بۆ (النبي)یش پێغەمبەر ئەگینا لە سەر پاکی ئەم پەرتوکەدا کە وشەی پێغەمبەر بەکار هاتوە، واتای زمانەوانیان پێ مەبەست نیە، کوردەواری خۆشمان هەر پێغەمبەر بەکاردێنن بەڵام لە نوسیندا جارجارە پەیامبەر وادێ بەکار بهێنرێت، ئەمە لە لایەك لەلایەکیتر وەکو زانیمان (الرسول) و (النبي) لەروی ئەرکەوە تەنها جیاوازیان پەیامدارێتیە، واتە ئەو جیاوازیەی بۆ بیروباوەڕ گرنگ بێ زاراوەییە نەك زمانەوانی بۆیە زۆر ئاساییە کەلە کوردەواریدا لە قسەو خواسی ئاساییدا تەنها پێغەمبەر بەکاردێت، بەڵام ئەگەر بێینە سەر جیاوازی زمانەوانیو زاراوەیی، بێینە سەر شیکردنەوەی زانستیانەو لە قسەی ئاسایی

## یەك لە بنەڕەتەکانی بڕوا بڕوابونە بە پێغەمبەران:

بڕوا هێنان بە پێغەمبەران یەکێکە لە بنەڕەتەکانی بڕوا، خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَالنَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ: بڵێ بڕوامان هێنا بەخواو بەوانەی بۆمان دابەزیوە، بەوانەش کە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و ئەسباط دابەزیوە، هەروەها بەوانەش کە دراوەتە موساو عیساو پێغەمبەرانیتر، جیاوازی لەنێوان پێغەمبەران ناکەین و، بۆیان گەردەن کەچین﴾ آل عمران/٨٤، ئەو کەسەی بڕوای بە پێغەمبەران نەبێ ئەوا گومڕاو سەرگەردان و بێمایەو زیانبارە: ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا: هەر کەسێك بێبڕوا بێ بەخواو فریشتەو پەڕتوك و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی ئەوا لە گومڕاییەکی بێ ئەندازە دایە﴾ النساء/١٣٦.

---

دەرچین نەوا-وەکو وتمان-پێمان باشە وشەی پێغەمبەر بۆ (النبي) و پەیامبەر بۆ (الرسول) بەکاربێت.- وەرگێڕ-

## پەیوەندی نێوان بڕوابون بەخواو بڕوابون بە پەیام و پەیامبەران:

ئەوانەی پێیان وایە بڕوایان بەخوا هێناوەو بڕوایان بە پێغەمبەران و پەڕتوکان نیە، ئەوانە ئەندازەی مەزنیی خوایان نەزانیوە: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَى بَشَرٍ مِنْ شَيْءٍ: ئەوانەی دەڵێن خوا هیچ شتێکی بۆ مرۆڤ دانەبەزاندوە، ئەندازەی مەزنێتی خوایان نەزانیوە﴾ الأنعام/٩١، چونکە ئەوانەی ئەندازەی مەزنێتی خوا دەزانن و بە سیفەتەکانی وەکو زانست و لێزانی و میهری خوا ئاشنان لەوە دڵنیان کە خوا پێغەمبەرانی ناردوەو پەڕتوکانی دابەزاندوە، چونکە ئەو هەناردنە یەکێکە لە داخوازیو بەرهەمەکانی سیفەتە پیرۆزەکانی خوا، خوا ئافەریدانی بەبێ مەبەست و بێهودە ئافەریدە نەکردوە: ﴿أَيَحْسَبُ الإِنسَانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدًى: مرۆڤ پێی وایە بەرهەڵدا بکرێ؟﴾ القیامة/٣٦، گەر یەکێك بڕوای بە پێغەمبەران نەهێنابێ، لەلای خوا بە بێبڕوا هەژمار کراوە، ئەوجا با هەر خۆی بە بڕوادار هەژمار بکات: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً، أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا: ئەوانەی بە خواو پێغەمبەران بێبڕوان و دەیانەوێ جیایی بخەنە نێوان خواو پێغەمبەران و، دەڵێن بڕوامان بە هەندێ پێغەمبەر هێناوەو بێبڕواشین بە هەندێکیان و، دەیانەوێ لەو ناوەڕاستەدا ڕێگایەك بگرنە بەر و بڕواو بێبڕوایی لەیەك گرێدەن، هەڵبەت ئەو جۆرە کەسانە بێبڕوای ڕاستەقینەن﴾ النساء/١٥٠-١٥١.

ئەم ئایەتە مۆری بێبڕوایی لە نێوچەوانی ئەوانە داوە کە بڕوایان بەخوا هێناوەو بە پێغەمبەرانیش نا، کە دەیانەوێ نێوانی خواو پێغەمبەرانی بکەن: ﴿وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ النساء/١٥٠.

(قورتوبی) لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێ: خوا لەم ئایەتەدا فەرمانی داوە کە جیاوازی خستنە نێوان بڕوابون بەخوا و بڕوابون بە پێغەمبەران بێبڕواییە، چونکە خوا عیبادەتی لەسەر خەڵکی فەرزکردوە بە پێی ئەو شەرعەی کە خۆی ناردویەتیو پێغەمبەران رایدەگەیەنن، جا ئەگەر بە پێغەمبەران بێبڕوا بن، واتای ئەوەیە شەریعەتەکانیشیان رەت کردۆتەوەو قبوڵیان نەکردوە، کەواتە پابەندی ئەو بەندایەتیە نابن کە فەرمانیان پێ کرابو، ئەمەش وەکو ئەوەیە ئینکاری خوا بکات، ئینکاریکردنی خواش بێبڕواییە، لەبەر ئەوەی واز لە بەرفەرمانی و بەندایەتی دێنێ، جیاوازی خستنە نێوان خواو پێغەمبەریش هەر بەم جۆرەیە.[11]

## پێغەمبەران کۆمەڵێکی زۆرو زەبەندن:

دانایی‌و لێزانی خوای بەرزو پیرۆز وای خواستوە کە بۆ هەریەك لە سەرجەم گەل و نەتەوە رابردوەکانی سەر زەوی پێغەمبەر بنێرێ، هیچ جارێکیش نەبوە پێغەمبەرێکی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی ناردبێ، تەنها موحەممەد ﷺ نەبێ، دادی خوا وای خواستوە تا بیانوی ئافەریدانی نەبڕێ سزایان نەدات: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ

---

١١ تەفسیری قورتوبی (٥/٦)

حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً: هەرگیز سزای کەسمان نەداوە تا پەیامبەرمان بۆ ناردوە﴾ الإسراء/١٥، لەبەر ئەوەیە ژمارەی پێغەمبەران لەتەواوی مێژوی مرۆڤایەتیدا تا بڵێی زۆر بوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خَلاَ فِيهَا نَذِيرٌ: نەتەوە نەبوە پێغەمبەری نەبوبێ﴾ فاطر/٢٤.

پێغەمبەریش ﷺ ژمارەی پێغەمبەرانی پێگوتوین: ئەبوذەر (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ پرسی: ئەی پەیامبەری خوا؛ ژمارەی پەیامبەران چەند بوە؟ فەرموی ئاپۆرەیەکی زۆربونە، سێسەدو دەپازدەیەك دەبن. لە گێرانەوەیەکی تری ئەبو ئومامەدا (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ئەبو ذەر (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پرسیم ئەی پێغەمبەری خوا ژمارەی پەیامبەران چەندبوە؟ فەرموی: سەدو بیست و چوار هەزار، سێسەدو پازدەیان پەیامبەر بون. (ئیمام ئەحمەد لە موسنەد گێڕایتیەوە).[12]

## خوا هەندێ لە پێغەمبەرانی بۆ باس نەکردوین:

قورئانی پیرۆز لە زۆر جێگادا لەم هەمو ژمارە زۆرەدا تەنها چەند پێغەمبەرێکی پێناساندوین، خوا دەفەرموێ ﴿وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلاً لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ: هەندێ لە پێغەمبەرانمان بۆ باس کردوی و

١٢ مشكاة المصابيح ١٢٢/٣، شێخ ئەلبانی لێکۆڵەری (مشکاة) دەڵێ: ئیسنادەکەی صحیحە.

سەرگوزەشتەی چەندانیشمان بۆ باس نەکردوی﴾ النساء/١٦٤، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِنْ قَبْلِك مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْك وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْك: پێغەمبەرێکی گەلێ زۆرمان بەر لەتۆ هەناردوە کە هەندێکمان بۆ باس کردوی و سەر گوزەشتەی زۆرانیشمان بۆ نەگێڕایتەوە﴾ غافر/٧٨.

دەبێ بڕوامان بەوانە هەبێ کە خوا لە قورئانێدا یان پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەدا پێی راگەیاندوین، هەروەها بڕواشمان بەوە هەبێ کە زۆرانی تریش یادیان نەکراوە و نایانزانین.

## ئەو پێغەمبەرانەی لە قورئاندا یادیان کراوە:

خوا لە قورئاندا بیست و پێنج پێغەمبەری بۆ یاد کردوین لە شوێنی جیاجیادا، باسی ئادەم و هودو سالح و شوعەیب و ئیسماعیل و ئیدریس و ذولکیفل و موحەممەدی کردوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ : خوا ئادەمی بە پێغەمبەر هەڵبژارد﴾ آل عمران/٣٣، ﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا: بۆ گەلی عاد هودی برامان بە پێغەمبەر نارد﴾ هود/٥٠، ﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا: بۆ گەلی ثەمود سالحی برامان بە پێغەمبەر نارد﴾ هود/٦١، ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا﴾ هود/٨٤، ﴿وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِنْ الصَّابِرِينَ: ئیسماعیل و ئیدریس و ذەلکفل هەمویان پێغەمبەری ئارامگر بون ﴾ الأنبياء/٨٥، ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ ﴾ الفتح/٢٩، هەژدەشیان لە یەك شوێندا یادیان کراوە: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ

نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ، وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِنْ قَبْلُ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ، وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِنَ الصَّالِحِينَ، وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ: **ئەو نیشانانەی لە ئایەتەکانی پێشودا باسکران ئەو بیانوبڕانە بون کە بە ئیبراهیمـمان بەخشیوەو بەهۆیانەوە بەسەر گەلەکەی سەرکەوت، ئێمە هەر کەسێکمان بوێ چەندین پلە بەرزی دەکەینەوە، پەروەدگارت لێزان و زانایە، ئیسحاق و یەعقوبمان پێبەخشی، هەردوکمان کردن بە پێغەمبەر، نوحیش پێشتر ڕێنوێنمان کردبو و کردبومانە پێغەمبەر، داود و سلێمان و ئەییوب و یوسف و موساو هارونیش لە نەوەی ئەون، بەم جۆرە پاداشتی چاکەخوازان دەدەینەوە، زەکەریاو یەحیاو عیساو ئیلیاس هەر هەمویان چاکەکار بون، ئیسماعیل و ئەلیەسەع و یونس و لوطمان لە سەر جیهانیان پایەدار کردوە﴾** الأنعام/٨٣-٨٦.

## چواریان عەرەب بون:

**لەم بیست و پێنجەدا چواریان عەرەب بون، لەو فەرمودەیەی یادی پێغەمبەران دەکات و ئەبو نەر دەیگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((منهم أربعة من العرب: هود، وصالح، وشعيب، ونبيك يا أبا ذر: ئەبو ذەر! چواریان عەرەب بون: هود و صالح و شوعەیب و پێغەمبەرەکەت)).**[١٣]

---

١٣ ئیبنو حیببان لە صحیحەکەیدا گێڕایتیەوە، البداية والنهاية (١/١٢٠).

بەو عەرەبانەی لە پێش ئیسماعیل پێغەمبەردا ژیاون دەگوترێ: عاریبە، بەڵام عەرەبە بەعەرەب بوەکان نەوەی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمی خەلیلن [14] هود و ساڵح لە عەرەبە عاریبەکان بون.

## کوڕانی یەعقوب:

هەمو ئەو پێغەمبەرانەی بەر لە ئێستا باسیان کراوە لە قورئاندا بەناوی خۆیانەوە یادیان کراوە، بەڵام هەندێکیتر هەن قورئان ئاماژەی پێغەمبەرایەتی بۆ کردون و ناوی نەهێناون و ناویان نازانین بەڵام بە (ئەسباط) ناساندونی، ئەسباط منداڵەکانی پێغەمبەر یەعقوبی پێمەبەستە، ژمارەیان دوازدە پیاو بوە، قورئان تەنها یەکێکی پێ ناساندوین و ناوی بردوە کە ئەویش یوسفەو ناوی ئەوانی تری نەهێناوە، بەڵام پێی راگەیاندوین کە سروشی بۆ کردون، خوا دەفەرموێ: ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ: بڵێن بڕوامان هێناوە بە خواو بەوەی بۆمان دابەزیوە هەروەها بەو هەناردراوانەش کە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕانی یەعقوب دابەزیوە﴾ البقرة/١٣٦.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطَ كَانُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى : یاخۆ دەڵێن؛ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕانی یەعقوب جولەکە یان گاور بون؟!﴾ البقرة/١٤٠.

---

١٤ البداية والنهاية (١/١١٩-١٢٠).




ئەم سەرجەلەیە لە کتێبی (العقيدة الإسلامية)ی شێخ

عەبدوڕەحمان حەبەننەکە وەرگیراوە.

## ئەو پێغەمبەرانەی فەرموودە پێی ناساندوین:

هەندێ پێغەمبەر هەن قورئان ناوی نەبردون بەڵام لەرێی سوننەتەوە دەیانناسین کەئەمانەن:

### شیت:

ئیبنو کەثیر دەڵێ: بە دەقی ئەو فەرمودەیەی ئیبنو حیببان لە صحیحەکەیدا بە مەرفوعی لە ئەبو ذەڕی گێڕاوەتەوە، پێغەمبەر بوەو پەنجا پەڕاوی بۆ دابەزیوە.[15]

### یوشەعی کوڕی نون:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە و دەڵێ پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((غزا نبي من الأنبياء فقال لقومه لا يتبعني رجل قد ملك بضع امرأة وهو يريد أن يبنى بها ولما يبن ولا آخر قد بنى بنيانا ولم يرفع سقفها ولا آخر قد اشترى غنما أو خلفات وهو ينتظر أولادها فغزا فدنا من القرية حين صلى العصر أو قريباً من ذلك فقال للشمس: أنت مأمورة وأنا مأمور اللهم احبسها عليّ شيئاً: یەك لە پێغەمبەران بۆ غەزایەك دەرچو، بەگەلەکەی فەرمو: ئەو کەسەی ژنی مارەکردوە و دەیەوێ بیگوازێتەوە و هێشتا نەیگوازتۆتەوە با لەگەڵم دەرنەچێ، ئەو کەسەی خانوی دروست کردوەو هێشتا سەری نەگرتوە با لەگەڵمان دەرنەچێ، ئەو کەسەی کە مەڕو بزن و وشترو ئاژەڵی ئاوسی کڕیوەو چاوەڕێیە ئاژەڵەکەی بزێ با لەگەڵمان دەرنەچێ. پاشان بۆ غەزایەکە دەرچو، کە گەیشتە گوندەکە عەسر داهات، بە خۆری فەرمو: تۆش وەك من و منیش وەك

---

[15] البداية والنهاية (٩٩/١).

تۆ فەرمانی خوا بەجیٰ دەگەیەنین، خوایە ئەم هەتاوە بوەستێنەو مەهێلە ئاوابێ تا غەزاکەمان تەواو دەکەین)) [16] ، بەڵگەش بۆ ئەوەی ئەم پێغەمبەرە یوشەع بوە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە ﷺ: ((إن الشمس لم تحبس إلاّ ليوشع ليالي سلو الى بيت المقدس: رۆژ تەنها بۆ یوشەع راگیراوەو و بۆ کەسیتر رانەگیراوە ئەمەش لەو شەوانەی کە بەرەو بەیتولمەقدیس رێی دەبڕی)) [17].

## ئەو پیاو چاکانەی گومان دەکریٰ پێغەمبەر بن

### ذولقەرنەین:

خوای گەورە لە کۆتایی سورەتی (کهف)دا باسی ذولقەرنەینی کردوە، خوای گەورە لە گەڵیدا دواوە: ﴿قُلْنَا يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا: ذولقەرنەین! یا ئەوەتە سزایان دەدەی یان دەیانکوژی وەیان چاکەیان لەگەڵدا دەکەی و فێری ئامۆژو فەرمانەکانیان دەکەی﴾ الكهف/٨٦، جائەم ئاخاوتنەی خوا لە رێی پێغەمبەرێکی ترەوە بوە یاخود خۆی پێغەمبەر بوە؟ دیار نیە. فەخری رازی بە پێغەمبەری داناوە، [18] ئیبنوحەجەر دەڵێ: ئەمەیان لە عەبدوڵلای کوڕی عەمر گێڕاوەتەوەو لە رواڵەتی قورئانیش هەروا دیارە، [19] مەبەستی لەوە دیٰ پێغەمبەر بوە، یەکێکیش لەوانەی بە پێغەمبەری

---

١٦ ئەحمەد و موسلیم گێڕاویانەوە (تەماشای البداية و النهاية (٣٢٣/١) بکە.

١٧ ئیبنوکەثیر لە البداية والنهاية (٣٢٣/١)دا دەڵێ: تەنها ئیمام ئەحمەد لەم رووەوە گێڕاویەتیەوە و لەسەر مەرجی بوخاریە.

١٨ فتح الباري (٣٨٢/٦).

١٩ هەمان ژێدەر.

**توببەع:**

**لە قورئاندا باسی توببەع کراوە، خوا دەفەرموێ:** ﴿أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ: **ئایا ئەم بێبڕوایانە لە گەلی توببەع و گەلانی پێشوی وەکو عادو ثەمود بەهێزترن؟ کە هەمومان بە سەبارەتی تاوانکاریەکانیان لەناو برد**﴾ الدخان/٣٧، ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَابُ الرَّسِّ وَثَمُودُ، وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوطٍ وَأَصْحَابُ الأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ: **هەر بەم جۆرە گەلانی پێشوی نوح و ئەصحابی رەس و ثەمود و عادو فیرعەون و گەلی لوط و خەڵکانی هەرێمی ئەیکە و گەلی توببەع بێبڕواییان کرد بۆیە توشی سزای من بون**﴾ ق/١٢-١٤، **جا ئایا توببەع پێغەمبەرێك بوە و خوا بۆ گەلەکەی نارد وەیان نا؟ خوا دەزانێ.**

## چاکتر وایە لە ئاست توببەع و ذولقەرنەیندا بڕیار نەدەین

**باشتر وایە هەڵوەستە بکەین و بۆ پێغەمبەرایەتیان بڕیار نەدەین چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ما أدري أتبّع نبياً أم لا، وما أدري ذا القرنين نبياً أم**

---

٢٠ ئەم ئەثەرە حاکم لە عەلی گێڕایتیەوەو دەڵێ: سەنەدەکەشی راستە، تەماشای فتح البـاری (٣٨٢/٦) بکە.

لا: نازانم توببەع و ذولقەرنەین پێغەمبەر بون یان نا؟))[21]، جائەگەر پێغەمبەرﷺ نەیزانیٚ، ئێمە چۆن بیزانین؟!

**خدر:**

خدر؛ ئەو بەندە پیاوچاکە بوە کە پێغەمبەر موسا ﷺ سەری بۆ هەڵگرت تاکو زانستی لیٚ فێر بیٚ، خوا لە سورەتی (کهف)دا باسی فەرموە، رەوتی گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکە لە چەند روێکەوە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی بەدەستەوە دەدات:

یەکەم: خوا دەفەرمویٚ: ﴿فَوَجَدَا عَبْدًا مِنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْمًا: موساو یوشەعی هاوڕێی بەندەیەکی چاکەکاری ئێمەیان دۆزیەوە کە میهرمان پیٚ بەخشیبو هەروەها زانیاریمان فێرکردبو﴾ الكهف/٦٥، ئایەتەکە وا نیشان دەدات کە میهرەکە پێغەمبەرایەتی بیٚو زانیاریەکەش سروش بوبیٚ.

دوەم: کە موسا پێی دەڵیٚ: ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا، قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِي صَبْرًا، وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا، قَالَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا، قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا: موسا گوتی؛ لەگەڵت بم تا ئەو زانستەم فێربکەی کە خوا فێری کردوی؟ خدر گوتی: ناتوانی ئارامم لەگەڵدا بگری، جا چۆن دەتوانی ئارام

---

٢١ حاکم و بیهقی گێڕایتیانەوە (تەماشای صحيح الجامع الصغير (٥/١٢١) بکە.

لەسەر شتێك بگری كە زانستت دەربارەی نەبێ، موسا گوتی بە پشتیوانی خوا ئارام دەگرم و سەرپێچیت لێ ناكەم، خدر گوتی: باشە ئەگەر لەگەڵم هاتی پرسیاری هیچ شتێكم لێ نەكەی تا خۆم پێت دەڵێم ﴾ الكهف/٦٦-٧٠، جا ئەگەر پێغەمبەر نەبوبێ پارێزراو نەدەبو، پاشان موسایەكی پێغەمبەر و بەرێزو پارێزراو ئەو هەمو شەوق و پەرۆشیەی بۆ زانیاری پیاوچاكێكی نا پارێزراو نابێ، هەروەها هێندە رشت نەدەبو ببینێ‌و سوراغی بكات، رۆژگارێكی دور و درێژ بەدوایدا گەڕاوە، هەیە دەڵێ ماوەی هەشتا ساڵ بوە، پاشان كە دیتوێتی بەشەرم و رێزەوە رەفتاری كردوەو زۆر بە گەورەی داناوە، لەگەڵیدا وەكو فێرخوازێك بوە، ئەمانە هەمو بەڵگەن بۆ پێغەمبەرایەتی‌و دیارە وەكو پێغەمبەر موسا سروشی بۆ هاتوە، هەروەها خوا زانستی پەنامەكی و نهێنی پێغەمبەرانەی وای پێداوە بە پێغەمبەر موسای بەنی ئیسرائیلی نەبەخشیوە.

سێیەم: خدر كە منداڵەكەی كوشتوە، دەبێ بە سروش ئەنجامی دابێ، ئەمەشیان خۆی لەخۆدا بەڵگەیەكی سەربەخۆی پێغەمبەرایەتی‌و سەلمێنێكی ئاشكرای پارێزراوبونیەتی[٢٢]، چونكە دۆستی خوا لەخۆڕا ناتوانێ بە خەیاڵاتی خۆی هیچ كەسێك بكوژێ، چونكە خەیاڵات پارێزراوێتی بۆ نیەو بۆی هەیە هەڵە بكات، كە منداڵەكەشی كوشتوە لەبەر ئەوە بوە زانیویەتی ئەم منداڵە گەر

---

٢٢ لەم نەتەوەیەدا چەندین كەس خۆیان بە گومڕا بردەوەو كاری حەرام و ناپەسند ئەنجام دەدەن و گەر یەكێكیش پێیان بڵێ حەرامە وامەكەن، دەڵێن: كاكە! راستەقینەی ئەم كارە زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەوەی دەیبینن، سنگێكیش دەكوتێ و دەڵێ: ئەدی خدر كەشتیەكەی نەشكاندو منداڵەكەی نەكوشت؟ كاری منیش ئاوەهایە، هەڵبەت ئەمە گومڕاییەكی ناقوڵایە و دەرگای زۆر جۆرە خراپكاری واڵا دەكات، بەڵام بە پێغەمبەر دانانی خدر ئەم دەرگایە گاڵە دەدات، پاشان هیچ كەسێك لەم نەتەوەیەدا بۆی نیە پێچەوانەی بەرنامەی ئیسلام رەفتار بكات، حەڵاڵ دیارەو حەرامیش دیارە، ئەو كەسەش پێچەوانە بجوڵێتەوە سزا دەدرێ، جا خۆی بە هەرچی دابنێ.

**گەورە بێ بێبڕوا دەردەچێ و پاشان دایك و باوکیشی لەبەر خۆشەویستی منداڵەکەیان ئەوانیش لەگەڵیدا بێبڕوایی هەڵدەبژێرن، ئەم زانینە ئایندەییە بەڵگەیە بۆ پێغەمبەرایەتیەکەی، هەروەها خوا بە پارێزراویشی داناوە.**

**چوارەم: پاش ئەوەی خدر پاساوی کارەکانی بۆ موسا شیکردەوە و راستەقینەی ئیشەکانی تێگەیاند، بە موسای گوت: ﴿رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي: میهرەبانی پەروەردگارتە، ئەو کارانەشم لە خۆڕا نەکردوە، بەڵکو فەرمانم پێ کراوەو سروشم بۆ هاتوە﴾** الکهف/٨٢.[٢٣]

---

٢٣ بۆ چونی هەندێ لە زانایان وابوە خدر نەمردوەو زندوە، زۆر فەرمودەشیان لەم بارەوە هێناوەتەوە، هەڵبەت ئەم قسەیە دەرگای گەورەی بۆ ئەفسانەو درۆو دەلەسە کردۆتەوە، زۆر خەڵك هەن پێیان وایە خدریان بینیوەو چەندین قسەی پێ گوتون، ئەنجا هەقایەتی سەیرو سەمەری وا لەو بارەوە رێکدەخەن کە ناوەزی هەمو موسڵمانێکی پاك رەتی دەکاتەوە.

ئەو فەرمودانەش کە لەبارەی زندوێتی خدر هاتون کۆمەڵێك فەرمودەناسی فرەزان و بلیمەت بەزەعیفیان داناوە، لەوانە وەکو: بوخاری، ئیبنودەحیە، ئیبنوکەثیر، ئیبنوحەجەری عەسقەلانی، بەهێزترین بەڵگە بۆ رەتکردنەوەی ئەو قسەیەی کە دەڵێ زندوە ئەوەیە کە هیچ فەرمودەیەکی صحیحی لەبارەوە نەهاتوە، ئەنجا ئەگەر زندوبێ، دەبوایە بچێتە لای پێغەمبەر ﷺ و پەیڕەو لە فەرمانەکانی بکات و شوێنی بکەوێت، چونکە خوا پەیمان و بەڵێنی لە سەرجەم پێغەمبەران وەرگرتوە گەر موحەممەد بێت ئەوا شوێنی بکەون: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ آل عمران/٨١.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ئەگەر موسا زندوبا چاری نەبو دەبوایە شوێن رێبازەکەی من بکەوێت، ئیبراهیمی حەربی لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی پرسی: خەڵك دەڵێن خدرو ئیلیاس ماون و نەمردون و دەبینرێن و زۆر هەقایەتیشیان بۆ هەڵبەستون، ئایا راستە؟ گوتی: نەخێر، ئەو کەسەی لەبارەی کەسێکی نادیارەوە قسان بکات کەم و زیادی تێدا دەڵێ، ئەو هەڵبەستۆکانەش هەموی لەمەڕ شەیتانەوەن. (مجموع فتاوی شیخ الإسلام ٣٣٧/٤)، لە بوخاریان پرسی: ئایا خدرو ئیلیاس ماون؟ گوتی: چۆن دەمێنن کە

## بڕوا نەهێنان بە پێغەمبەرێك بێبڕوا بونە بە سەرجەم پێغەمبەران:

خوا دەفەرموێ: ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ، گەلی نوح بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێنا﴾ الشعراء/١٠٥، ﴿كذبت عاد المرسلين، عاد بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێنا﴾ الشعراء/١٢٣، ﴿كَذَّبَتْ ثَمُودُ الْمُرْسَلِينَ﴾ الشعراء/١٤١، ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ﴾ الشعراء/١٦٠.

ئاشكرایە هەر یەك لەم نەتەوانە بڕوایان بە پێغەمبەرەكانیان نەهێناوە، كە ئەوەش بڕوا نەهێنانە بە سەرجەم پێغەمبەران، چونكە پەیامبەران هەڵگری یەك تاقە پەیامن، بانگبەری یەك بانگەوازن، یەك خوا ناردونی، هەر هەمویان یەك نەژادن، پێشینیان موژدەیان بە پاشینەكانیان داوە، بەڵێ، لەبەر ئەوەیە گەر یەكێك بڕوا بە هەندێ پێغەمبەر بێنێو بڕواش بە هەندێكیان نەهێنێ، هەر بێبڕوایەو بڕوای نیە و خوا مۆری بێبڕوایی لەم حاڵەتە داوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً، أُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ حَقًّا﴾ النساء/١٥٠-١٥١، خوا فەرمانی پێ كردوین جیاوازی نەخەینە نێوان پێغەمبەران: ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا

---

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((لا يبقى على رأس مائة سنة ممن هو على وجه الأرض أحد: تا سەری ئەم سەد ساڵە هیچ یەكێك لە سەر روی زەوی نامێنێ)) (مجموع فتاوى شيخ الإسلام ٤/٣٣٧).
هەندێ زانای لێكۆڵەرەوە درێژیان بە هێنانەوەی بەڵگە پۆكەڵەكان داوە كە لە بارەی ئەم ئەفسانەوە هەڵبەستراون وەكو: ئیبنو كەثیر لە البداية والنهاية (١/٣٢٦)، شیخ موحەممەد ئەمینی شنقیطی لە أضواء البيان (٤/١٨٤)، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی لە نامیلكەیەكدا بەناوی (الزهر النضر في نبأ الخضر) كە لەگەڵ كۆمەڵێك نامەی المنيرية (٢/١٩٥) چاپكراوە.

أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ﴾ البقرة/١٣٦، **هەر کەسێك بە پێی ئەم ڕێوشوێنە بڕوات ڕێی ڕێنوێنی گرتۆتە بەر:** ﴿فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنتُمْ بِهِ فَقَدْ اهْتَدَوا﴾ البقرة/١٣٧، **ئەو کەسەش سەر کێشی بکات گومڕاو سەرەنگرێیە:** ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ البقـــرة/١٣٧، **خوا ستایشی پێغەمبەرو ئەم نەتەوەی کردوە کە جیاوازیان نەخستۆتە نێوان پێغەمبەران و دەفەرموێ:** ﴿آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ: **پێغەمبەر و بڕواداران بڕوایان بەو هەناردراوانە هێناوە کە خوا بۆ پێغەمبەری دابەزاندوە، هەر هەموویان بڕوایان بەخواو فریشتان و پەڕتوك و پێغەمبەران هێناوەو جیاوازی ناخەنە نێوان پێغەمبەرانەوە﴾** البقـــرة/٢٨٥. **خوا بەڵێنی پاداشتی بەوانە داوە کە جیاوازی ناخەنە نێوان پێغەمبەرانەوەو وەکو یەك بڕوایان پێیان هەیە:** ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ أُوْلَئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا: **ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەران هێناوەو جیاوازیان نەخستۆتە نێوان هیچکامێکیان و بڕوایان بە هەر هەموویان هێناوە، ئەو بڕوادارانە لای خوا پاداشتی خۆیان وەردەگرن، خوا لێبوردەو میهرەبانە﴾** النســـاء/١٥٢. **سەرکۆنەی نامەوەرانیشی کردوە، چونکە بڕوایان بە هەندێ لەپێغەمبەران هێناوەو بە هەندێکیش نا:** ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ آمِنُوا بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا نُؤْمِنُ بِمَا أُنزِلَ عَلَيْنَا وَيَكْفُرُونَ بِمَا وَرَاءَهُ وَهُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَهُمْ: **ئەگەر پێیان بڵێن بڕوا بەو هەناردراوانە بێنن کە خوا دایبەزاندوە، دەڵێن ئێمە تەنها بڕوا بە هەناردراوەکانی خۆمان دێنین،**

بەو هەناردراوانەش کە لە دوای وان دابەزیوە بێبڕوان کە بەهەق دابەزیوەو راستخەرەوەی دینەکەیانە﴾ البقرة/٩٢، جولەکەکان نە بە عیساو نە بە موحەممەد بڕوایان نیەو گاورەکانیش بڕوایان بە موحەممەد نیە.

## بە بێ بەڵگە کەس بە پێغەمبەر دانانێین:

تەفسیرزان و ژیاننامەنوسان ناوی زۆر پێغەمبەریان لە دەمی جولەکانەوە وەرگرتوە، کە راستیەکەی نەسەلمێنراوە، ئەو وتانە ئەگەر لەگەڵ کەمترین سەلمێنراوی قورئان و سوننەت هاودژو ناساز بێت رەتی دەکەینەوە، بۆ نمونە کە دەڵێن؛ (ئەو سێ پێغەمبەرەی کە خوا بۆ خەڵکی گوندەکەی سورەتی یاسینی نارد شوێنکەوتەی پێغەمبەر عیسا بون، جەرجیس و خالیدی کوڕی سینان دو پێغەمبەری پاش عیسا بون).[24]

سەرلەبەری ئەم بەناو فەرمودەیە رەت دەکەینەوە، چونکە لە فەرمودەیەکی صەحیحدا سەلمێنراوە کە لەنێوان عیسای کوڕی مەریەم و پێغەمبەرماندا ﷺ هیچ پێغەمبەرێکیتر نەبوە[25]، کەواتە ئەو پێغەمبەرانەی کە بۆ خەڵکی گوندەکە نێردراون یان بەر لە پێغەمبەر عیسا بوە، کە تاسەنگ (الراجح) وایە، وەیان وەکو هەندێ لە تەفسیرزانان دەڵێن: عیسا خۆی ناردونی، کە ئەستەمە وابوبێ چونکە خوا فەرمویەتی ئەوانە پێغەمبەر بون، کە بەرەهاییش دەوترێت (الرسول: نێردراو) مەبەست لە پێغەمبەر دێت، ئەو بەناو فەرمودەیەش کەدەڵێ: خالیدی کوڕی سینان پێغەمبەرێکی عەرەبی بوەو گەلەکەی لەدەست خۆیان دا، فەرمودەیەکی صەحیح نیە، بەڵکو لەگەڵ ئەو فەرمودە صەحیحەش پێچەوانەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ژمارەی پێغەمبەرە عەرەبەکان چوارن.[26] ئەو سەر بردانەی جولەکە دەیگێڕنەوەو ناوی پێغەمبەرانی تێدا دێنن و هیچ بەڵگەیەکی لە قورئان و سوننەتدا بۆ نیە، نە بەراستی دادەنێین و نە بە درۆیان دەزانین، چونکە هەردوکیان هەڵدەگرێ.

---

٢٤ فتح الباري (٦/٤٨٩).
٢٥ فەرمودەیەکی صەحیحە، بوخاریو هیتر گێڕاویانەوە تەماشای فتح الباری (٤/٤٧٧) بکە.
٢٦ ئیبنو حیبان لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتیەوە.

## بەندی دووەم

# ئاتاجی خەڵکان بۆ پێغەمبەران

**ڕێخۆشەکێ:**

خەڵك پێشانیش مشتومڕیان لەگەڵ پێغەمبەراندا کردوە، بەڵام ئیستاکە خراپترن، ئەمڕۆ لە سەدەی بیستەمدا مرۆڤ گەییوەتە ترۆپکی پێشکەوتنی ماددی، لەبنی بنەوەی قوڵایی دەریاکاندا مەلە دەکات و بۆ ئاسمانێکی دور پەرواز دەکات، گەردیلەی تەقاندۆتەوەو چەندین وزەی شاراوەی لە گەردونەدا دۆزیوەتەوە، بۆ هار نابێ؟ بەڵێ، مشتومڕی ئەمڕۆی مرۆڤ لە جاران زێترو سەرکێشترە، زانیاری پێغەمبەران وەرناگرن و پتر بەرەنگاریان دەبنەوە، مرۆڤایەتی بێبڕوای ئەمڕۆ لە ئاست پێغەمبەران و فەرمانەکانیان وەك کەری کێوین هەر کە شێریان بینی ڕادەکەن، خوا فەرموویەتی: ﴿فَمَا لَهُمْ عَنِ التَّذْكِرَةِ مُعْرِضِينَ، كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُسْتَنْفِرَةٌ، فَرَّتْ مِنْ قَسْوَرَةٍ: ئەوە چیانە بۆ رویان لە قورئانی یادەوەر وەرگێڕاوە، وەك کەری چەموش و ڕاکردو وان، کە شێر دەبینیێو هەڵدێ﴾ المدثر/٤٩-٥١، مرۆڤایەتی ئەمڕۆ لە جاران سەهەندەترە، ئەستەمتر ئەژنەوای پێغەمبەران و فەرمانەکانیان دەبن، بە زانست دەنازن، پێیان شەرمە وەدوای یەکێك بکەون لە سەردەمێکی پێشوتردا ژیابێ!: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ

رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوْا وَاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ: بۆیه سزای ژین و ژیانەوەیان بەم جۆرەیە کە لە ئایەتەکانی پێشتر باس کراوە، چونکە پێغەمبەرەکانیان چەندین نیشانەو موعجیزەیان بۆ دەهێنان، کەچی بڕوایان نەدەهێناو دەیانگوت؛ مرۆڤ ئێمە ڕێنوێنی دەکات؟! بێبڕواییان کرد و پشتیان هەڵکرد خواش لێیان بێنیاز بو، خوا بێنیازو سوپاسگوزارە﴾ التغابن/٦.

ئەمڕۆ شەیتانە ئادەمیەکان مێشکی مرۆڤ دەشۆنەوە و گاڵیان دەدەن تا لە خواو شەریعەت و پێغەمبەران هەڵگەڕێنەوەو ئەژنەوا نەبن، بەو بیانوەی گوایە هزریان دادەتەپێ و کاروانی پێشکەوتنی ژیان دەرەتێ و ژیار و شارستانی خامۆش دەبێ تەنانەت ئەوڕۆکە وڵاتی وا هەیە شێرازەو یاساو پێڕەوی بەڕێوەچونی بە ڕێوشوێنێکی دور لە فەرمانی پێغەمبەران دارشتوە، تەنانەت هەندێ وڵات دەستورەکەی لە سەر بنچینەی خوانەناسی دارشتوە، ئەو نەگبەتیەیە کە پێی دەڵێن (عەلمانی)، زۆربەی ئەو وڵاتانەش کە موسڵماننشینن لەسەر ئەم ڕێوشوێنە فەرمانڕەوایی دەکەن، خەڵکی ڕەمەکیش بەوە خۆشنود دەکەن کە لە دەستور نوسیویانە: (ئیسلام دینی دەوڵەتە)، پاشان بڕگەکانی تری پێش و پاش هاودژانە ڕەنگڕێژ دەکرێ و پێڕەوێکی نا ئیسلامیانە پەسند دەکرێ.

ئاخۆ ڕاستە مرۆڤایەتی لەم سەردەمەدا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی ئاتاجی بە پێغەمبەران نەمابێ و بتوانێ دەستەبەرداریان بێ؟ ئاخۆ ئەمڕۆ مرۆڤایەتی دەتوانێت بێ ئامۆژو ڕێڕەوی پێغەمبەران و هەر بە خۆیان ڕەوتی ژیان بەڕێوە ببەن؟

هێندە وەڵامە بەسە کە تەماشای ژین و ژیواری ئەو وڵاتە بەناو پێشکەوتو و ژیارمەندانەی وەکو ئەمریکاو بەریتانیا و فەرەنساو روسیاو چین بکەین و

بزانین لە چتۆ شڕو پەشێویدا دەژین، لاری لەوە ناکەین پێشکەوتنێکی فرەوانیان لە روی ماددیەوە وەدەست هێناوە، بەڵام لەو روەی کە پێغەمبەرانی لە پێناودا هاتوەو ئامۆژیان پێشکەش کردوە، تەواو تەواو داتەپیون و سەر لە نشێون، کەس ناتوانێ لاری لەو هەمو خەم و پەژارەو ژان و ژوارو گرێکۆڵە دەرونیانە بکات کە بۆتە مۆری جیهانی ژیارمەندی ئەمرۆ.

مرۆڤ لە ژیاری ئەمرۆی جیهاندا مرۆڤایەتی خۆی بزر کردوەو خۆی وێڵ کردوە، بۆیە گەنجەکان یاخی دەبن و رەوشت و نەریت و یاسا پێخوست دەکەن و خەریکە ژیانی ئێستایان رەت دەکەنەوەو چاو ئەبڵەقی هەر بانگەوازێکن: فەلسەفی بێ، دەروێشی بێ، یا هەر جۆرێکی تر بێ، لە رۆژ ئاوا بێ یا رۆژهەڵات، وەدوای دەکەون و دەبنە رەهەندەی‌و وا تێ دەگەن ئاسودەیی و بەهرەمەندییان لەوێدایە.

جیهانی رۆژئاوا بۆتە جیهانێك تاوان و تاوانکاری تا مۆخی ئێسکی بڕیوە، بەرەو دۆڵی وێڵی‌و سەرگەردانی هەڵدێراوە، رێژەی بەدکاری و تاوانی جۆراوجۆر پایەی دەوڵەتە زلەکانی لەق کردوە، شاراوەکان لە ئاشکراکان فرەترن، ئەوانەی کە ئەمڕۆ بە جیهانی ژیارمەند هەژمار دەکرێن، بە دەستی خۆیان ماڵی خۆیان وێران دەکەن، ئەو ژیارە دەیانکوژێ، ئەم ژیارە ژەهری وا دەچژێنتە جەستەیان تاکەکانیان دەکوژێ‌و کۆمەڵگەیان پەرتەوازە دەکات، ئەوەی ئەوڕۆ ئێمە پێی دەڵێین جیهانی ژیارمەند حاڵی وەك ئەو سیمورخە وایە کە دەیەوێ بە یەك باڵ بۆشاییەکانی ئاسمان تەی بکات.

ئێمە ئاتاجی پێغەمبەران و ئامۆژەکانیانین تا دڵمان خاوێن و ناخمان روناك و هزرمان رێنوێن ببێ، ئێمە ئاتاجی پێغەمبەرانین تا رێڕەوتی ژیانمان

وەدۆزین، تا بزانین پەیوەندیمان لەگەڵ ژیان و ئافەریدگار دەبێ چۆن بێ، ئێمە ئاتاجی پێغەمبەرانین تا رەت نەبەین و بۆ نێو زۆنگاوان هەڵنەدێرێین.

## وتەیەکی نەستەقی ئیبنولقەییم:

ئیبنولقەییم لە بارەی ئاتاجی خەڵکان بۆ پێغەمبەران دەڵێ:

- بەندە ئاتاجیەکی سەروی هەمو ئاتاجیەکی بە پێغەمبەران و بڕوا پێکردن و ئەژنەوا بونیان هەیە، چونکە ئاسودەیی‌و بەختەوەری ژین و ژیانەوە تەنها لەلای پێغەمبەرانە، پاك و پیسی بەتەواوی قەت لەیەك هاوێر ناکرێن تەنها لای ئەوان نەبێ، خۆشنودی خوا لە سەر دەستی ئەوانەوە نەبێ وەدەست نایێ. کرداروگوفتار و رەفتاری چاك و پاك لە رێنوێنی ئەوانەوە دەناسرێ‌و سەرچاوە دەگرێ، بە شوێنکەوتنی ئەوانەوە بەدکارەکان وەدەر دەکەون.

جەستە چەند پێویستی بە گیان هەیەو ئاتاجی چاو چەندە بۆ روناکی و گیان چەندە بۆ ژیان، بەندەش پتر بۆ پێغەمبەران، هەر ئاتاجێك پێویست کرابێ ئاتاج بە پێغەمبەران زۆرتر بوە، پێت چۆنە ئەگەر چاوتروکانێك لە رێنوێنی ئەوان دابڕێی؟ دڵت وێران دەبێ‌و وەکو نەهەنگی بێ‌ئاوی لێ‌دێت، بەڵکو خراپتریش، بەڵام چ دەکەی تەنها دڵی زندو هەست بەم حاڵەتە دەکات، خۆ جەستەی مردو ئازاری برین ناکێشێ. مادەم ئاسودەیی ژین و ژیانەوە پەیوەستی رێنوێنیەکانی پێغەمبەرﷺ بێ، کەواتە هەرکەسێك بۆخۆی دڵسۆزەو خۆی خۆشدەوێت و بەختەوەری گەرەکە؛ با رێوشوێن و ژین و ژیواری ئەم پێغەمبەرە شارەزا بێت تا لە ریزی نەفامان ئاوارتە بێ‌و بێتە رێزی کۆمەڵ و یارو شوێنکەوتوانی، خەڵکان لە ئاست رێنوێنی پێغەمبەراندا یان

کەمتەرخەمن، یان زۆر تەرخەمن، یا هەر بێ خەمن، چاکە چاکەی خوایە، کێی بوێ دەیداتێ.[27]

## ئیبنو تەیمیە ئاتاجبون بە پەیام و پەیامبەران رۆشن دەکاتەوە:

یەکێك لەو بلیمەتانەی زۆر بە جوانی ئەم بابەتەی رون کردۆتەوە ئیبنو تەیمیەی فرەزانە(بەرمیهری خوا بێ) دەڵێ: پەیامی پێغەمبەران ئاتاجێکە، مرۆڤ قەت ناتوانێ لێی بێنیاز بێت، ئاتاجێکە لەسەروی سەرجەم ئاتاجەکانیترە. پەیام؛ گیان و روناکی و ژیانی جیهانە، جا ئەگەر جیهان گیان و روناکی و ژیانی تێدانەبێ، چۆن ئاوەدان دەبێ؟ دنیا شەوەزەنگ و تاریکستان و نەفرەتە، مەگەر ئەو شتانەی لەبەر تیشکی خۆری پەیام دان، مرۆڤیش ئەگەر خۆری پەیامی لە دڵ گزنگ نەدات و ژیان و گیانی لێ چێژ نەکات، لە تاریك و تونەکی و لە ریزی مردواندا دەبێ، خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا: ئەوەی مردو بو زندومان کردەوەو روناکیمان بۆ فەراهەم هێناوە تا لە نێو خەڵکدا پێی بڕوات، وەکو ئەو کەسەیە لەنێو تاریکستانی دابێت و رزگاری نەبێ؟!﴾ الأنعـــــام/١٢٢. بڕوادار ئاوەهایە، مردوی نێو تاریکستانێ بوە، بەڵام خوا بەسای گیانی پەیام و روناکی بڕوا زندوی کردۆتەوە، روناکی پێبەخشیوەو لەنێو خەڵکدا پێی دەڕوات، بەڵام هەرچی بێبڕوایە دڵ مردوی نێو تاریکستانە.

لەم بارەوە میهرەبانی خوای رون کردۆتەوەو دەڵێ: خوا پەیامەکەی بە گیان ناوبردوە، هەڵبەت گیانیش نەبێ ژیان نابێ، خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا

---

[27] زاد المعاد (١/١٥).

إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا: بەم جۆرە لە فەرمانی خۆمان روحێکمان بۆ سروش کردی، نەتدەزانی قورئان و بروا چیە، بەڵام ئێمە ئەو روحەمان کردە روناکی و کێمان مەبەست بێ رێنوێنی پێ دەکەین ﴾ الشـــورى/٥٢، لەم ئایەتەدا دو بنەڕەتی یاد کردوە: گیان و روناکی، گیان ژیانەو روناکیش روناکیە، خوا پەیامەکەی خۆی کە ژیان و روناکی دڵانە بە بارانێك چواندوە کە مایەی بوژاندنەوەی زەمینە، هەروەها بەو ئاگرەشی چواندوە کە روناکی پەخش دەکات دەفەرموێ: ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ: خوا لە ئاسمانێدا بارانی داباراند، پاشان دۆڵ و شێوەکان بە ئەندازەی قەبارەی خۆیان پڕبون لە ئاو، لافاوی ئەم ئاوە کەفاوەکەی خستۆتە سەرەوە، هەروەها ئەو کانزایانەی کە دەیخەنە ناو دەفر و دەیتاوێننەوە تا زێڕ و زەبەر و شتی جوان و قاپ و قاچاغی لێ دروست بکەن، ئەو کانزایانەش کەفاویان هەیە کە بریتیە لە خڵتەوخۆڵ، خوا رەواو ناڕەوا بەم شێوەیە وەسف دەکات، ئەنجا کەفاوی ئاو و قرێژی کانزاکان بەبێ هودە دەڕواو فڕێ دەدرێ، کەچی ئەوەی سودی خەڵکی هەیە لە ژێرەوە دەنیشێ و دەمێنێتەوە، خوا ئەم وێنە دانسقانە دەهێنێتەوە بۆ وێچواندن ﴾ الرعد/١٧.

شێخی ئیسلام(بەرمیهری خوا بێ) لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێ: خوا زانستی بە ئاوی باران چواندوە چونکە مایەی ژیانی دڵە، هەروەکو چۆن ئاو مایەی ژیانی جەستەیە، دڵیشی بە دۆڵ چواندوە چونکە جێگەی زانستە، هەروەك کە دۆڵ

شوێنی ئاوە، دڵ جێگەی زانستێکی فرەی هەیە، دۆڵیش ئاوێکی زۆری لێ کۆدەبێتەوە، خوا ئەوەش رادەگەیەنێ کە دۆڵەکە لەگەڵ لافاوی ئاودا خڵتەو شتی پوچەڵ سەرئاو دەکات و پاشان بۆ لێواران رایدەدا و لە خۆی ئاوارتە دەکات، بەڵام ئەو شتانەی سودی خەڵکی هەیە لە زەویەکەدا دەمێننەوە و سەقام دەگرن، دڵیش ئاوهایە گومان و ئارەزوی لەگەڵ ئامێتە دەبێ‌و پاشان پارزۆنگ دەکرێ کەسودی خۆی‌و خەڵکی هەیە، هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ﴾ الرعد/١٧، ئەم پێچواندنە کە بەئاگرە لەبەر روناکیەکەیەتی، هی یەکەمیش لەبەر مایەی ژیان بو.

شێخی ئیسلام(بەرمیهری خوا بێ) دەڵێ: ئەم دو وێچواندنە لە ئایەتی تریشدا هاتوە: ﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَارًا فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لَا يُبْصِرُونَ، صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ، أَوْ كَصَيِّبٍ مِنَ السَّمَاءِ فِيهِ ظُلُمَاتٌ وَرَعْدٌ وَبَرْقٌ يَجْعَلُونَ أَصَابِعَهُمْ فِي آذَانِهِمْ مِنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ وَاللَّهُ مُحِيطٌ بِالْكَافِرِينَ: وێنەیان وەك یەكێك وایە لە شەوێكی تاریكدا ئاگرێك هەڵكا، كە لەگەڵ دەوروبەری روناك كردەوە خێرا خوا روناكیەكەیان لێ بكوژێنێتەوەو لەناو چەند تاریكیەكی وادا بیانهێڵێتەوە كە هیچ نەبینن، كەرو لاڵ و كوێرن بۆیە لە گومرایی ناگەرێنەوە، یان وەك كەسانێكن كە لە چۆڵیدا لێزمە بارانێكی بە خوڕیان لێ داكات لەگەڵ تاریكی زۆرو تریشقەو بروسكەدا، لەبەر گرمەی هەورەتریشقان بۆ خۆپاراستن لە مردن پەنجەكانیان بئاخننە گوێیەكانیان، خوا دەوری بێبڕوایانی داوە﴾ البقرة/١٧-١٩.

شێخی فرەزان(بەرمیهری خوا بێ) دوای ئەوەی وەسفی بڕواداری کرد ئەنجا دەڵێ: بەڵام هەرچی بێبڕوایە مردوی نێو تاریکستانی بێبڕوایی‌و

هاوبەشپەرستیە، راستە ژیانێکی ئاژەڵانەی هەیە بەڵام ژیانی گیانی بڵندانی نیە کە ئەنگێزەی بڕوایە، چونکە هەر بەهۆی بڕواوە مرۆڤ دەتوانێ لە ژین و ژیانەوەدا ئاسودەمەندو سەر فراز بێ، خوای میهرەبان پێغەمبەرانی کردۆتە بواری نێوان خۆیو خەڵکان و زیان و قازانج و رێـی بەرژەوەندی دنیاو ئەو دنیایان بۆ رون دەکاتەوە، هەمو پێغەمبەران بۆ بانگەوازی خواپەرستی رەوان کراون و رێگای خواناسی و سەرەنجامیان بۆ خەڵك رون کردۆتەوە.

ئیبنو تەیمیە(بەرمیهری خوا بێ) دوای ئەم وتانە، ئەو بنەڕەتانە رون دەکاتەوە کە لێرەدا ئاماژەی بۆ کردوە: بنەڕەتی یەکەم سەلماندنی سیفەتەکان و یەکتاناسی و قەزاوقەدەر دەگرێتەوە، هەروەها یادی رۆژانی خوای کردۆتەوە کە نێوانی دۆست و دوژمنانی یەکلا کردۆتەوە، کە بریتیە لەو سەرگوزەشتەو پەندو ئامۆژانەی بۆ بەندەکانی گێڕاوەتەوە.

بنەڕەتی دوەم چەندو چۆنی بەرنامەو فەرمان و بەرهەڵستی و کارە شیاوەکان و ئەو شتانەی دەبنە مایەی شادیو توڕەیی خوا دەگرێتەوە.

بنەڕەتی سێیەم بڕوا بون بە رۆژی دواییو بەهەشت و دۆزەخ و سزاو پاداشت دەگرێتەوە.

پاشان دەڵێ: شادیو بەختەوەری خەڵکان بەم سێ بنەڕەتەوە بەندە، کە لەرێی پێغەمبەرانەوە نەبێ ناکرێ بناسرێن، ئاوەز هەر چەندە بە شێوەیەکی گشتی پەی بە پێویستی ئەم بنەڕەتانە دەبات، بەڵام ناتوانێ رێ بە هەمو وردەکارییو چەندو چۆنی و راستەقینەکانی ببات، وەکو ئەو نەخۆشەی کە دەزانێ پێویستی بە دەرمان هەیە، بەڵام رێ بە وردەکاری نەخۆشیەکەی و جۆری دەرمانەکان نابات[28].

---

٢٨ سەرجەم دەقەکان لە مجموع فتاوی شیخ الإسلام (٩/٩٣-٩٦) وەرگیراوە.

## بەراوردێك لە نێوان ئاتاجی جەستە بۆ نوژداری لەگەڵ ئاتاجی گیان و جەستە بۆ پێغەمبەران

ئیبنولقەییم(بەرمیهری خوا بێ) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (کلیلی هەواری بەختەوەری)[29] بەراوردێکی لەوەدا کردوە کە خەڵك چەند پێویستیان بە نوژداری هەیە بۆ ئەوەی لەش ساغی خۆیان بپارێزن، بگرە ئاتاجبونیان بۆ پێغەمبەران گەلێ زیاترە، دەڵێ: خەڵك ناتوانێ لە ئاتاجی بەرنامەی پێغەمبەران دابڕێ، چونکە لە هەمو شتێك زیاتر بۆی ئاتاجن، تەنانەت نوژدارێتیش نایگاتێ، چونکە زۆربەی خەڵکانی دنیا بەبێ پزیشکیش دەژین، تەنها چەند شارو دێهاتێك نەبێ کە نوژداریان تێدایە، کەچی هەرێمەکانی تر نیانە. خەڵکانی رەشماڵنشین و گوندنشین و زۆربەی خەڵك بەگشتی پێویستیان بە دکتۆر نیەو لەش و لار و تەندروستیان زۆر بەهێزو ساغ و لەبارتریشە وەك لەوانەی ئالودەی نوژدارانن و رەنگە تەمەنیشیان هەر هەندەی یەك بێ، خوا لە رێختەوە مرۆڤی وا ئەفراندوە شتی سودبەخش بخوات و زیانبەخشیش بەلاوە نێت، هەمو گەل و هۆزێکیش بای پێویست فێری زانستی نوژداری‌و باوی نوژداری بوە، دەتوانن دەرمان ساز بکەن... تەنانەت زۆر لە بنەڕەتە نوژداریەکان لەباو و نەریت و ئەزمونی خەڵکان هەڵێنجراوە. بەلام بەرنامەو پەیامی پێغەمبەران لە بواری کردە ئازادەکانی مرۆڤ رۆڵ دەگێڕن، ئاخۆ کامیان خۆشنودی خوای تێ وەدی دێ، کامیان هاودژیەتی؟ سروشی خوا بە خەڵك رادەگەیەنێ، تەنانەت لە هەناسەو خواردن و خوادرنەوەش گرنگترە، چونکە نەبونی ئەوانە دەبێتە مایەی مردنی جەستەو کۆتایی دێت، بەلام نەبونی بەرنامەو پەیام مایەی گەندەڵبونی گیان و دڵ و مایەی وێران بونی ژینی بێ بنە.

---

٢٩ مفتاح دار السعادة.

خەڵك هێندە ئاتاجی پەیڕەولێکردن و تێکۆشان و ئارام لەسەر گرتن و بڵاوکردنەوەی پەیامی پێغەمبەرن ﷺ، هێندە ئاتاجی هیچ شتێك نین و خەڵکانیش تا ئەژنەوای پەیام نەبن چاك ناسازێن، هەر پەیامیش تاقە بواری پەڕینەوەشە بۆ ئەوبەری سەرفرازی و ئاسودەیی.[30]

## ئایە دەکرێ ئاوەز دەستەبەرداری سروش بێت؟

لە دنیای ئەمڕۆدا خەڵکانێك هەن پێیان وایە ئاوەزیان بەسە و دەتوانن دەستەبەرداری پەیام و پەیامبەران بن، لەبەر ئەوە یاسا دادەڕێژن و حەرام و حەلاڵ دیاردەکەن و بە ئارەزوی ئاوەزی خۆیان کە پێی باشە یان خراپ، پێی شادە یان نا بەرنامەو پێڕەو دادەڕێژن، هەڵبەت ئەم جۆرە خەڵکانە تازەو نوێ نین، بەڵکو پێشینانیان هەیەو هەمان کردەو وتەی نابەجێی ئەوانیان ئەنجام داوە (بەرەهمیەکان-کە چینێکن لە ئاگر پەرستان-پێیان وایە بونی پەیامبەران کارێکی بێ هودەیەو شایەنی پیاوی لێزان نیە، چونکە ئاوەز لە پەیامبەران بێنیازە، دەڵێن ئاوەزمان ئەگەر شتێکی بە چاك و پەسەند زانی پەیڕەوی لێ دەکەین، ئەوجا پەیامبەر بانگەشەی بۆ بکات یان نا، وە ئەگەر ئاوەز ناکۆك بو ئەوا ئەگەر ئاتاجی بو دەیکات ئەگینا وازی لێ دێنێ.[31] موسڵمان دەبێ ئاگاداری بۆچونی خۆی بێت، نەکو لەبەر بینەوبەردەی مشتومڕ و بیانوبڕی؛ توانستی ئاوەز لە ناسینی چاك وخراپدا رەت بکاتەوە، چونکە خوا مرۆڤی لە رێختەوە وا ئەفراندوە چاك و خراپ بناسێ و ئاوەزی بەوەدا بشکێ لەیەکیان جودا بکاتەوە، هەروەها لە رێختەوە فێری کردوە زیانبەخش و سودبەخش و گونجاو

---

۳۰ مفتاح دار السعادة (۲/۲).

۳۱ لوامع الأنوار البهية (۲/۲٥٦).

و نەگونجاو لێك هاوێر بكات و هەست و نەستی بە جوداكردنەوەیان تەوانا بێت.

ڕێختی یەكەم (كە ڕێختی جودا كردنەوەیەی چاك و خراپە) تایبەتە بە مرۆڤ و مرۆڤی پێ لە گیانەوەران جیابۆتەوە، ڕێختی دوەمیش (كە ڕێختی جیاكردنەوەی زەرەربەخش و سودبەخشانە) هەمو گیانەوەرێك تێیدا بەشدارە.[٣٢] ئەوەی كە لەسەر شانی موسڵمانەو پێویستە مشتومڕی تێدا بكات چەند خاڵێكن:

<u>یەكەم</u>: زۆر كاروبار هەیە بەرژەوەندی بۆ مرۆڤ تێدایە كەچی ئاوەزی مرۆڤ–بە تەنها–پەی پێ نابات چونكە ناچێتە نێو جوغزی ئاوەزەوە. كوا ئاوەز دەتوانێ ناو سیفەتەكانی خوا بناسێ؟ كوا دەتوانێ وردەكاری و چەندو چۆنی بەرنامەی خوا بزانێ؟ لە كوێ بزانێ خوا بەچ خۆشنودو ناخۆشنود و تورە دەبێ؟ لەكوێ بزانێ ئاخۆ چەند و چۆنی پاداشت و سزای خوا چۆنە؟ چی بۆ چاكەكارو خراپەكاران سازكردوە؟ ئەندازەو چۆنیەتی و رادەی سزاو پاداشتەكان چەندە؟ چۆن ئەو پەنامەكیانە بزانێ كە خوا تەنها بە پێغەمبەرانی ڕاگەیاندوەو خەڵكانی تری لێ بێ بەش كردوە، ئاوەز–بەتەنها– ڕێ بە ناسینی ئەو شتانە نابات.[٣٣]

<u>دوەم</u>: ئاوەز چاك و خراپان بە شێوەیەكی گشتی دەناسێ و ناتوانێ چەندو چۆن و وردەكاریەكانی بەرنامەو پەیام بزانی، خۆ ئەگەر بشزانێ هەر لە شێوەی

---

٣٢ مفتاح دار السعادة (٢/١١٦).

٣٣ مفتاح دار السعادة (٢/١١٧).

هەندەکیەو هەمومکیو هەموگر نیە، چونکە ئاوەز پەی بە چاکی دادگەری دەبات، بەلام قەت لە هەمو کردە و هەلویستێکدا نازانێ داد و ستەم چۆنە.[٣٤]

__سێیەم__: رەنگە ئاوەز رێ بەوە نەبات ئاخۆ ئەم کردەوەیە کام باری بەرژەوەندیو کام باری زەرەرمەندیە تا هەلوەستەی لەسەر بکات، ئیتر شەرع دێو بڕیاری بەرژەوەندی دەدات و زەرەرمەندی وەلا دەنێت.

رەنگە کردەوەی وا هەبێ بەرژەوەندی کەسێك و زەرەرمەندی کەسانیتری تێدابێ و ئاوەز پەی پێ نەبات، بەلام شەرع دێت بەرژەوەندی بڕیار دەدات و زەرەرمەندی دورەپەرێز دەکات، رەنگە کردەوەی واهەبێ لە رواڵەتدا زەرەرمەندی تێدایە بەلام لە ناواخندا بەرژەوەندی تێدایە، کەچی ئاوەز هەست بەوە ناکات، لێرەدا شەرع دێت و بەرژەوەندی و زەرەرمەندیەکەی والا دەکات.[٣٥]

ئیبنو تەیمیە(بەرمیهری خوا بێ) لەم بارەوە دەڵێ: پێغەمبەران شتی وایان هێناوە ئاوەز لەبەریدا دەسەوسانە، شتی وایان نەهێناوە ئاوەز پوکەڵی بکات، پێغەمبەران شتی وایان هێناوە ئاوەز لە ئاستیدا هوت دەبێ، نەستەمی وایان نەهێناوە ئاوەز لەبەریدا گوت ببێ.[٣٦]

__چوارەم__: ئەو ئەنجامانەی ئاوەز پێی دەگات ئەگەرچی راستیش بێ تەنها چەند گریمانەیەکن، رەنگە بۆچونی هاودژو خوانەناسی رایبماڵێ، خۆ ئەگەر رانەدرێو

---

٣٤ مفتاح دار السعادة (١١٧/٢).

٣٥ مفتاح دار السعادة (١١٧/٢).

٣٦ مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣١٢/٢).

بشمێنێ مادەم سروشی لەگەڵدا نیە هەر بە مەزندەیی دەمێنێتەوەو رەواو ناڕەوا تێکەڵ دەبێ.

## پوکەڵێتی وتەی بەرەهمیەکان:

بەرەهمیەکان پێیان وایە ئاوەز لە سروش بێنیازە، ئێمە بەڵگە ناهێنینەوە تا بۆچونیان پێ پوکەڵ بکەینەوە، بەڵام هەندێ لەو بەزم و نەگبەتیانەیان بۆ دەخەینە رو کە ئەو ئاوەزە بەسەری داهێناون کە ئەوان پێیدا هەڵدەڵێن، فەرمو ئەمە وتەی یەکێکە[37] لە پێشەواو رابەرەکانیان کە لە سەدەی بیستەمدا بە شانازیەوە دەڵێ: (کە چێڵ دەبینم پێم وانیە ئاژەل دەبینم، چونکە من چێل دەپەرستم، وە لە بەرامبەر هەمو جیهاندا داکۆکی لێ دەکەم.) ئاوەزە گەندەڵەکەی وای لێ کردوە چێڵ بە دایکێکی چاکتر دابنێ وەك لە دایکی راستەقینەی، دەڵێ: (چێڵی دایکم لە چەند روێکەوە لە دایکی راستەقینەم باشترە؛ دایکی راستەقینە بۆ ساڵێك یان دو ساڵ شیرمان پێ دەدات و لە پای ئەوەدا بە درێژایی تەمەن راژە دەخوازێ، کەچی چێڵی دایکمان بەردەوام شیرمان دەداتێو لەبەرامبەر ئەوەدا خواردنێکی ئاسایی نەبێ داوای چیترمان لێ ناکات )، خاڵۆی چێڵ پەرست درێژە بەوتەکانی دەدات و دەیان شێرو رێوی دێنێتەوە تا بسەلمێنی دایکە چێڵی لە دایکی راستەقینەی باشترە! ئەنجا دەڵێ: (بە ملیۆنان هیندستانی هەن چێڵ دەپەرستن و شکۆی بۆ دەنوێنن، منیش خۆم لە ریزی ئەو ملیۆنانە هەژمار دەکەم).

---

۳۷ ئەو کەسە غاندی سەرکردەی هیندستانە لە پەرتوکی بەراوردی ئاینان (٣٢/٤) دا تەماشای وتەکانی بکە (نظرات في النبوة ل ٢٧).

ماوەیەك بەر لە ئێستا لە ژمارەیەكی گۆڤاری (العربي)دا شتێكم لە بابەت پەرستگەیەك خوێندەوە كە پەرستگەیەكی زۆر فرەوان و نەخشین و رازاوە هەیەو دیوارەكانی هەمووی بە مەرمەڕی سپی ناوپۆش كراوە، خەڵكی هیندستان لە هەمو رەخ و روێكەوە بە كۆمەڵێك دیاریو پێشكەشی سەردانی دەكەن، بەڵام ئازیزان! دەزانن ئەو خوایەی ئەوان ئەم هەمو كەشم و نەشمەی بۆ دەكەن چیە؟ مشكە! بەڵێ، ئەوە بەزم و رەزمی ئەو ئاوەزەیانە كەپێیان وایە لە سروشی خوا بێنیازە.

## بوارەكانی ئاوەز:

ئەوانەی دەیانەوێ ئاوەز لە سروش دابڕن، ستەمێكی زۆر لە ئاوەز دەكەن و وزە و بەهرەكانی لە جێگەی ناشایەن بەهەدەر دەدەن، چونكە ئاوەز تایبەتكاری و گۆڕەپان و وزە و پێزی خۆی هەیە، جا ئەگەر لە تایبەتكاری خۆیدا بەكار نەبرا هەڵە دەكات و پەرتەوازە دەبێو پەل دەكوتێ، وە ئەگەر لە گۆڕەپانێكیتر تاوی پێدرا ساتمە دەكات و بەسەر دەمدا دەكەوێت، ئەگەر لەسەروی وزەی خۆشیدا ئەركبار بكرێ گۆت و كەشەنگ دەبێ.

ئەو جیهانە ماددییە بەرهەستە یان جیهانی سروشتی؛ گۆڕەپانی پان و پۆڕی ئاوەزەو لەوەدا دەتوانێ ئەسپی خۆی تێدا تاوبدات و گەنجینەكانی دەربهێنێو هۆو ئەنگێزەكانی لەگەڵ پێشینەو دەرەنجامەكانی بەیەكەوە ببەستێتەوە، دەتوانێ شت بدۆزێتەوەو نوێكاری تێدا بكات، دەتوانێ لە زانستە سودبەخشەكانی بوارە جیاجیاكانی ژیان ببێتە پسپۆڕ و رەورەوەی پێشكەوتن بەرەو پێشەوە ببات.

بەڵام ئەگەر لە دەرەوەی تایبەتکاری خۆی-مەبەستم لەو بەری سروش (میتافیزیکا) دێت-خەریك و سەرگەرم بکرێ، ئەوا دوای ماندوبون و تۆژینەوەیەکی دورودرێژ بە دەستی بەتاڵ، بەڵکو بەکۆمەڵێك شتی خاپەرۆك و بێنرخەوە دێتەوە.[38]

## شوێنی ئاوەز لە سروشدا:

خەڵکانێك هەن پێیان وایە سروش دەبێتە ئەنگێزەی خامۆشبون و کوژاندنەوەی روناکی ئاوەزو شل و شەکەت کردنی، بەڵام ئەمە وانیە و فرِی بەراستیەوە نیە، چونکە سروشی خوایی ئاوەز هەڵدەنێ تا بیر لەم گەردونە سەیرو فرەوانە بکاتەوە و تێوەی رامێنێ، هانی مرۆڤ دەدا زەوی ئاوەدان و بە بەرهەم بکات، ئەرکی ئاوەز لەئاست ئەو زانیاریانەش کە خوا دایبەزاندوە ئەوەیە بزانێ ئاخۆ راستە لەلایەن خواوەیە، ئەگەر وابو وەریگرێ، هەروەها ئاوەز بۆ تێگەیشتن و حاڵیبونی سروش بەکار بێنێ و پاشان زیرەکانە پیادەی بکات، ئاوەز ئەگەر سروشی لەگەڵ بێ وەك تیشك و روناکی خۆر وایە بۆ چاو، بەڵام ئەگەر ئاوەز لە سروش دابڕا مرۆڤ لە ئاوەزەکەی بەهرەمەند نابێ، وەك چۆن چاو لە تاریکاییدا نابینێ و بێ هودەیە، بەڵام کە روناکی رۆژی لێ بوەوە دەبینێ، ئاوەزیش بەم جۆرەیە ئەگەر تیشکی سروش ئاوەز و دڵی روناك بکاتەوە ئەوا رێنوێن دەبێ:

﴿فَإِنَّهَا لاَ تَعْمَى الأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى القُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ: خوا چاو کوێر ناکات بەڵکو دڵی نێو سینگ کوێر دەکات﴾ الحج/٤٦.

---

٣٨ نظرات في النبوة ل (١٧).

# بەندی سێیەم

# پیشە و ئەرکی پێغەمبەران

قورئانی بەرێزو فەرمودەی بەپێز ئەرکی پێغەمبەرانیان رۆن کردۆتەوە کە ئێمەش لێرەدا بە پێی توانا دەیانخەینە رو:

## ١) راگەیاندنی رون:

پێغەمبەران نێردراو و هەڵگری سروشی خوان، ئەرکی یەکەمیان راگەیاندنی ئەو راسپاردەیە کە خوا پێیدا ناردون: ﴿يَاأَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ: ئەی پێغەمبەر! تەواوی ئەو هەناردراوانەی خوا بۆی رەوان کردوی رابگەیەنە، ئەگەر وانەکەی پەیامی خوات رانەگەیاندوە﴾ المائدة/٦٧، راگەیاندنی پەیامەکانی خوا وێران و بێباکی گەرەکە تاکو لە راگەیاندنی ئەو شتانەی لەبەر دیدی خەڵك نامۆ و تازەیە نەسەنگرێتەوە، یان کە فەرمان بە کارێك دەکات و ئەوان پێی هەراسانن، یان کە بەرهەڵستی کارێکیان لێ دەکات ئەوان ئالودەیان پێوە گرتوە، نەپرینگێتەوە: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالاَتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلاَ يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلاَّ اللَّهَ﴾ الأحزاب/٣٩.

راگەیاندن بەوە دێتەدی کە ئایەتەکانی خوا بێ زیادو کەم بخوێنێتەوە: ﴿اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنْ الْكِتَابِ﴾ العنكبوت/٤٥، ﴿كَمَا أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِنْكُمْ يَتْلُو عَلَيْكُمْ آيَاتِنَا: وەك چۆن پێغەمبەرێکمان لە خۆتاندا و لە نێو خۆتان بۆ رەوانە کردوە، کە ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێننەوە﴾ البقرة/١٥١. خۆ ئەگەر سروشەکە دەقێك نەبو بخوێندرێتەوە، ئەوا راگەیاندنەکە بەوە دەبێ کە ئەو فەرمان و بەرهەڵستیو واتا و زانستانەی کە خوا ناردویەتی رون و والا بکرێتەوە، بێئەوەی خاڵێکی لێ کەم و زیاد بکرێ.

راگەیاندن ئەوەیە کە پێغەمبەر سروش رون بکاتەوە، پێغەمبەر خۆی لە دەر خستن و رونکردنەوەی واتاو مەبەستەکەی لە هەمو کەس شایەتترو بەتواناترە، ئەو دەزانێ خوا بەم سروشە چی پێ مەبەستە، خوا دەفەرموێتە پێغەمبەر ﷺ: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ: قورئانی یادەوەرمان بۆ دابەزاندوی تا بۆ خەڵکی رون بکەیەوە کە چییان بۆ دابەزیوە، بەڵکو بیر بکەنەوە﴾ النحل/٤٤.

رونکردنەوەی سروشی خوا رەنگە بۆ وتەو گوفتار بێ، پێغەمبەر ﷺ چەندین بوڵێلی روناك کردۆتەوە، ئەوەتانێ واتای ستەمی ئەم ئایەتە رون دەکاتەوە کە مەبەست لە هاوبەشپەرستی دێت نەك ستەم لە خۆ کردن بە سەبارەتی گوناحان، ئایەتەکەش دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيمَانَهُمْ بِظُلْمٍ أُوْلَئِكَ لَهُمْ الأَمْنُ وَهُمْ مُهْتَدُونَ: ئەوانەی بڕوایان هێناوە و بڕواکەیان تێکەڵی ستەم نەکردوە ئەوانە ئارامی و هێمنیان بۆ هەیە و رێنوێنن﴾ الأنعام/٨٢، هەروەها ئەو ئایەتانەی لە بارەی نوێژ و زەکات و حەج و شتیتریش دابەزیوە، بەوتە

بەپێزەکانیەوە مەبەستەکانی رون کردۆتەوە. رونکردنەوەی سروشتی خوا رەنگە بەکردار بێ، کردەکانی پێغەمبەر ﷺ لە نوێژو زەکات و حەج و زۆری‌تردا رونکردنەوەی چەندین دەقی قورئانیە. لەو کاتانەی خەڵکیش پشت لە بانگەوازی پەیامبەران دەکەن یاخۆ بەرانگژی دەبنەوە، ئەوا لە راگەیاندن بترازێ چیتریان لە ئەستۆدا نیە: ﴿وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ: ئەگەر رویان وەرگێڕا ئەوا تەنها راگەیاندن ئەرکی تۆیە﴾ آل عمران/٢٠.

## ٢) بانگکردنی خەڵك بۆ لای خوا:

ئەرکی پەیامبەر تەنها بە رونکردنەوەو راگەیاندنی رەوا کۆتایی نایێت، بەڵکو دەبێ خەڵکیشی بۆ بانگ بکات تاکو بە دەنگیەوە بێن و لە ژیاندا پەیڕەوی لێبکەن، پەیامبەران بۆ هەمان رێبیر بانگەواز دەکەن و بە خەڵك دەڵێن ئێوە بەندەی خوان و خوا پەروەردگاری ئێوەیە، خوا ئێمەی ناردوە تا چۆنیەتی خواپەرستیتان پێ رابگەیەنین، مادەم ئێمەش پەیامبەری خواین کەواتە لە سەرتان پێویستە ئەژنەوامان بن و پەیڕەو لە رێبازەکەمان بکەن: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولاً أَنْ اُعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ: بۆ هەمو نەتەوەیەك پێغەمبەرێکمان ناردوەو بەخەڵکی گوتوە خوا بپەرستن و لە یاخییان دورەپەرێز بن﴾ النحل/٣٦، ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ: بەر لەتۆ هەر پەیامبەرێکمان ناردبێ سروشمان بۆ دابەزاندوە کە جگە لە خوا هیچ خواوەندێکی‌تر نیەو هەر ئەو بپەرستن﴾ الأنبياء/٢٥. هەمو پێغەمبەرێك بە گەلەکەی گوتوە: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾ الشعراء/١٠٨، ١٣٦، ١٤٤، ١٥٠، ١٦٣، ١٧٩.

پێغەمبەران کردوکۆش و ڕەنجێکی فرەوانیان لەپێناوی بانگەوازدا تەرخان کردوە، ئەوەتانێ پێغەمبەر نوح ﷺ بۆ ماوەی نۆسەدو پەنجا ساڵی ڕەبەق بەشەو وبەڕۆژ بەئاشکراو بەنهێنی بانگەوازی کردوە، ئەوپەڕی نەشم و شێوازی ڕاست ودروستی موژدەو هەڕەشەی بەکارهێناوە، تەقەلایەکی بێئەندازەی داوە پەردەی تاریکی ئاوەزیان تارومار بکات تا بیر لە نیشانەو سەمەرەکانی گەردون بکەنەوە، بەڵام ئەوان لە کەلی شەیتان نەهاتونەتە خوارەوە: ﴿قَالَ نُوحٌ رَبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِي وَاتَّبَعُوا مَنْ لَمْ يَزِدْهُ مَالُهُ وَوَلَدُهُ إِلَّا خَسَارًا: نوح گوتی؛ خوایە! ئەوانە سەرپێچیان لێ کردم و دوای شتێك کەوتون کە تەنها زیان بە ماڵ و منداڵیان دەگەیەنن ﴾ نوح/٢١.

## ئەم نمونەیە ڕۆڵی پێغەمبەران ڕون دەکاتەوە:

فریشتە، وێنەیەك دەهێننەوە کە ڕۆڵ و ئەرکی پێغەمبەر ﷺی پێ ڕون دەبێتەوە: ((إني رأيت في المنام كأن جبريل عند رأسي، وميكائيل عند رجلي، يقول أحدهما لصاحبه: اضرب له مثلاً، فقال: اسمع سمعت أذنك، واعقل عقل قلبك، إنما مثلك ومثل أمتك، كمثل ملك اتخذ داراً، ثم بنى فيها بيتاً، ثم جعل فيها مائدة، ثم بعث رسولاً يدعوا الناس إلى طعامه، فمنهم من أجاب الرسول، ومنهم من تركه، فالله هو الملك، والدار الإسلام، والبيت الجنة، وأنت يا محمد رسول، من أجابك دخل الإسلام، ومن دخل الإسلام دخل الجنة، ومن دخل الجنة أكل ما فيها: لەخەودا دیتم وەك بڵێی جبریل لەلای سەرم بو و میکائیلیش لەلای پێیەکانم بو، یەکێکیان بەوەی تری گوت: وێنەیەکی بۆ بێنەوە، ئەویش بە پێغەمبەری گوت: گوێ بگرە گوێت ژنەوابێت، هۆشمەند بە دڵت هۆشمەند

بێت، وێنەی تۆ و نەتەوەکەت وەکو پاشایەك وایە خانویەك دروست بکات، پاشان ژورێکی لێ دروست بکات و سفرەیەکی لەناو دابنێ، پاشان نێردراوێك بنێرێ خەڵك بانگێشت بکات، هەیان بێ وەڵامی بانگێشتی نێردراوەکە بداتەوە و هەندێکیش وەڵامی نەدەنەوە، جا خوا پادشاکەیەو خانوەکەش ئیسلامەو ژورەکەش بەهەشتە، موحەممەد تۆش نێرداراوەکەی، ئەوەی وەڵامت بداتەوە دێتە ناو ئیسلام، ئەوەی بێتە ناو ئیسلام دەچێتە ناو بەهەشت، ئەوەی بچێتە بەهەشت نازو نیعمەتەکانی بەهەشت دەخوات))(رواه البخاري و الترمذي)[39].

## ٣) هەڕەشەگاری و موژدەبەخشی:

بانگەوازی پەیامبەران هەردەم هاودەمی موژدەبەخشی و هەڕەشەگاری بوە، هەر لەبەر پەیوەندی تۆکمەی نێوانیان لە زۆر ئایەتی قورئاندا ئەرکی پێغەمبەرانی هەر لەم دوەدا کۆ کردۆتەوە: ﴿وَمَا نُرْسِلُ الْمُرْسَلِينَ إِلاَّ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ: هەر پێغەمبەرێك بنێرین موژدەبەخش و هەڕەشەگارە﴾ الكهف/٥٦.

پێغەمبەر ﷺ نمونەیەك بۆ خۆی دێنێتەوەو دەڵێ: ((مثلي ومثل ما بعثني الله به، كمثل رجل أتى قوماً فقال: ياقوم إني رأيت الجيش بعيني وإني أنا النذير العريان فالنجاء النجاء، فأطاعه طائفة من قومه فأدلجوا وانطلقوا على مهلهم فنجوا، وكذّبته طائفة منهم فأصبحوا مكانهم فصبحهم الجيش فأهلكهم واجتاحهم، فذلك مثل من أطاعني فاتبع ما جئت به، ومثل من عصاني وكذّب بما جئت به من الحق: وێنەی من و ئەو دینەی خوا ئەرکی راگەیاندنی پێ

---

٣٩ صحيح الجامع (٢/٣١٩).

سپاردم وەکو ئەو پیاوە وایە کە بەتەنکەتاوی بێتە لای هۆزو کەلەکەی خۆی و بڵێ: هەیاران! من بە هەردو چاوی خۆم لەشکری دوژمنم بینیوەو خەریکە بگاتە سەرتان، من ترسێنەری روت و قوتم، زو بەخۆکەون و دەربازبن، جا هەندێکیان ئەژنەوای بن و شەوێ بەدزی و بەئاهێستە ئەوێیان بەجێ هێشت و خۆیان دەرباز کرد، بەڵام هەندێکیان پێیان بڕوا نەکردو لەجێی خۆیان نەبزاوتن، ئیتر بۆ بەیانی زو لەشکرەکە بەسەری دادان و تارومارى کردن، بەڵێ ئەوە بو وێنەی ئەژنەواو نا ئەژنەوایانم)) متفق عليه[40].

موژدە بەخشیو هەڕەشەکاری پێغەمبەران هەم بۆ ژیان و هەم بۆ ژیانەوەیە، موژدەی ژیانێکی گوشاد بە ئەژنەوایان دەبەخشن: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً: هەر کەسێك پیاو بێ یا ئافرەت ئەگەر بڕوادار بێو کرداری چاك بکات ژینێکی گوشادی پێ دەبەخشین﴾ النحل/٩٧. ﴿فَمَنْ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى: ئەوی شوێن رێنوێنی بکەوێت نەگومڕا دەبێو نەدوچاری بەدبەختی دەبێ﴾ طه/١٢٣. موژدەی سەربەرزیو قەڵەمڕەوێتیان پێ دەبەخشن: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمْ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لاَ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا: خوا هەرێی بە بڕواداران و چاکەکارانی ئێوە داوە کە لە زەویدا جێنشینیان بکات هەروەکو چۆن گەلانی بڕواداری پێشینی جێنشین کردوە، هەروەها دینەکەیان سەربخات و سەقامگیری بکات، ترسیان بۆ

---

٤٠ صحيح الجامع (٢٠٥/٥).

دەکاتە ئارامیو دڵنیایی، دەمپەرستن و هاوبەشم بۆ پەیدا ناکەن ﴾ النـور/٥٥.
هـەروەها هەڕەشەی نەگبـەتی و بەدبەختی ژیـان لـە یـاخیو سـەر پێچیکـاران دەکەن: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا: ئـەوەی پشـت لـە یـادی مـن (قورئان) هەڵکا ژیانێکی تاڵ و تەنگی توش دەکەم ﴾ طـه/١٢٤، هەڕەشـەی سـزاو فـەوتانی ژیانیـان لێ دەکـەن: ﴿فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ: ئەگەر سەرپێچیان کرد پێیان بڵێ: هەڕەشەی هـەورە تریشقەیەکی وەکو هی عادو ثەمودتان لێ دەکەم ﴾ فصلت/١٣.

لە ژیانەوەشدا موژدەی بەهەشت بە ئەژنەوایان دەبەخشن: ﴿وَمَنْ يُطِعْ اللَّـهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: ئـەوەی ئەژنەوای خواو پێغەمبەر بێت خوا دەیخاتە نـاو ئـەو بەهەشتانەی کە چەندین روبارو جۆگەلـەی بەژێر درەختـەکانی دا دەروات، ئەوەیە سـەرکەوتنی مـەزن ﴾ النساء/١٣، هەڕەشەی دۆزەخ و سزای خواش بە تاوانکارو یاخیـان دەدەن: ﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ: ئـەو کەسـەی سەرپێچی لە فەرمانی خواو پێغەمبەر بکات و سنور ببەزێنێ خوا دەیخاتـە نـاو ئاگری هەمیشەییو لەوێدا سزایەکی ریسواکەری بۆ هەیە﴾ النساء/١٤.

هــەر کەســێك بانگــەوازی پێغەمبــەران بخوێنێتــەوە دەبینــێ هــەوێنی بانگەوازەکـەیان هەڕەشــەکاریو موژدەبەخشــی بــوە، ئـەو هەڕەشــەکاری و موژدەبەخشـیەی ئـەوان ئـەنجامیان داوە وا پێدەچـێ کلیلـی دەروازەی نـاخی مـرۆڤ بێت، نـاخی مـرۆڤ رام و راهـاتی ئەوەیـە کـە چاکـەو قـازانج بـۆ خـۆی وەدەسـت بێنـێو زیـان و خراپـەش لـە خـۆی وەدور بخاتـەوە، جـا ئەگــەر

پێغەمبەران ناخی مرۆڤ لەو پاداشت و خەڵات و بەهرەمەندیانە بێدار بکەنەوە کە لە بڕواو کرداری چاکدا وەدەستی دێنن؛ ئەوا تامەزرۆی دەبن، هەروەها ئەگەر مەرگەسات و دەردەسەری و نەگبەتیەکانی ڕێی کوفرو نەفامی بۆ ڕون بۆوە؛ ئەوا دڕودۆنگ و دورەپەرێز دەبێ، ئەو بەخشش و بەهرانەی خوا موژدەی پێداوە دڵ و دەرون چێژی لێ وەردەگرێ و خەیاڵی پێ پاراو دەبێ، فەرمو سەرنج بدە وتەکانی پەروەردگار کە لە بارەی بەخششەکانی بەهەشتی پڕ لە بەهرە دەفەرموێ: ﴿عَلَى سُرُرٍ مَوْضُونَةٍ۝ مُتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ۝ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ۝ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ۝ لاَ يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلاَ يُنزِفُونَ۝ وَفَاكِهَةٍ مِمَّا يَتَخَيَّرُونَ۝ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمَّا يَشْتَهُونَ۝ وَحُورٌ عِينٌ۝ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ۝ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ۝ لاَ يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلاَ تَأْثِيمًا۝ إِلاَّ قِيلاً سَلاَمًا سَلاَمًا۝ وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ۝ فِي سِدْرٍ مَخْضُودٍ۝ وَطَلْحٍ مَنْضُودٍ۝ وَظِلٍّ مَمْدُودٍ۝ وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ۝ وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ۝ لاَ مَقْطُوعَةٍ وَلاَ مَمْنُوعَةٍ۝ وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ۝ إِنَّا أَنْشَأْنَاهُنَّ إِنْشَاءً۝ فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا۝ عُرُبًا أَتْرَابًا۝ لِأَصْحَابِ الْيَمِينِ: لەسەر تەختی لە زێڕ چنراودا ڕوەوڕوی یەکتر پاڵ دەدەنەوە، کوڕانی جوانی پاك کە بۆ هەمیشە لە تەمەنی نەوجەوانی خۆیاندا دەمێننەوە، بە پەرداخ و پیاڵەی پڕ لە شەرابی سەرچاوەی ڕەوان لە دەورەیاندا دەگەڕێن، کە نە سەرئێشەی پێ دەگرن و نە سەرخۆش دەبن، میوەیەك دەخۆن کە خۆیان هەڵیدەبژێرن، گۆشتی ئەو مەلانە دەخۆن کە خۆیان حەزیان لێیە، هەروەها حۆری چاوجوانیان هەیە کە دەڵێی مرواری ناو سەدەفن، ئەم بەخششانە پاداشتی کردەوەی چاکی خۆیانە، لەو بەهەشتانەدا نەقسەی بێهودەو نەقسەی گوناح نابیستن مەگەر

قسەی ئاشتی و سلاو. یارانی لای راست، کام یارانی لای راست؟ لە ژێر درەختی نەبقی بێدڕکن، دارمۆزی پڕ هێشو، سێبەری دوورودرێژ، ئاوی داڕژاو، میوەی زۆر کە نابڕێتەوە و قەدەغەش نیە، رایەخ و نوێنی بەنرخی راخراو، ئافرەتانی ناو بەهەشتمان زۆر بەدانسقەیی ئەفراندوە، هەموویان کچن، خۆشەویست و یەك تەمەن و یەك جوانین، بۆ یارانی لای راستن ﴾ الواقعة/١٥-٣٨.

هەروەها سەرنج بدە سزاو ئەشکەنجەی بێبڕوا دۆزەخیەکان: ﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ۞ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ۞ وَظِلٍّ مِنْ يَحْمُومٍ۞ لَا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ۞ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ: دەستەی لای چەپ؟ لەگڕی ئاگرو ئاوی لەکوڵ و لەبەر سێبەری دوکەڵی رەشدان کە نە فێنکە نە سودبەخش، چونکە بەڕاستی ئەمانە لەپێشودا زۆر لە نازونیعمەتدا بون﴾ الواقعة/٣٩-٤٥. ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ۞ لَآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ۞ فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ۞ فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ۞ فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ۞ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ : ئێوەش ئەی گومڕایانی بێباوەڕ لە درەختی زەقنەموتی دۆزەخ دەخۆن، لەبرسان ورگی لێ پڕ دەکەن، ئینجا ئاوی کوڵاوی بەسەردا دەخۆنەوە، وەکو وشتری شێتی تێنو، ئەوەیە میوانداری ئەوانە لە رۆژی سزادا﴾ الواقعة/٥١-٥٦. ئەگەر دەستی براکانت بگریو بەیەکەوە دابنیشن و پەڕتوکەکەی (مونذيري حافظ) کە ناوی (الترغیب و الترهیب)ـە فەرمودەکانی بخوێنیەوە، ئەوکات دەزانی تاو و کاریگەری موژدەبەخشیو هەڕەشەکاری لەناخی خۆت و گوێگران چۆنە.

ئەوانەی لە بانگەوازی ئیسلام نەفامیون، سەرزەنشتی ئەو بانگبەرانە دەکەن کە شێوازی هەڕەشەکاری و موژدەبەخشی بەکاردێنن، بەتەوسەوە دەڵێن:

ئەمیش ئامۆژگارە، لەوە سەرزەنشتیان دەکەن گوایە لە فەلسەفەو رەهەندی ئامۆژەکانیان ناگەن، داوایان لێ دەکەن واز لە ئامۆژگاریو هەرەشەکاریو موژدەبەخشی بێنن، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە ترازاون و پێویستیان بەوەیە کە بەخۆیان و وتەو هەڵوێستیان ڈابچنەوە، لە ژێر رۆشنایی قورئان و فەرمودەدا رێبازی بانگەوازو ئەرکی پێغەمبەران بناسن.

## ٤) پەروەردەکردن و زاخاودانی ناخ و دڵ:

خوا بۆ بەندەکانی میهرەبانەو لە میهرەوەری خۆیەتی کە ناخی بەندەکانی زاخاو دەکات و بەروناکی قورئان دڵیان رۆشن دەکاتەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلاَ الإِيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا﴾ الشورى/٥٢. خوا سروش دادەبەزێنێ تا خەڵکی پێ لە تاریکستانی بێبڕوایی و هاوبەشپەرستی بەرەو روناکستانی ئیسلام رزگار بکات: ﴿اللهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ: خوا هاناگاری بڕوادارانە، لە تاریکستانێ دەریان دێنیّو دەیانخاتە روناکستانی﴾ البقرة/٢٥٧، پێغەمبەرانیشی هەر بۆ ئەوە ناردوە تا مرۆڤ لە شەوەزەنگی نەفامی رزگار بکات و بەرەو رۆژی رونی ئیسلامیان ببات: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا أَنْ أَخْرِجْ قَوْمَكَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ﴾ إبراهيم/٥، مرۆڤ ئەم روناکیەی نەبێ کوێرو کوڵەوارە: ﴿فَإِنَّهَا لاَ تَعْمَى الأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ الحج/٤٦، بەندە ئەم روناکیەی نەبێ پەردەی گومڕایی بەسەر دڵدا دێت و وای لێ دێ لە چاکە و قازانج بپڕینگێتەوەو

بۆ خراپەو زیانباری مل بنێ: ﴿ویعبدون من دون الله ما لا ینفعهم ولا یضرهم: شتی تری بێ لە خوا دەپەرستن کە نەسودو نەزیانی بۆیان نیە﴾ الفرقان/٥٥.

دەرباز کردنی خەڵك لە تاریسکتانی بێبڕوایی بەرەو روناکستانی بڕوا بەوە دێتە دی کە پێغەمبەران خەڵك فێری ئامۆژەکانی خوا بکەن، دڵ و ناخیان مشتومالْ بکەن، خواو ناو سیفەتەکان و فریشتەو پەیامبەران و رێی چاك و خراپیان پێ بناسێنن، رێی خۆشنودی خوایان پێ نیشان دەن، پەرستنیان تێ بگەیەنن: ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُبِينٍ: خوا ئەو خوایەیە کە لەناو نەخوێندەواران پێغەمبەرێکی لە خۆیانەوە بۆ ناردون کە ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوەو پاکیان دەکاتەوەو قورئان و فەرموودەی پڕ لە سودیان فێر دەکات، هەرچەندە ئەوان لە پێشودا لە گومراییەکی ئاشکرادا بون﴾ الجمعة/٢. ﴿رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ: خوایە لەناو نەوەکانماندا پێغەمبەرێك بنێرە لەخۆیان، ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە﴾ البقرة/١٢٩.

### ٥) راستکردنەوەی هزری ترازاو و بیروباوەڕی لارێ:

خوا خەڵکی بە رێختێکی پاکی یەکتاناس ئەفراندوەو لەسەرەتاشدا بەم رێوشوێنە گوزەراون، بەتەنها خوایان دەپەرست و هاوبەشیان بۆ بڕیار نەدەدا، بەڵام کە دابڕدابڕ بون و دوبەرەکیان تێکەوت، خوا پێغەمبەری بۆ ناردن تاوەکو بیانگەڕێنێتەوە سەر رێی راست و لە گومرایی رزگاریان بکات: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ: خەڵك لەسەرەتادا یەك نەتەوەی خوا

پەرستت بون، بەلام کە پەرتەوازە بون: خوا موژدەبەخش و هەڕەشەکاری بۆ ناردن تا وەگەڕێنەوە سەر ڕێی ڕاست ﴾ البقـرة/٢١٣. واتای ئەوەیە کە خەڵك هەموی لەسەر ڕێی یەکتاناسی و بڕوای خواپەرستی بوە، بەلام پاشان بۆ ڕێچکەکانی نەفامێتی ترازاون.

سەرجەم پێغەمبەران خەڵکیان بۆ ڕێیڕاست بانگ و ڕێنوێنی کردوە، ئەمە ئەرکێك بوە سەرجەم پێغەمبەران رایانپەڕاندوە، بەلام هەر پێغەمبەرێك ئەو جۆرە لاڕێبونەی راستەریٚ کردۆتەوە کە لە شوێنکاتی ئەودا هەبوە، چونکە لاڕێبون جۆراو جۆرەو هەر سەردەمەو بە جۆرێکە، پێغەمبەر نوح و ئیبراهیم ﷺ بەرهەڵستیان لەگەلەکەیان کردوەو رایانگەیاندوە بت نەپەرستن، پێغەمبەر هودﷺ بەرهەڵستی لە گەلەکەی کردوە کە تەنتەنەو سەنسەنەو کەشوفشان نەکەن و هەڵنەفیزێن، پێغەمبەر ساڵح ﷺ بەرهەڵستی لە گەلەکەی کردوە خراپکاری لە زەویدا نەتننەوە و پەیرەوکاری بەدکاران نەبن، پێغەمبەر لوط ﷺ دژایەتی پەتای نێربازی کردوە، پێغەمبەر شوعەیب ﷺ بەرهەڵستی لە گەلەکەی کردوە تەرازوبازی و پێوانەدزی نەکەن... ئیتر بەم جۆرە، هەر تاوانێك لەم تاوانانە یان تاوانیتر کە نەتەوەیەك ئەنجامی دەدات دەرچون و لاڕێبونە لە راستەرێی ڕێنوێنی، ئەرکی پەیامبەرانیش ئەوەیە پوچ و پوکاتی ڕێچکەکانیان بۆ رون بکەنەوەو بەهەر نەشمێك بێت کۆشش لە دژی لاڕێبون تەرخان بکەن.

## ٦) بیانو بڕین:

خوا پۆزشی بەندەکانی قبولٚ کردوە، بۆیە پەیام و پەیامبەرانی ناردوە تا لە ژیانەوەدا هیچ کەسێك بیانوی نەمێنیٚ: ﴿رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ: ئەو پەیامبەرانەمان ناردوە -کە هەڕەشەکارو

موژدەبەخشن- بۆ ئەوەیە خەڵك بیانوویان لەبەرامبەر خوا نەمێنێ﴾ النساء/١٦٥.

خۆ ئەگەر پەیامبەری بۆ نەناردبان، خەڵك پۆزشیان لە خوا دەخواست و دەیانگوت: خوایە! خۆ تۆ کەست بۆ ئێمە نەناردوە تا تێبگەین چت دەوێت، بۆ سزامان دەدەی؟ بۆ دەمانخەیە ناو دۆزەخ؟ هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُمْ بِعَذَابٍ مِنْ قَبْلِهِ لَقَالُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَذِلَّ وَنَخْزَىٰ: ئەگەر خوا بەرلەوەی پێغەمبەریان بۆ بنێرێ بەسەبارەتی بێبڕوایی سزای بدابان دەیانگوت: خوایە بەرلەوەی ریسواو زەبون باین دەبوایە پێغەمبەرمان بۆ بنێری تا بمانزانیبایە مەبەستت چیەو بەکام رێوشوێندا برۆین.﴾ طه/١٣٤.

لە رۆژی ژیانەوەدا خوا سەرانسەری مرۆڤایەتی کۆدەکاتەوە و هەر نەتەوەیەك و پێغەمبەرەکەی لەبەردەم یەکتریدا رادەگرێ تا گەواهی بدات پەیامەکانی خوای بە نەتەوەکەی راگەیاندوەو بیانوی بڕیون: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ۞ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا: چۆنە ئەگەر لەهەمو نەتەوەیەك گەواهیدەرێك بێنین، تۆش بکەینە گەواهیدەر لەسەر ئەم نەتەوەیە کە تۆ پەیامت راگەیاندوە، لەو رۆژەدا بێبڕواو نائەژنەوایان کە سەرپێچیان لە فەرمانەکانی پێغەمبەر کردوە حەزدەکەن لەزەویدا نغرۆ ببن، بێبڕواکان ناتوانن وتەکانیان لە خوا بشارنەوە﴾ النساء/٤١-٤٢. لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِمْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ: لەو رۆژەدا - مەبەستی رۆژی لێپرسینەوەیە- لەهەمو نەتەوەیەك گەواهیدەرێك لە خۆیانەوە

دێنین، تۆش دێنین دەتکەین بە گەواهیدەر لەسەر ئەوانە﴾ النحل/٨٩، بۆیە دوای ناردنی پێغەمبەران یاخیبوان کە خوا سزای خۆی بەسەریاندا دادەبارێنێ ناتوانن سەرکێشی بکەن و پۆزش بخوازن: ﴿وَكَمْ قَصَمْنَا مِنْ قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنْشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ۞ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُمْ مِنْهَا يَرْكُضُونَ۞ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَى مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ۞ قَالُوا يَاوَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ۞ فَمَا زَالَتْ تِلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّى جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ: چەندین دێهاتی ستەمکارمان تەفروتوناکردوە، پاشان هۆزی ترمان بۆ فەراهەم هێناوە، کە سزای ئێمەیان پێ دەگەیشت هەڵدەهاتن، هەڵمەیێن بگەڕێنەوە بۆ عەیش و نۆش و نێو خانوەکانتان! بەڵکە پرس و تەگبیرێك بکەن، ئەوکاتە وتیان: ئای لەخۆمان بێکەسێ ئێمە چەند ستەمکار بوین، هەرهات و هاواریان بو تا وەك پوش و پەلاشی دوراوەمان لێ کردن و خامۆش بون﴾ الأنبياء/١١-١٥. جا کە لەڕۆژی ژیانەوەشدا بەرەو سەرەنجامی ترسناك راپێچ دەکرێن و دۆزەخیان بۆ دەبێتە هەوارگە، لێیان دەپرسرێ: بۆچی؟ چاری ناچار دان پێدادەنێن و سەرکێشی لە تاوانەکانیان ناکەن: ﴿تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ الْغَيْظِ كُلَّمَا أُلْقِيَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ۞ قَالُوا بَلَى قَدْ جَاءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ كَبِيرٍ۞ وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ۞ فَاعْتَرَفُوا بِذَنْبِهِمْ فَسُحْقًا لِأَصْحَابِ السَّعِيرِ: دۆزەخ لە رق و تورەییان خەریکە پەرەم بەپەرەم ببێ، هەرجارەی کە چینێك تورِ دەدرێنە ناو ئاگر ئاگرەوانەکان دەپرسن: ئەدی هەڕەشەگارتان بۆ نەهات؟ دەڵێن: بەڵێ هەڕەشەگارمان بۆهات بەڵام ئێمە بڕوامان نەکردو دەمانوت خوا هیچی دانەبەزاندوە، درۆدەکەن و ئێوە لە

گومڕایی گەورەدان، هەروەها دەڵێن: خۆ ئەگەر ژنەوا و هۆشمەند بوباین ئەوا قەت توشمان بەتوشی ئەو دۆزەخە کڵپەدارە نەدەبو، پێ لە گوناحەکانیان دەنێن، هەی توناوتون بن ئەوانەی دۆزەخین ﴿ الملك/٨-١١. کاتێکیش کە لە نێو هەڵم و هالاو و گڕوکڵپەی دۆزەخدا هەڵدەپروکێن و هاوارو ناڵەیان بەرز دەبێتەوە؛ ئاگرەوانەکان پێیان دەڵێن: ﴿قَالُوا أَوَ لَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلاَّ فِي ضَلالٍ: باشە ئەدی پێغەمبەرانتان بەخۆ بەکۆمەڵە بەڵگەو نیشانەیەک بۆ نەهات؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەوانیش دەڵێن: مادەم هەر هاوار بکەن و بپاڕێنەوە، پاڕانەوەی بێبڕوایان بێ هودەیە﴾ المؤمن/٥٠.

## ٧) بەڕێوەبردنی کاروباری نەتەوە:

شوێنکەوتوی پێغەمبەران کە کۆمەڵ یان نەتەوەیەک پێکدێنن، ئاتاجی کەسێکن کاروباریان هەڵسوڕێنێ و مشوریان بخوات، هەڵبەت پێغەمبەران تا لە ژیاندا بن خۆیان کاروباری نەتەوەکەیان بەڕێوە دەبەن و بەخۆیان دادوەری خەڵک دەکەن: ﴿فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ﴾ المائدة/٤٨، خوا بانگی پێغەمبەر داودی کردو فەرموی: ﴿يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ: ئەی داود تۆمان کردۆتە جێنشین لە سەر زەوی، حوکم لەنێوان خەڵک بکە بە حەق ﴾ ص/٢٦. پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلیش بەپێی ڕێوشوێنی تەورات کاروباری خەڵکیان هەڵدەسوڕاند، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((كانت بنو إسرائيل تسوسهم الأنبياء كلما هلك نبي قام نبي: پێغەمبەران کاروباری بەنی ئیسرائیلیان هەڵدەسوڕاند، هەر کاتێ پێغەمبەرێک مردبا پێغەمبەرێکی‌تر

**دەهات))** رواه البخاري ومسلم وأحمد وأبن ماجة (صحيح الجامع الصغير ٤/١٩٠)، **خواش لە بارەی تەوراتەوە فەرمویەتی:** ﴿يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا﴾ المائدة/٤٤.

**پێغەمبەران فەرمانڕەوایی خەڵك دەكەن، ڕەوشی ئاشتیو جەنگ و كاری نەتەوە بەڕێوە دەبەن، كاروباری دادوەری ئەنجام دەدەن، سەرپەرشتی بەرژەوەندیەكانی خەڵك دەكەن، لەهەمو ئەمانەدا بەفەرمانی خوا ڕەفتار دەكەن، ئەژنەوا بونی خەڵكیش بۆیان ئەژنەوا بونە بۆ خوا:** ﴿مَنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ﴾ النساء/٨٠. **هیچ بەندەیەكیش خۆشنودو خۆشەویستی خوا وەدەست ناهێنێ ئەگەر ئەو فەرمانبەریەی نەبێ:** ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ: **پێیان بڵێ ئەگەر خواتان خۆش دەوێ شوێنی من بكەون تا خواش ئێوەی خۆش بوێ**﴾ آل عمران/٣١. **لەبەر ئەوەیە كە دروشمی هەمیشەیی موسڵمانان ئەژنەوا بونە:** ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَنْ يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا: **بەڵكو وتەی بڕواداران هەرئەوە بوە كە ئەگەر بۆ دادوەری خواو پێغەمبەر بانگ بكرێن بلێن: ژنەواو ئەژنەواین**﴾ النور/٥١.

# بەندی چوارەم

# سـروش

## پێغەمبەرایەتی بەخششێکی خواییە:[41]

پێغەمبەرایەتی بەخششێکی خوایەو خوا بەخۆی لە کێ رابپەرموێ بەوی دەبەخشێ، کەس بە خۆزگەو تامەزرۆ نابێتە پێغەمبەر، پێغەمبەرایەتی بە کردو کۆش و ماندوبون و رەنجبەخشین نایەتە دی، فەلسەفەزانەکان راست ناکەن کە دەڵێـن بـەهۆی رەنـج و تێکۆشـان و ئـەنجامدانی چـەندین جـۆرە پەرسـتن و چەندەها فەرمانبەری ئەستەم و مشتومالکردنی ناخ و پـاکژۆنگکردنی خـەیالات و پاککردنەوەی خوڕەوشـت و وەرزشـی نـاخ و جەسـتەییەوە پێغەمبەرایـەتی وەدەسـت دێـت.[42] خـوا لـە چـەندین ئایـەتدا فەرمویـەتی پێغەمبەرایـەتی بەخششێکی پەروەدگارە: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ مِنْ ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِنْ ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا﴾ مـريم/٥٨، هەروەها

---

٤١ موعتەزیلەکان پێیان وایە ناردنی پەیام و پەیامبەران لەسەر خـوا واجبـە، بـەڵام راسـتی ئەوەیـە کـە بەخششێکی خوایە و بە میهری خۆی بە بەندەکانی دەبەخشێ. ئەگەر بشلێین واجبە مەبەسـتمان لـەوەیـە کە خۆی لەسەر خۆی بە واجبی داناوە (تەماشای لوامع الأنوار البهية ٢/٢٥٦، ٢٥٨) بکە.

٤٢ لوامع الأنوار البهية (٢/٢٦٧).

پێغەمبەر یەعقوب بە یوسفی کوڕی گوت: ﴿وَكَذَلِكَ يَجْتَبِيكَ رَبُّكَ: بەم جۆرە خوای پەروەردگار هەڵتدەبژێریٚو دەتکات بە پێغەمبەر﴾ یوسف/٦. خوا بە پێغەمبەر موسای فەرموە: ﴿إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالاَتِي وَبِكَلامِي﴾ الأعراف/١٤٤. ئومەییەی کوڕی صەڵت زۆر پەرۆش بو ببێتە پێغەمبەری ئەم نەتەوەیە، زۆر شیعری دەگوت و لەخوا دەپاڕایەوە تا ببێتە پێغەمبەر، بەڵام مرازی بەدی نەهات، خوا راستی فەرموە: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ: خوا خۆی زاناترە پەیام بەکێدا دەنێریٚ﴾ الأنعام/١٢٤.

هەربۆیەش کە کەسانێك وایان پێشنیار کرد یەك لەم دو پیاوە مەزنەی مەککەو تائیف ببنە پێغەمبەر کە وەلیدی کوڕی موغەیرەو عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بون، خوا سەرزەنشتی پێشنیازەکەی کردو رایگەیاند ئەو خوایەی کە بژێوی خەڵك دەدات هەر ئەویشە پێغەمبەرایەتی دیار دەکات و ئەوان بۆیان نیە قسە لە بەخشینی بەخششی خوا بکەن: ﴿وَقَالُوا لَوْلاَ نُزِّلَ هَذَا الْقُرْآنُ عَلَى رَجُلٍ مِنْ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ، أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا: دەیانگوت ئەگەر قورئان دابەزیٚ دەبیٚ بۆیەك لەم دو پیاوە مەزنەی ئەم دو گوندە دابەزیبا، ئایە ئەوان میهری خوا دەبەشنەوە؟! ئێمە ژیان و گوزەران و بژێوی ئەوانمان دابەش کردوە﴾ الزخرف/٣١-٣٢، کەواتە وەك چۆن بژێوی بەشینەوە مافی خوایە هەڵبژاردنی پێغەمبەریش مافی خوایە.

لەم بەندەی دادیٚ ئەو رێگایە رون دەکەینەوە کە هەڵبژاردراوەکانی خوای پیٚ دەبێتە پێغەمبەر.

## ئەو ڕێگەیەی خوا پێغەمبەرانی پێ کردۆتە پێغەمبەر:

خوا بەم ڕێگەیە دەڵێ سروش: ﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا: ئێمە سروشمان بۆ ناردوی وەك چۆن سروشمان بۆ نوح و پێغەمبەرانی پاشتر ناردوە، وەك چۆن سروشمان بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و ئەسباط و عیساو ئەییوب و یونس و هارون و سلێمان ناردوە، زەبوریشمان داوەتە پێغەمبەر داود﴾ النساء/١٦٣.

**سروش**: پێڕاگەیاندنێکی نهێنیو خێرایە، جا بەهەر هۆکارێك بێت[٤٢]، ڕەنگە بە ئیلهام بێت وەکو خوا بۆ حەواریەکانی پێغەمبەر عیسای کرد: ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُوا بِي وَبِرَسُولِي: کە سروشم بۆ حەواریەکان نارد بڕوا بە من و بە پێغەمبەرەکەم بێنن ﴾ المائدة/١١١. یان وەکو ئەو سروشەی کە خوا بۆ دایکی موسای کرد: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ: سروشمان بۆ دایکی موسا کرد شیری بداتێ﴾ القصص/٧. هەروەها بە واتای ئاماژەش دێت، قورئان ئاماژەکەی زەکەریا کە بۆ گەلەکەی کردویەتی بە سروشی ناو بردوە: ﴿فَخَرَجَ عَلَى قَوْمِهِ مِنْ

٤٣ بگەڕێوە بۆ (فتح الباری ٩/١)، المصباح المنیر ٦٥١،٦٥٢.

الْمِحْرَابِ فَأَوْحَى إِلَيْهِمْ أَنْ سَبِّحُوا بُكْرَةً وَعَشِيًّا: لە نوێژگەکەی هاتە دەرەوە و بە ئاماژە بە هۆزەکەی گوت نوێژی بەیانیان و عەسران بکەن ﴾ مریم/١١.

بەڵام لەزۆربەی ئەو شوێنانەی قورئان وشەی سروشی بەکارهێناوە مەبەستی ئەوەیە کە خوا هەمو ئەو زانیاری‌و رێنوێنیانەی ویستویەتی کەسانێکی هەڵبژاردەی لێ واگا بکات، بەرێگەیەکی پەنهانی وا پێی راگەیاندوە کە لەنێو مرۆڤاندا باو نەبوە.

## پایەکانی سروش :

خوا پایەکانی سروش رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَنْ يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّهُ عَلِيٌّ حَكِيمٌ: خوا یان بە سروش یان لە پشت پەردەوە قسە لەگەڵ مرۆڤدا دەکات یانیش پەیامبەرێك دەنێرێ بە ودمی خوا سروشی خوا رابگەیەنێ، خوا بەرزو لێزانە﴾ الشوری/٥١.

**کەواتە سروش سێ پایەی هەیە:**

<u>یەکەم</u>: سروشەکەی دەخرا دڵی بە جۆرێك پێغەمبەر ﷺ گومانی لەوە نەدەبو خوا ئەم شتەی خستۆتە دڵ، لە صەحیحی ئیبنوحیببان هاتوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ان روح القدس نفث في روعي ان نفساً لن تموت حتى تستكمل رزقها وأجلها فاتقوا الله وأجملوا في الطلب: گیانی پیرۆز (جبریل) ئەوەی خستە دڵم کە هیچ کەسێك تا بژێوی و ئەجەلی خۆی تەواو نەکات نامرێ، کەواتە لە

خوا بترسن و به پوختی بپارێنەوە)) [٤٤]، (ئیبن جوزی) وای بۆ دەچێت مەبەست لە سروش لە ئایەتی (إلاّ وحیا) سروش لە خەودا بێ.[٤٥]

## خەونی پێغەمبەران:

هەڵبەت خەونی پێغەمبەران دەچێتە خانەی سروشەوە، چونکە خەونی پێغەمبەران راست و تەواوەو ناڕاستی تێدا نیە، هەر لەبەر ئەوەبو کە پێغەمبەر ئیبراهیم ﵇ کاتێك لە خەودا دیتی ئیسماعیلی کوڕی سەردەبڕێ، کە واگا هات ویستی سەری ببڕێو خەونەکەی بە فەرمانێکی خوایی هەژمارکرد، خوا لەبارەیەوە دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَابُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى قَالَ يَاأَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ۞ فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ۞ وَنَادَيْنَاهُ أَنْ يَاإِبْرَاهِيمُ۞ قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ: کە ئیسماعیل هەراش بو ئیبراهیمی باوکی پێی گوت: کوڕی خۆم! لە خەودا دیتومە دەتکوژمەوە، تۆش رامێنە بزانم چی دەڵێی؟ گوتی بابەگیان چت فەرمان پێکراوە بیکە، بەیاریدەی خوا ئارام دەگرم، کە ئەژنەوابون و ناوچەوانی بەزەوی وەنا، بانگمان کردیێو گوتمان؛ ئیبراهیم! خەونەکەت بەجێ هێنا. ئێمە بەم جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە﴾ الصافات/١٠٢-١٠٥. بوخاریێو موسلیم دەگێڕنەوە؛ کە خاتو عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: یەکەمین سروشی پێغەمبەرﷺ خەونی چاکی خەوێ بو، پێغەمبەر ﷺ خەونێکی بدیبا وەکو گزنگی بەیانی دەهاتە دی.[٤٦]

---

٤٤ تەماشای تەفسیری ابن الكثير (٦/٢١٥) ئایەتی ٥١ ی سورەتی شوری بکە.

٤٥ زاد المسير (٧/٢٩٧).

٤٦ جامع الأصول ١٢/٣٧.

**پایەی دووەم:** قسە لەگەڵدا کردنی خوا لە پشت پەردەوە، وەکو ئەو سروشەی خوا کە لەگەڵ موسادا قسەی کردوەو لە چەندین جێگەدا باسی فەرموە: ﴿وَلَمَّا جَاءَ مُوسَى لِمِيقَاتِنَا وَكَلَّمَهُ رَبُّهُ: کە موسا بۆ وادەگای ئێمە هات و خوا قسەی لەگەڵدا کرد﴾ الأعراف/١٤٣، ﴿فَلَمَّا أَتَاهَا نُودِيَ يَامُوسَى۝ إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِي الْمُقَدَّسِ طُوًى۝ وَأَنَا اخْتَرْتُكَ فَاسْتَمِعْ لِمَا يُوحَى۝ إِنَّنِي أَنَا اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدْنِي وَأَقِمْ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي: کە هاتە وێ بانگی‌کرد؛ ئەی موسا! من پەروەردگارتم، کەوشەکانت داکەنە، تۆ لە دۆڵی طوای پیرۆزی من تۆم بە پێغەمبەر هەڵبژاردوە، گوێ بگرە بۆ ئەو سروشەی بۆت دەنێرم؛ من (اللە)مەو جگە لە من خواوەندی تر نیە، تەنها من بپەرستە﴾ طه/١١-١٤. هەروەها خوا کە قسەی لەگەڵ ئادەم کردوە: ﴿قَالَ يَاآدَمُ أَنبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ: فەرموی؛ ئەی ئادەم ناوەکانیان پێ بڵێ﴾ البقرة/٣٣، هەروەها قسەی لەگەڵ پێغەمبەرمان کردوە کە بۆ ئاسمان بەرزی کردۆتەوە.

**پایەی سێیەم:** سروش بەهۆی فریشتە، خوا کە دەفەرموێ: ﴿أَوْ يُرْسِلَ رَسُولاً فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ﴾ الشورى/٥١، مەبەستی لە پایەی سێیەم دێت کە ئەم فریشتە رەوانە کراوەش جبریلە ﷺ یاخود لە چەند حاڵەتێکی کەمدا فریشتەیەکی دیکەیە.[٤٧]

---

٤٧ بگەڕێوە بۆ پەرتوکی (جیهانی فریشتان/٤٠).

## چۆنیەتی هاتنی فریشتە:

دوای وردبونەوە و توێژینەوەی ئەم بابەتە فریشتە بە سێ چۆنیەتی دابەزیوە[٤٨]:

<u>یەکەم</u>: وەك چۆن خوا ئەفراندویەتی ئاوەها دەهات و پێغەمبەر ﷺ دەیدیت، پێغەمبەرمان ﷺ تەنها دوجاری بەم جۆرە بینیوە.

<u>دوەم</u>: سروشەکەی لەشێوەی زرینگەی زەنگ بۆ دەهات و پاشان دەڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ تێی دەگەیشت چی وتوە.

<u>سێیەم</u>: جبریلی فریشتە لەشێوەی پیاوێك دەهات و لەگەڵ پێغەمبەر دەدواو پێغەمبەر ﷺ لێی تیٚدەگەیشت و دەهاتە بەری، ئەم جۆرەیان ساناترین جۆر بوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، لە دیداری یەکەمدا لە ئەشکەوتی حیرا، جبریل بەم جۆرە هات.

## موژدەی هاتنی سروش:

پێغەمبەر ﷺ بەر لەوەی جبریلی فریشتە ببینێ، دەنگێکی دەبیست و روناکیەکی دەدیت، بەڵام فریشتەکەی نەدەدیت کە روناکیەکەی دەدا، هەروەها بێژەرەکەشی نەدەدیت، موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەڵێ: ئیبنوعەبباس دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پازدە ساڵان لە مەککە بوە، حەفت ساڵان دەنگی دەبیست و روناکی دەدیت، بەڵام هیچی نەدەدیت، هەشت ساڵیش سروشی بۆ دادەبەزی، دە ساڵانیش لە مەدینەدا بوە.[٤٩] نەوەوی(بەرمیهری خوا بێ) دەڵێ: (قازی) لەبارەی

---

٤٨ بگەڕێوە بۆ پەرتوکی جیهانی فریشتان–د.عومەر سلێمان ئەشقەر.

٤٩ تەماشای راڤەی نەوەوی بۆ صەحیحی موسلیم (١٠٤/١٥) بکە، ئەو ماوەیەی ئیبنو عەبباس لە مەککەدا دیاری کردوە پێچەوانەیە لەگەڵ وتەی باودا، پێغەمبەرﷺ لەتەمەنی چل ساڵیدا سروشی بۆ دابەزیوە، لە پەنجاوسێ ساڵیدا کۆچی کردوە، کەواتە ماوەکە سێزدە ساڵ بوە نەك پازدە.

(دەنگی دەبیست) دەڵێ: مەبەستی لە وتەی فریشتان دێت، روناکیەکەش روناکی فریشتەو روناکی ئایەتەکان بوە، سروش بەم جۆرە بوە تا پێغەمبەرﷺ بە چاوانی خۆی فریشتەی دیتوە و قسەی بۆ کردوە.[50]

## کاریگەری فریشتەی سروشەوان لەسەر پێغەمبەر ﷺ:

ئەوانەی بروایان بە پێغەمبەران نیە درۆودەلەسە بڵاو دەکەنەوەو دەڵێن ئەوەی بەسەر پێغەمبەر ﷺ هاتوە جۆرێك بوە لە جۆرەکانی پەرکەم یان دەڵێن تێفروسمانێکی شەیتانی بوە، بێگومان درۆیەکی زەق و زەندیقانەیە بە پێغەمبەریان هەڵبەستوە، ئەو دوحاڵەتە تەواو تەواو لە یەك جودان، چونکە ئەو کەسەی پەرکەم دەگرێ رەنگی زەرد هەڵدەگەرێ و کێشی سوك دەبێ و هاوسەنگی نامێنێ، ئەوەی شەیتانیش کاری تیّدەکات هەر بەم جۆرەیە، رەنگە شەیتان قسەی لەسەر زاریدا بکات و لەگەڵ خەڵکیش بدوێ، بەڵام هەر کە هۆشی دێتەوە بەرێ متەقی لەبیر نەماوە لەوەی کە شەیتان چی لەسەر زاریدا گوتوە، بەڵام کاتێك پێغەمبەر ﷺ سروشی بۆ دەهات گەشەی دەخستە جەستەی و روی گەش دەبوەوەو ئامادەبوانیش هیچ وتەیەکیان نەدەبیست، تەنها دەنگێکی وەکو گیزەگیزی هەنگیان گوێ لێ دەبو کە لە لای سەریەوە دەنگەکە دەهات[51]، پاشان پێغەمبەر ﷺ هەڵدەستاوەو هەرچی فریشتە پێی راگەیاندبو هاتبوە بەری، پاشان ئەو بە یاوەرانی رادەگەیاند کە چی پیّوتراوە، خاتو عائیشە (رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: رۆژی سەرماو سۆڵی وا هەبوە پێغەمبەر ﷺ سروشی بۆ دابەزیوە، پاشان کە بەری داوە چۆراوگەی ئارەقە تنۆك تنۆك بە لاجانگیدا دەهاتە خوارەوە.[52] هەروەها دەڵێ: جار بوە پێغەمبەر ﷺ لەسەر

---

٥٠ راڤەی نەوەوی بۆ صەحیحی موسلیم (١٥/١٠٤).

٥١ ترمذی گێرایتیەوە (جامع الأصول ١٢/٤١).

٥٢ صحیح البخاری، کتاب بدء الوحي (فتح الباری ١/١٨).

وشترەكەی بوەو سروش دابەزیوە، ئاوزینگی  لە وشترەكەی دەدا چونكە لەبەر قورسایی خەریك دەبو یخ ببیٚ[٥٣]، یەك لە یاوەران دەگیٚڕیٚتەوەو دەلٚیٚ: جاریٚك رانم لەژیٚر رانی پیٚغەمبەر ﷺ بوەو سروش دابەزی خەریكبو رانم ورد ببیٚ.[٥٤] یەعلای كوڕی ئومەییە جاریٚكیان پیٚغەمبەرﷺی دیت سروشی بۆ دادەبەزی –پیٚشتر خۆزگەی دەخواست پیٚغەمبەر ﷺ لەم حالەتەدا ببینیٚ– دەلٚیٚ چومە ژورەوە دیتم روی سور هەلٚگەڕاوە، بۆ ماوەیەك بەم حالٚەتەوە بو تا بەری دا.[٥٥]

---

٥٣ بەیهەقی لە (دلائل عن عائشة)دا ئاماژەی بۆ كردوە (فتح الباری ١/٢١).

٥٤ بەیهەقی لە (الدلائل عن عائشة)دا ئاماژەی بۆ كردوە (فتح الباری ١/٢١).

٥٥ لە بوخاریو هی تردایە، كتاب فضائل القرآن (فتح الباری ٩/٩).

# بەندی پێنجەم

# سیفاتی پێغەمبەران

## مرۆڤێتی:

خوای زاناو کاربەجێ بە دانایی خۆی ویستی وابو ئەو پێغەمبەرانەی بۆ مرۆڤانی دەنێرێ مرۆڤ بن: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ: ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ منیش ئێوە ئاسا مرۆڤم﴾ الكهف/١١٠.

## شایستەیی مرۆڤ بۆ هەڵگرتنی پەیامی خوا:

ئەوانەی پێیان ئەستەم و ناشایستەیە خوا مرۆڤ بۆ هەڵگرتنی راسپاردەی مەزن هەڵبژێرێ، نرخی مرۆڤ نازانن و نایناسن، مەبەستمان لەو راسپاردەیە ئەوەیە کە ئەرزو ئاسمان و شاخەکان باکیان بو هەڵیگرن: ﴿إِنَّا عَرَضْنَا الأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الإِنسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُومًا جَهُولاً: ئێمە راسپاردەی ئەرکبایمان بۆ ئاسمانەکان و زەوی و چیاکان رانواند، کەچی هەڵیان نەگرت و باکیان کرد، بەڵام مرۆڤ هەڵی گرت، مرۆڤ ستەم لە خۆکردەو نافامیدەیە﴾ الأحزاب/٧٢.

ئەوانەی پێیان ناشایستەیە مرۆڤ ببێتە هەڵگری پەیامی خوا، مرۆڤیان تەنها لە رووی دەرەوەو رواڵەتەوە ناسیوە، پێیان وایە مرۆڤ هەر بریتیە لە جەستەیەك و دەخواو دەخواتەوەو دەخەوێو بەزەویدا دەگەڕێ تا بژێوی پەیدا بكات: ﴿وَقَالُوا مَالِهَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ: گوتیان ئەم پێغەمبەرە چیە، خواردن دەخواو لە بازاردا دەگەڕێ بۆ بژێوی خۆی﴾ الفرقان/٧، تەماشای چیەتی مرۆڤیان نەكردوە كە بریتیە لەو گیانەی كە خوا لە گیانی خۆی فوی كردوە: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: فریشتەكان! ئەگەر ئادەمم دروست كرد و لە گیانی خۆمدا فوم پێدا كرد، سوژدەی بۆ ببەن﴾ الحجر/٢٩، مرۆڤ بەسای ئەم گیانەوە تایبەتمەندێتی وەرگرتوەو بۆتە مرۆڤ، خوا بەهۆی ئەم فوە پیرۆزەوە ئامادەیی پێداوە بتوانێ پەیوەندی بە خوا بكات، جێی سەیرمان نیە گەر خوا یەكێك لەو رەگەزە بەرێزە-كە ئامادەو سازە-بۆ هەڵگرتنی پەیامەكەی هەڵبژێرێ، سروشی بۆ بنێرێو براكانی بێنێتەوە سەر راستەڕێی سەرفرازی، هەر كاتێك مرۆڤ ئاتاجی یارمەتی هەبێ، خوا بەسای وی یاریدەیان بدات[56]: ﴿قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِنْ نَحْنُ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُكُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَمُنُّ عَلَى مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ: پەیامبەران پێیان گوتن: ئێمەش ئێوە ئاسا مرۆڤین، بەڵام خوا كێی مەبەست بێ میهرەبانی لەگەڵدا دەنوێنێ﴾ إبراهيم/١١.

پێغەمبەران ئامادەییەكی تایبەتی و ناوازەیان پێ دەدرێ و بە دانسقەیی سازش دەكرێن تا بتوانن ئەركی پێغەمبەرایەتی هەڵگرن: ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي: تۆم بۆ خۆم هەڵبژاردوە ببی بە پێغەمبەر﴾ طـه/٤١. ئامۆژ لە ژین و ژیواری

---

٥٦ في ظلال القرآن (٢٠٥٢/١٩).

پێغەمبەر موحەممەدمان ﷺ وەرگرە کە خوا چۆن چۆنی دیدەوانی کردوە، خۆ هێتیم و هەژاریش بوە: ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى۞ وَوَجَدَكَ ضَالاً فَهَدَى۞ وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى: ئەدی تۆ هێتیم نەبوی خوا جێو رێی بۆ فەراهەم هێنای؟ ئەدی تۆ گومڕا نەبوی رێنوێنی کردی؟ ئەدی تۆ هەژار نەبوی دەوڵەمەندی کردی؟﴾ الضحى/٦-٨، هەر لە بچوکیەوە خوا خاوێنی کردەوەو بەشی شەیتانی لە لەش دەرهێنا. ئەنەس (رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منداڵان گەمەی دەکرد، جوبریل دێت و لە هەردی دەداو سینگی شەق دەکات و دڵی دەردێنێ، پارچەیەکی وەك زەروی لێ دەردێنێ و دەڵێ: ئەمە بەشی شەیتان بو، پاشان لە تەشتێکی زێڕدا بە ئاوی زەمزەم دڵی دەشواتەوە، ئەنجا سینگی قەپات دەکاتەوە، منداڵەکانیش بە غاردان دەچنە لای دایکی واتە دایەنەکەی[٥٧] و دەڵێن؛ موحەممەدیان کوشت، ئەوانیش بەشڵەژاویەوە بەهانای دەچن دەبینن رەنگی هەڵبزڕکاوە، ئەنەس دەیگوت زۆرجاران شوێنی ئەم شەقکردنەم لە سینگی پێغەمبەر ﷺ بینیوە کە وەك خەت وابو و شوێنی تەقەڵەکان لەسەر سینگی رێچکەیان بەستبو[٥٨].(موسلیم گێڕاویەتیەوە)

دیسان کە بۆ ئاسمانیش بەرز کراوە، جبریل هات بۆ ئەم گەشتە ئامادەی بکات و شتێکی لەم بابەتە رویدا، لە فەرمودەی شەوڕەویدا هاتوە کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((لەمەککەدا بوم بنمیچی خانوەکەم یەکالا بو، جبریل دابەزیو سینگی شەق کردم، بەئاوی زمزم شوشتی، پاشان تەشتێکی پڕ لە

---

٥٧ کە حەلیمەی کچی سەعدیە بو.

٥٨ مشكاة المصابيح (١٥٢/٣).

بڕواو دانایی هێناو هەموی روکردە ناوسینەم، پاشان سنگی داخستمەوە)) متفق علیه.[59]

## بۆچی پێغەمبەران فریشتە نەبون؟

دوژمـن و نـەیارانی پەیامبـەران هـەر لـە کۆنـەوە رەخنـەیان لــە مرۆڤبونــی پێغەمبەران گرتوەو ئەم کێشەیە یەکێك بوە لـەو هۆیە سەرەکیانەی کە خـەڵکی پێ سەنگرایتەوە: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى إِلاَّ أَنْ قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَسُولاً: هـەر کاتێك رێنوێنیان بۆ هاتبا لەبەر ئەوە بڕوایان نەدەهێنا کـە دەیانگوت: خوا چۆن مرۆڤ دەکاتە پەیامبەر؟!﴾ الإسراء/٩٤.

ئـەم بێبڕوایانــە شــوێنکەوتن و یــەیڕەو کردنــی ڕێوشــوێن و بیروبــاوەڕی پێغەمبـەرانیان بە گـەمژەیی و دۆڕاوی هـەژمار کردوە، گوایـە مـرۆڤ نـابێ ئـەم ڕێزەی لێ بنرێ: ﴿وَلَئِنْ أَطَعْتُمْ بَشَرًا مِثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَخَاسِرُونَ: بێبڕواکـان گوتیـان: ئەگەر فەرمانبەری بۆ مرۆڤێکی وەکو خۆتان بکەن، بێسۆ دەدۆڕێن﴾ المؤمنون/٣٤، ﴿فَقَالُوا أَبَشَرًا مِنَّا وَاحِدًا نَتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَفِي ضَلاَلٍ وَسُعُرٍ: گوتیـان: وەدوای تاکـە مرۆڤێکی وەکو خۆمان بکەوین؟ ئەگەر وابێ لەگومڕایی و ئاگرداین﴾ القمـر/٢٤، دوژمـن و ناحـەزانی پێغەمبـەران پێشـنیاریان کـردوە پێغەمبـەران فریشـتە بـن و بیـانبینن، یـان بەلایـەنی کەمـەوە لەگـەڵ پێغەمبەرەکـەدا پێغەمبـەرێکی فریشـتە هەبوایـە: ﴿وَقَالَ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءَنَا لَوْلاَ أُنْزِلَ عَلَيْنَا الْمَلاَئِكَةُ أَوْ نَرَى رَبَّنَا: ئـەو بێبڕوایانەی تەمای دیداری ئێمـەیان نیـە دەیـانگوت با فریشـتەمان بۆ دابـەزیبا

---

٥٩ صحيح الجامع الصغير (٤/٨١).

یان خوامان بدیبا﴾ الفرقان/٢١، ﴿وَقالوا مَالِهَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَعَامَ وَيَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ لَوْلا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا: گوتیان ئەو پێغەمبەرە چۆنە؟ خواردن دەخواو هاموشۆی بازاڕان دەكات، ئەگەر راستە با فریشتەی لەگەڵدا دابەزیێو ئەویش لە هەرەشەگاریدا یاوەری بێ﴾ الفرقان/٧. كە لە ئایەتەكان ورد دەبینەوە دەتوانین لە چەند روێكەوە بەرپەرچی ئەو پێشنیازە نابەجێیە بدەینەوە:

یەكەم: خوا بۆیە مرۆڤی كردۆتە پێغەمبەر و فریشتەی نەكردۆتە پێغەمبەر چونكە ئەزمون و گرفتاری مرۆڤ گەورەترە، لە فەرمودەیەكی قودسیدا كە موسلیم گێڕایتیەوە هاتوەو دەڵێ: ((إنما بعثتك لأبتليك وأبتلي بـــك: من تۆم كردۆتە پێغەمبەر تا تاقیت بكەمەوە، خەڵكیشت پێ تاقی بكەمەوە))[٦٠].

دووەم: رێزو بەخششێكە خوا بە پێغەمبەرەكانی دەبەخشێ: ﴿أُوْلَئِكَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ مِنْ ذُرِّيَّةِ آدَمَ وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِنْ ذُرِّيَّةِ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْرَائِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَاجْتَبَيْنَا: ئەو پێغەمبەرانەی لە ئایەتەكانی پێشتر باسكران ئەوانە خوا بەخششی لەگەڵدا كردون، لەو پێغەمبەرانەی لەنەوەی ئادەم و ئەوانەی لە كەشتی نوح هەڵمانگرتن، هەروەها لەنەوەی ئیبراهیم و ئیسرائیل، ئەوانەش كە رێنوێنمان كردن و كردمانن بە پێغەمبەر﴾ مريم/٥٨.

سێیەم: مرۆڤ لە سەركردایەتی و ئاراستەكردندا كارامەترو بەتواناترە، بۆیە ئەوان دەبنە پێشەنگ و سەرمەشقی خەڵك، سەید قوتب-بەهەشتی بێ-دەڵێ: هەڵبەت هەناردنی مرۆڤێك كە هەست بە هەستەكانی مرۆڤ بكات و چێژەكانیان

---

٦٠ مختصر صحيح مسلم للمنذري/ل ٢٨٣.

چێژ بکات و ئەزمونەکانیان هەرس بکات و ژان و ژوارو خۆزگەو هیواو ئاتاج و ئەرکیان بزانێ، ئینجا رەچاوی زەبونیو کەمایەسیان بکات، بڕوای بەهێزو توانیان هەبێ هەنگاو هەنگاو هەنگاویان پێ هەڵگرێو لە ئەنگێزەو کارتێکران و وەلامدانەوەیان بگات و ئەندازەی وزەیان بزانێ، ئەگەر یەکێك وابێ دەتوانێ بەسای سروش و هاریکاری خوا رێی خوایان پێ بگرێ، ئەگەر چی هەردیش هەردی و ناهەموار بێ.

خەڵکیش بەشبەحاڵی خۆیان توانستێکی کارامەیان لێ دەبینن، چونکە ئەویش وەکو ئەوان مرۆڤە، پەیتا پەیتا بەرزیان دەکاتەوەو بەو رەوشت و ئاکارو کردەوەو ئەرکانەوە لەناویاندا دەژێ کە خوا لە سەر ئەوانی فەرز کردوەو داوایان لێکراوە، دەبێتە تەرجەمەیەکی زندوی ئەو بیروباوەڕەی هەڵیگرتوە، ژیان و کردوەو هەڵس و کەوتەکانی ئەویان بۆ دەبێتە روپەڕێکی کراوە، دێڕ دێڕ وەری دەگرن و واتا بە واتای وەدی دێنن، چونکە دەبینن وا لەنێوانیاندایە بۆیە هان دەدرێن لاسای بکەنەوە، چونکە نێردراوەکەیان مرۆڤە.[٦١]

<u>چوارەم</u>: ئەستەمێتی دیتنی فریشتە؛ بێبڕواکان کە پێشنیازی بینینی فریشتە دەکەن و دەڵێن با پێغەمبەران لە فریشتە بن، لەبەر ئەوەیە لە سروشتی فریشتە نەفامیون، ناشزانن ئەگەر وابێ توشی چتۆ ئەستەم و دەردەسەری دەبن.

بینینی فریشتەو پەیوەندی پێکردنیان کارێکی وا ئاسان نیە، پێغەمبەرمانﷺ لەگەڵ ئەوەی چاترینی خەڵکەو هێزێکی زۆری جەستەییو دەرونیشی هەبو، ئەنجا کاتێك جبریلی لەسەر شێوە راستەقینەکەی خۆی بینی دڵی راچەنی و تاسا، هەروەها کەسروشی بۆ دادەبەزی ئازارێکی زۆری

---

٦١ في ظلال القرآن (٢٥٥٣/١٩).

دەچەشت، لەبەر ئەوەیە خوا بەو جۆرە وەڵامی بێبڕوایان دەداتەوە و دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يَرَوْنَ الْمَلَائِكَةَ لَا بُشْرَى يَوْمَئِذٍ لِلْمُجْرِمِينَ: ئەو ڕۆژەی تاوانکارانی بێبڕوا فریشتە دەبینن هەرگیز موژدەی تێدا نابینن ﴾ الفرقان/٢٢، ئەمەش چونکە بێبڕواکان تەنها لەسەرەمەرگ و لەکاتی دابەزینی سزادا فریشتە دەبینن، جا ئەگەر ڕۆژێك فریشتە ببینن ڕۆژی لێقەومان و فەوتانیانە.

ئەوپەڕی پێویستی بوە کە پێغەمبەران مرۆڤ بون، بۆئەوەی خەڵکان بتوانن لەگەڵیان بدوێن و لێیان تێبگەن، خۆ ئەگەر خوا فریشتەی ناردبا ئەم کارە نەدەهاتە دی: ﴿وَمَا مَنَعَ النَّاسَ أَنْ يُؤْمِنُوا إِذْ جَاءَهُمُ الْهُدَى إِلَّا أَنْ قَالُوا أَبَعَثَ اللَّهُ بَشَرًا رَسُولًا، قُلْ لَوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَسُولًا: هەر کاتێك ڕێنوێنیان بۆ هاتبا لەبەر ئەوە بڕوایان نەدەهێنا دەیانگوت خوا چۆن مرۆڤ دەکاتە پێغەمبەر؟ پێیان بڵێ ئەگەر لەسەر زەویدا فریشتە مرۆڤ ئاسا بە ئارامیو بەسەقامی بڕۆیشتبان ئەوا فریشتەی پەیامبەرمان لە ئاسماندا بۆ دەناردن ﴾ الإسراء/٩٤-٩٥، ئەگەر دانیشتوانی سەر زەمین فریشتە بونایە هەقی خۆیان بو پێغەمبەرەکانیان فریشتە با، بەڵام کە مرۆڤن لە میهرەبانی خواوەیە پێغەمبەرانیان مرۆڤە: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِنْ أَنْفُسِهِمْ: خوا بەخشش و میهری لەگەڵ بڕواداران کردوە کە پێغەمبەرێکی لە خۆیانەوە بۆ ناردون ﴾ آل عمران/١٦٤

جا ئەگەر مرۆڤ نەتوانێ وا بەئاسانی فریشتە ببینێو ئامۆژیان لێ وەرگرێ ئەوا -ئەگەر خوا بیویستبا پێغەمبەری فریشتە بنێرێ- دەبوایە لە شێوەی پیاوێکی هەناردبا: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَاهُ مَلَكًا لَجَعَلْنَاهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِمْ مَا يَلْبِسُونَ: ئەگەر

خوا پێغەمبەرێکی فریشتەی بۆ ناردبان ئەوا لەشێوەی پیاوێك دەبو، تا بتوانن لەگەڵیدا بدوێن و بەهرەی لێ وەرگرن، ئەگەر واش بێ ئەوا لەگەڵ مرۆڤەکانیتر تێکەڵ دەبو﴾ الأنعام/٩[62]، بۆیە لێیان تێکەڵ دەبو چونکە لەشێوەی پیاو بو، ناشتوانن فریشتایەتیەکەی لێ وەدەست بێنن، جا ئەگەر وابێ ئەوا ناردنی فریشتە هیچ هودەیەکی نابێ، بەڵکو مەبەستی خوازراویش وەدی ناهێنێ، چونکە پێغەمبەری فریشتە ناتوانێ هەست بە هەستەکانی مرۆڤ و ئەنگێزەو داخوازیەکانی بکات.

## داخوازیەکانی مرۆڤێتی پێغەمبەران:

داخوازی (مقتضی) مرۆڤێتی پێغەمبەران ئەوەیە کە ئەو سیفەتانەی مرۆڤ هەیەتی هەیانبێ، یەك لە داخوازیە مرۆڤانەییەکان ئەوەبوە کە مرۆڤ ئاسا قسەیان کروە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ، وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا لاَ يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ: بەر لەتۆ هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ پیاو بوە و سروشمان بۆ ناردوە، ئەگەر نازانن لە نامەوەرە خاوەن زانیاریەکان بپرسن، جەستەی پێغەمبەرانمان وا فەراهەم نەهێناوە نان نەخۆن، کەسیشیان نەمر نەبون ﴾ الأنبیاء/٧-٨.

پێغەمبەران وەك مرۆڤ بونەو داك و باب و خاڵ و خاڵۆژن و مام و مامۆژنیان هەبوە، ژنیان هێناوەو منداڵیان بوە: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِنْ قَبْلِكَ

٦٢ تەفسیری ئیبنو کەثیر (٩/٣).

وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجًا وَذُرِّيَّةً: بەر لەتۆ پێغەمبەرانمان ناردوە ژن و منداڵ و نەوەمان بۆ فەراهەم هێناوە﴾ الرعد/٣٨.

وەکو مرۆڤ نوستن و لەش ساغیو نەخۆشیان هەبوەو مردونە، پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ روی وتەکانی بۆ خوایەو فەرمویەتی: ﴿وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ، وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ، وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ: ئەو خوایەی نان و ئاوم دەداتێ، ئەگەر نەخۆش بکەوم چاکم دەکاتەوە، ئەو خوایەی دەممرێنێو پاشان زندوم دەکاتەوە﴾ الشعراء/٧٩-٨١. خواش بە موحەممەدی بەندەو پێغەمبەری فەرموە: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ: تۆ مردوی و ئەوانیش مردون﴾ الزمر/٣٠، خوا رایگەیاندوە کە مردنی پێغەمبەران فەرمانێك بوە هەمو پێغەمبەرانی گرتۆتەوە: ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِن مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ: موحەممەد پێغەمبەرێکە و بەر لەوی چەندین پێغەمبەری دیکە هاتون جا ئەگەر بمرێ یان بکوژرێ چۆن لە بڕواو لە دین هەڵدەگەڕێنەوە؟!﴾ آل عمران/١٤٤.

یاوەران لەوەسفی پێغەمبەردا ﷺ فەرمویانە: یەکێك بوە لە مرۆڤان، خۆی شمەکی دەشوشت، خۆی مەڕەکانی دەدۆشی، خۆی خزمەتی خۆی دەکرد.[٦٣]

فەرمودەیەکی صەحیحە کە پێغەمبەر ﷺ بە دایکی سولەیمی فەرموە: ((یا أم سليم أما تعلمين أني اشترطت على ربي فقلت: إنما أنا بشر، أرضى كما يرضى البشر، وأغضب كما يغضب البشر، فإيما أحد دعوت عليه من أمتي بدعوة ليس لها بأهل، أن يجعلها طهوراً وزكاة وقربة يقربه بها منه يوم القيامة: دایکی

٦٣ أخرجه أحمد في مسنده والبخاري في الأدب المفرد، وإسناد أحمد صحيح على شرط مسلم، (تەماشای سلسلة الأحاديث الصحيحة ژمارە ٦٧١ بکە).

سولەیم! دیارە نازانی من لەگەڵ پەروەردگارم بەمەرجم گرتوەو گوتومە: خوایە منیش مرۆڤم، وەکو هەر مرۆڤێك توڕە دەبم و خۆشنود دەبم، جائەگەر توکم لەهەر یەکێکی ئەم نەتەوەیە کردو شایستە نەبو بەهۆیەوە پاکی بکاتەوەو لە ڕۆژی ژیانەوەدا لەخۆی نزیکی بکاتەوە))[٦٤].

## گرفتاربونی پێغەمبەران:

یەکێکی‌تر لە داخوازیەکانی مرۆڤانەی پێغەمبەران بریتیە لەو ناخۆشیانەی کە هەمو مرۆڤێك بەسەریدا دێت، ڕەنگە بەند بکرێن، وەك پێغەمبەر یوسف﵇ کە بۆ چەندین ساڵ بەند کراوە: ﴿قَالَ رَبِّ السِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِي إِلَيْهِ: یوسف گوتی: خوایە بەندیخانەم پێ خۆشترە وەك لەوەی بانگم بۆ دەکەن.﴾ یوسف/٣٣، ﴿فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ: چەند ساڵێك لە بەندینخانەدا مایەوە﴾ یوسف/٤٢.

پێغەمبەران ڕەنگە لەمەڕ گەلەکەیانەوە توشی ئازارو خوێن ڕژان ببن وەکو پێغەمبەری خۆمان ﷺ لەجەنگی ئوحد لەشیان بریندار کردو دانەخرەیان شکاند، ڕەنگە دەربەدەریان بکەن هەروەکو پێغەمبەر ئیبراهیم﵇ لە عێراقەوە بۆ شام کۆچی کرد، یان وەکو پێغەمبەرمان ﷺ کە لە مەککەوە بۆ مەدینە کۆچی کرد، ڕەنگە بیانکوژن: ﴿أَفَكُلَّمَا جَاءَكُمْ رَسُولٌ بِمَا لاَ تَهْوَى أَنفُسُكُمُ اسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ: هەر جارەی کە پێغەمبەرێکتان بۆ بهاتبایەو لەگەڵ ئارەزوتان

---

٦٤ رواه مسلم في صحيحه، (تەماشای سلسلة الأحاديث الصحيحة ژمارە ٨٤ بکە).

ناكۆك بوایه سەركێشیتان دەكرد، پاشان دەستەیەكتان لە پێغەمبەران بەدرۆ دەزانیو دەستەیەكتان دەكوشت ﴾ البقرة/٨٧.

رەنگە توشی نەخۆشی بن، وەكو پێغەمبەر ئەیوب، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ان نبي الله أيوب لبث به بلاؤه ثمان عشرة سنة، فرفضه القريب والبعيد إلاّ رجلين من إخوانه: پێغەمبەر ئەییوب ماوەی هەژدە ساڵان بە نەخۆشی گرفتار بو، دوكەس لە براكانی نەبێ دەنا خزم و بێگانە كەسیان قبوڵیان نەدەكرد))[٦٥].

هەروەها خوا ماڵ و منداڵە زۆر و زەبەندەكەی لێ ستاندەوە و بەهۆیانەوە تاقیكردەوە: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ، فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِن ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ: ئەییوب كە هاواری خوای كرد و گوتی خوایە توشی گرفتاری بوم، تۆش میهرەبانترین میهرەبانی، وەلامەمان داوە و گرفتاریەكەمان لەسەر هەڵگرت، بە میهری خۆمان خانەوادەكەی و چەندی تریشمان پێ بەخشی، تابێتە یادەوەری پەرستكاران و وەكو وی ئارام بگرن ﴾ الأنبياء/٨٣-٨٤. گرفتاری پێغەمبەران لەهی هەمو خەڵك سەختترو ئەستەمترە، صەعبی كوڕی سەعد(رەزای خوای لێبێ) لە باوكیەوە ئەویش لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە لێی پرسیوە: ئەی پێغەمبەری خوا گرفتاری كام خەڵك لە هەمو كەس سەختترە؟ فەرموی: ((الأنبياء ثم الأمثل فالأمثل، يبتلى الرجل على حسب دينه فإن كان دينه صلباً اشتد بلاؤه، وإن كان في دينه رقة ابتلي على حسب دينه، فما يبرح البلاء

---

٦٥ رواه أبو يعلى في مسنده وأبو نعيم في الحلية والضياء في المختارة وابن حبان في صحيحه (تەماشای سلسلة الأحاديث الصحيحة حديث رقم ١).

بالعبد حتى يتركه يمشي على الأرض ما عليه خطيئة: پێغەمبەران پاشان باشترين و باشترو باشان، پياو بەگوێرەی بڕواكەی دەئەزموێنرێ جا ئەگەر بڕواكەی بەهێزو پتەو بێ، ئەوا گرفتاريەكەی سەخت دەبێ، ئەگەر بڕواكەی ناسك و بێهێز بێ بە گوێرەی بڕواكەی دەئەزموێنرێ، گرفتاری واز لە بەندە ناهێنێ تاوای لێ دێ لەسەر زەوی دەڕوات يەك گوناح چيە نايمێنێ))[٦٦].

ئەبو سەعيدی خودری(رەزای خوای لێبێ) چوە لای پێغەمبەرﷺ كە گەرمەتايەكی توندی لێ بو، دەستی دانا سەر پێغەمبەرﷺ بينی لەسەر جلەكەشی دەستی گەرم داهات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تايە چەند گەرمە! فەرموی: ((إنا كذلك يضعف علينا البلاء ويضعف لنا الأجر: ئێمەش ئاواين گرفتاريمان سەختترو پاداشتمان زۆرترە))، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! گرفتاری كام خەڵك لە هەمو كەس سەخترە؟ فەرموی: ((الأنبياء ثم الصالحون، ان كان أحدهم ليبتلى بالفقر حتى ما يجد إلاّ العباءة التي يحويها وإن كان أحدهم ليفرح بالبلاء كما يفرح أحدكم بالرخاء: پێغەمبەران پاشان پياو چاكان، هی وا هەيە هێند هەژار دەبێ تەنها ئەو عەبايەی دەمێنێ كە خۆی پێ دادەپۆشێ هی وا هەيە ئێوە بەخۆشی چەند شادن ئەويش بە گرفتاريەكەی هێندە شادە)).[٦٧]

---

٦٦ رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، وأحمد وابن ماجه وغيرهم (سلسلة الأحاديث الصحيحة ژمارە ١٤٣).

٦٧ أخرجه ابن ماجة وابن سعد والحاكم وقال صحيح على شرط مسلم وافقه الذهبي وقال الشيخ ناصر وهو كما قالا (سلسلة الأحاديث الصحيحة حديث رقم ١٤٤). ئەگەر ژين و ژيواری پەيامبەران بەم جۆرە بێ كەواتە پياوچاكان دەبێ پەند وەرگرن و بەسەبارەتی گرفتاربونەكەيان گومانی نارەوا بەخوا نەبەن، هەروەها ئەوانەی تۆمەت و تەوس ئاراستەی پياوچاكان دەكەن و دەڵێن ئەگەر باش بن توشی ئەم گرفتاريە نەدەبون، ئەوانيش با ژيوان بنەوە.

## خەریکبونی پێغەمبەران بە ئیش و کاری مرۆڤانە:

یەکێك لە داخوازیە مرۆڤانەییەکانی پێغەمبەران ئەوەیە کە بەو ئیش و کارانە هەڵساون کە مرۆڤ دەیانکەن، بۆ وێنە پێغەمبەرﷺ بەر لە پێغەمبەرایەتی بازرگانی کردوە، هەروەها هیچ پێغەمبەرێك نەبوە شوانی نەکردبێ، ((فقد روى جابر بن عبدالله ﷺ قال: كنا مع رسول الله ﷺ نجني الكباث وأن رسول الله ﷺ قال: "عليكم بالأسود فإنه أطيبه" قالوا: أكنت ترعى الغنم؟ قال "وهل من نبي إلاّ وقد رعاها": (جابری کوڕی عبدالله دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بوین کوباثمان (کوباث: بەروبومی داری ئەراکە، بەگەییوەکان دەڵێن) دەچنی، پێغەمبەرﷺ فەرموی: رەشەکان بچنن ئەوان باشترن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا دیارە مەڕت لەوەڕاندوە؟ فەرموی هیچ پێغەمبەرێك نەبوە مەری نەلەوەڕاندبێ)) بوخاری گێڕایەتیەوە[68]. یەکێك لەو پێغەمبەرانەی لە قورئاندا باسی شوانیەکەی کراوە پێغەمبەر موسایە‌ﷺ کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك شوان بوە،: ﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَةَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ، قَالَ ذَٰلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ: من دەمەوێ یەك لەو دو کیژانەی خۆمت لێ مارە بکەم بەو مەرجەی هەشت ساڵان شوانیم بۆ بکەی جا ئەگەر کردیشتە دە ساڵ لە چاکی خۆتە، ئەستەمیت پێ ناکێشم خوا یاربێ یەکێك دەبم لە چاکەکاران. موسا

---

٦٨ فتح الباری (٦/٤٣٨).

گوتی: قبوڵمه، کام وەختم بەجێ گەیاند ئیتر مافت نامێنێ، خواش دیدەوانی بەڵێنمانە﴾ القصص/٢٧-٢٨.

ئیبنو حەجەر دەڵێ: پێشەوایان وتویانە حیکمەت لە شوانێتی پێغەمبەران ئەوەیە تا فێری خۆ بەکەمگرتن بن، لە تەنیایی رابێن، هەروەها لە بەرێوەبردن و سەرپەرشتیکردنی مەڕومالاَتانەوە بتوانن سەرپەرشتی خەڵکان بکەن و کاروباریان بەرێوە ببەن.[69]

یەکێکی‌تر لەو پێغەمبەرانەی ئیشوکاری مرۆڤکردەی کردوە پێغەمبەر داود بوە کە ئاسنگەر بوەو زرێی دروست کردوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَعَلَّمْنَاهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَكُمْ لِتُحْصِنَكُمْ مِنْ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنْتُمْ شَاكِرُونَ: فێری دروست کردنی زرێمان کرد تا لە شەڕێ خۆتانی پێ قەلغان بدەن، ئایە سوپاس ناوێژن؟﴾ الأنبياء/٨٠، ئاسنگەر بو لەهەمان کاتیشدا پادشا بو، نانی دەستی خۆشی دەخوارد، زەکەریای پێغەمبەریش ﷺ دارتاش بوە.[70]

## هیچ سیفەتێکی خواوەندێتی و فریشتەیان تێدا نیە:

داخوازیەکی تری مرۆڤانەیان ئەوەیە کە خوا نین و هیچ سیفەتێکی خواوەندێتیشیان تێدا نیە، خۆیان لە هەمو دەسەلاَت و کارێکی خوایەتی دەپارێزن و پشت بە خوای تاك و تەنیا دەبەستن، بانگەشەی هیچ سیفەتێکی خوایانەش ناکەن، خوا لە پاکانەی پێغەمبەر عیسادا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ

٦٩ فتح الباری (٦/٤٣٩).

٧٠ لە فەرمودەیەکی موسلیمدا هاتوە (مشكاة المصابيح ٣/١١٧).

يَاعِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ أَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّي إِلَهَيْنِ مِنْ دُونِ اللَّهِ قَالَ سُبْحَانَكَ مَا يَكُونُ لِي أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ إِنْ كُنتُ قُلْتُهُ فَقَدْ عَلِمْتَهُ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلاَ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ إِنَّكَ أَنتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنْ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَا دُمْتُ فِيهِمْ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنْتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ: له ژیانەوەدا خوا بە عیسا دەفەرموێ: تۆ بەخەڵکیت گوتوە من و دایکم جگە لە خوا بپەرستن؟ گوتی: پاکی بۆ تۆ خوایە بۆم نیە جگە لە هەق بێژم، ئەگەر وتبم تۆ زانیوتە، تۆ دەزانی لە ناخی مندا چ هەیە، بەلاّم من نازانم لە ناخی تۆدا چ هەیە، تۆ پەنامەکیزانی، من پێم گوتن ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەیە، تا لەناویشیاندا بوم پێیان ئاگادار بوم و چاودێریم دەکردن، بەلاّم کە منت بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە خۆت پێیان ئاگادار بویو دیدەوانیت کردون، تۆ چاودێری هەمو شتێکی﴾ المائدة/١١٦-١١٧. لە کۆبونەوە سەرانسەریەکەي رۆژی ژیانەوەدا پێغەمبەر عیسا بەم جۆرە دەدوێ، کە وتەکانی راست و رەوانن و نەریّ لە هەمو ئەو درۆ و دەلەسە و قسە نابەجێیانە دەکات کە دیانەکان پێیان هەڵبەستاوە، کۆمەڵێك لە دیانەکان دەڵێن: عیسا خوایەو چۆتە نێوزگی خاتو مەریەم: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ: ئەوانەی دەڵێن خوا عیسای کوڕی مەریەمە کوفریان کردوە﴾ المائدة/٧٢، یان هەندێکیتر دەڵێن: خوا سێیەمی سێهەمانە: ﴿لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ ثَالِثُ ثَلاثَةٍ: ئەوانەی گوتیان خوا سێیەمی سێهەمانە بێبڕواییان کردوە﴾ المائدة ٧٣، چینێکی تر گوتیان عیسا کوڕی خوایە: ﴿وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَانُ وَلَدًا، لَقَدْ جِئْتُمْ

شَيْئًا إِدًّا: گوتيان خوا كوڕی هەيە، بەراستی شتێكی ناقۆڵا و درێو و بێڕەزايان گوتوه﴾ مريم/٨٨-٨٩.

گاورەكان سنوربەزێنيەكی بێتاميان لە بارەی پێغەمبەر عيسا كردوه، زۆر نابەجێييان لە ئاست خوا كردوه كە دەڵێن خوا لەسەر كورسی مەزناتی خۆی دابەزيوه، پاشان بەزگی ئافرەتێكەوه لكاو رۆژگارێك لەوێدا لەنێو خوێنی پيسارو تاريكاييەكانی پەردە ئەستورەكانی نێو زگدا مايەوه، پاشان بە منداڵێكی شيرەخۆر دەرهات و بەرەبەرە هەراش دەبو، دەگريا و دەيخواردو دەيخواردەوەو ميزی دەكردو لەگەڵ منداڵان ياری دەكرد، پاشان لەگەڵ منداڵی جولەكان هاموشۆی فێرگەی دەكردو ئەو شتانە فێر دەبو كە هەمو مرۆڤێك گەرەكيەتی فێری ببێ، لەكاتی خەتەنەكردنيشدا چەرمۆكەيان بڕيبو، پاشان جولەكەكان لێرەو لەوێ پەرگەندەيان دەكرد، پاشان گرتيان و جۆرەها ئەشكەنجەو ئازاريان دەدا و ريسواييەكی زۆريان پێ چەشت، تاجێكی زۆر ناشيرينيان لە دڕك و چقڵ بۆ دروست كردو خستيانە سەر وشترێكی بێ رێشمە، پاشان بۆلای تەختی خاچ راپێچيان كردو بە چەپەرۆكان لێيان دەداو تفيان بەڕودا دەكرد، ئەوانيش لە بەرودوا و لە راست و چەپی دەرۆيشتن، ئيتر خستيانە سەر ئەو سەكۆيەی كە دڵ و جەستە لەبەريدا شەق دەبات، پاشان دەست و پێيان بە گوريس بەستەوه، پاشان بزماريان تێ ئاخنی كە ئێسقانی دەشكاندو گۆشتی دەبڕی، هاواری دەكرد: رەحمم پێبكەن، هيچ مرۆڤێك رەحمی پێنەكرد. ئەمەيە تەگبيركاری دنيای ژورو ژێر كە خەڵكانی ئەرزو ئاسمان لێی دەپاڕێنەوه كە هەمو رۆژێك لە كارێكدايە! پاشان مردو لە بن

تاشەبەرد و خۆڵێ شاردیانەوە، پاشان لەگۆڕ هەڵسایەوەو بۆ بارەگاو پاشایەتی خۆی بەرزبۆوە، ئەمەش دوای روداني ئەم هەمو کارەساتە.[71]

## تەواوێتی مرۆڤانە:

هەڵبەت مرۆڤ لە نێو خۆدا بەرزو نزمیەکی زۆریان لە بواری سروشتیو رەوشتیو بەهرەوەریدا هەیە، مرۆڤ هەیە ناشرینە، مرۆڤ هەیە جوانە و هەیە مامناوەندیە، هەیە کوێرە هەیە چاوێکی کوێرە، هەیە چاوساغە، چاوساغەکان هەیانە چاویان جوانترو سۆمایان بەهێزترە، مرۆڤ هەیە کەڕە، هەیە ژنەوتێکی هەستیارە، هەیە مەرادانەیە و هەیە نامەرد و بەرچاو تەنگە، بەلام بێگومان پێغەمبەران ئەوپەڕی تەواومەندێتیان هەیە، خوا بۆ خۆی هەڵیبژاردون، بۆیە دەبێ دڵیان لە هەمو کەس پاکترو رەوشت بەرزترین و ئارەزو چاکترینی خەڵك بن: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ﴾ الأنعام/١٢٤.

## تەواوێتی جەستەیی:

خوا هەرەشەی لەئێمە کردوە ئازاری پێغەمبەرﷺ نەدەین، هەروەکو بەنی ئیسرائیل ئازاری پێغەمبەر موسایان داوە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا: بڕواداریـنە! وەکو ئەوانە مەبن کە ئەزیەتی موسایان دا، خوا پاکانەی کرد لەوەی وتیان، موسا لەلای خوا بەرێز بوە﴾ الأحزاب/٦٩.

---

71 هداية الحيارى (تەماشای الجامع الفريد ل ٤٧٩ بکە).

پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکدا ئازارەکەی بەنی ئیسرائیلی رون کردۆتەوە، کە تۆمەتی خەوشێکی جەستەییان ئاراستە کردوە، ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((موسا پیاوێکی بەشەرم بو، بەتەنها و دور لە چاوی خەڵك خۆی دەشوشت (بەڵام بەنو ئیسرائیل بەروتی لەبەر چاوی یەکتری خۆیان دەشوشت–وەرگێڕ) هیچ جێی دەرنەدەکەوت، بەوە ئەزیەتیان دەدا دەیانگوت: بۆیە بەتەنها خۆی دەشواو ئەوەندە خۆی دادەپۆشێ یان بەڵەکە یان دەبەیە یان خەوشێکی تری هەیە، خوا ویستی لەو قسانەی پێیان هەڵبەستبو پاکەوەری بکات، رۆژێکیان موسا چوە جێیەکی دور و تەنها تا خۆی بشوات، جلەکانی لەسەر بەردێك دانا و خۆی شوشت، کە تەواو بو چو جلەکانی لەبەر بکات بەڵام بەردەکە جلەکانی رفاند، موسا گۆچانەکەی هەڵگرت و بەدوی کەوت تا بە روتی گەیشتە ناو بەنی ئیسرائیل، ئەوان کە بە روتی موسایان بینی لە هەمو کەس جوانترە، گوتیان: بەخوای موسا هیچ خەوشێکی نیە. خوا بەم جۆرە بوختانەکەی پوچاندەوە، بەردەکە راوەستاو جلەکانی هەڵگرت و لەبەری کرد، ئەوجا بەردەکەی دا بەر گۆچانان، بەردەکە شوێنەواری لێدانەکەی لەسەر دروست دەبو، سێ جێ بو یان چوار یان پێنج بو، ئەوەیە وتەی خوا کەدەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَكُونُوا كَالَّذِينَ آذَوْا مُوسَى فَبَرَّأَهُ اللَّهُ مِمَّا قَالُوا وَكَانَ عِنْدَ اللَّهِ وَجِيهًا﴾ الأحزاب/٦٩.

ئیبنو حەجەر(بەرمیهری خوا بێ) لەدوای ئەم فەرمودەیەدا دەڵێ: لەمەوە دەردەکەوێ پێغەمبەران لە جەستە و خورەوشتدا لەوپەڕی تەواویێتی و بێ کەمایەسی دان، هەر کەسێکیش خەوشێك بداتە پاڵیان ئازاری داون بەڵکو مەترسی بێبڕواییشی لێ دەکرێ.[٧٢]

---

٧٢ فتح الباري ٦/٤٣٨.

## جیاوازی شێوە:

کە دەڵێین پێغەمبەران لە روی جەستەدا تەواومەندترینی خەڵکانن مەبەستمان ئەوە نیە هەر هەموویان هەمان شێوەو رەنگ و روخساریان هەبێ بەڵکو جیاوازن، پێغەمبەرﷺ وەسفی هەندێ پێغەمبەرانی بۆ کردوین:

لەبارەی پێغەمبەر موسادا ﷺ دەفەرموێ: ((ليلة أسري بي رأيت موسى وإذا هو رجل ضرب من الرجال كأنّه من رجال شنوءة: لە شەورەویەکەمدا موسام بینی نە لاواز و نە قەڵەو بو، بە پیاوەکانی هۆزی شەنوئە دەچو))[73] (شەنوئە دێیەکی یەمەن بو- وەرگێڕ)، لەبارەی عیساشدا ﷺ دەفەرموێ: ((ليس بيني وبينه نبي وإنه نازل فإذا رأيتموه فاعرفوه رجل مربوع الى الحمرة والبياض ينزل بين ممصرتين كأن رأسه يقطر وإن لم يصبه بلل: لەنێوان من ئەودا هیچ پێغەمبەرێك نەبوە، کاتێك دادێ لە ئاسمانێ دابەزێ، ئەگەر دیتتان بیناسن؛ پیاوێکی چوارشانەو تێکسمراوە، رەنگی سورو سپیە، بەجلێکی زەردی سپیواژ دادەبەزێ، هەر چەندە تەریش نەبوە، بەلام سەری وەك بڵێی تنۆك تنۆك ئاوی لێ دەچۆڕێتەوە))[74].

یاوەرانیش لەبارەی پێغەمبەرداﷺ وتویانە: جوانترین کەس بو، بالا بەرزی مام ناوەندی بو، ناوشانی پان و بەرین بو، رومەتەکانی گوپن بو، پرچی رەشێکی تۆخ بو، رەشێنەی چاوی رەش رەش و سپێنەکەشی سپی سپی بو،

---

[73] بوخاري گێڕایتیەوە ( ٤٢٨/٦).

[74] ئەبو داود و ئەحمد گێڕایتیانەوە (صحيح الجامع ٥/٩٠).

برژانگی درێژ بو، لەرۆیشتندا کە پێی دادەنا هەموی دادەنا، سینگە پێی نەبو، کە عەباکەی بەسەر پشتی دادەدا دەتگوت یەك قالبە زیوە.

## تەواویتی رەوشتی:

پێغەمبەران لەو پەڕی رەوشت پەسندو بەرزیدا بون، خوا ستایشی کردون، لەبارەی ئیبراهیمەوە ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِبْرَاهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّاهٌ مُنِيبٌ: ئیبراهیم نەرمکێش و ئەفسوسکێش و ژیوان بو﴾ هود/٧٥.

کچی پیاوچاکەکەش لەبارەی موسادا بە باوکی دەڵێ: ﴿يَاأَبَتِ اسْتَأْجِرْهُ إِنَّ خَيْرَ مَنْ اسْتَأْجَرْتَ الْقَوِيُّ الأَمِينُ: بابەگیان بەکرێی بگرە با ئەو شوانیمان بۆ بکات چونکە پیاوێکی زۆر بەهێزو دەستپاکە﴾ القصص/٢٦.

لەبارەی بەڵێن پەروەری ئیسماعیلدا ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَبِيًّا: لەپەڕتوکدا یادی ئیسماعیل بکەوە کە بەڵێن راست و پەیامبەرێکی پێغەمبەر بو﴾ مريم/٥٤.

لەبارەی پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ: هەڵبەت تۆ رەوشتێکی بەرزو مەزنت هەیە﴾ القلم/٤.

خوا لەم ستایشەی پێغەمبەردا ﷺ فەرمویەتی: (مەزن)، پاشان سێ نەشمی تەوکیدیشی هێناوەتەوە: یەکەم سوێندی بە نون و پێنوس خواردوە، (إنّ)ی لەپێشدا هێناوە (لام)ی خستۆتە سەر خەبەرەکە.

یەکێك لەو سیفەتە بەرێزو بەرزانەی پێغەمبەرﷺ بەزەیی‌و میهرەبانیە: ﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُمْ بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ: لەخۆتانەوە پێغەمبەرێکتان بۆ هاتوە کە لە خەمی ئەستەمیەکانتان دایە، بۆ بەرژەوەندیتان رشتە، لەگەڵ بڕواداراندا میهرەوەر و میهرەبانە﴾ توبة/١٢٨.

ئەم رەوشتانەی پێغەمبەرﷺ کارێکی زۆری لەخەڵك کردوەو بۆتە مایەی رێنوێن و پەروەردەبونیان، صەفوانی کوڕی ئومەییە دەڵێ: (نەبو هێندەی پێغەمبەرﷺ رقم لێی بێتەوە، بەڵام هەندی پێ بەخشیم و هەندی پێدام بەجۆرێك کەوتە بەر دڵم بوە خۆشەویستترین کەس) موسلیم گێڕایتیەوە. لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە کە (پیاوێك داوا لە پێغەمبەرﷺ دەکات پێی ببەخشێ، ئەویش رانێکی لە مەڕو ماڵاتەکەی پێ بەخشی کە پڕ بە بەینی دوکێو دەبو).

پێغەمبەران ئەگەر بەم جۆرە تەواومەندو بێ خەوش و کەمایەسی و پاك نەبوبان ئەوا خەڵك ئەژنەوایان نەدەبون و پەیرەویان لێنەدەکردن، چونکە خەڵك بەگەڵ یەکێك ناکەوێ خەوشی زۆرو خێری کەم بێ.

## پێغەمبەران رەسەنترین نەژادیان هەیە:

پێغەمبەران(سلاوی خوایان لەسەر بێت) رەسەنترین و پاکترین نەژادیان هەیە، هەمو پێغەمبەرەکان لەدوای نوحدا لەنەوەی نوحن(سلاوی خوایان لەسەر بێت) هەر هەموشیان لەدوای ئیبراهیمدا لەنەوەی ئیبراهیمن خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا

نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ: نوح و ئیبراهیممان کرده پەیامبەر، هەروەها پێغەمبەرمان لە نەوەکانیاندا ناردوەو پەرتوکمان بۆ دابەزاندون.﴾ الحديد/٢٦. خوا لەرەسەنترین نەژاددا پێغەمبەرانی هەڵبژاردوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((بعثت من خير قرون بني آدم قرنا فقرنا، حتى كنت من القرن الذي كنت منه: لەئادەمرا سەدە بۆ سەدە تا ئەم سەدەیە لە چاترینی خەڵکانەوە هاتومە))[٧٥].

هەروەها دەفەرموێ: ((أنا محمد بن عبدا لله بن عبدالمطلب، إن الله تعالى خلق الخلق فجعلني في خيرهم، ثم جعلهم فرقتين فجعلني في خيرهم فرقة، ثم جعلهم قبائل فجعلني في خيرهم قبيلة، ثم جعلهم بيوتاً فجعلني في خيرهم بيتاً، فأنا خيركم بيتاً وخيركم نفساً: من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەللیبم، خوا کە مرۆڤی ئەفراند منی لەناو چاترینیان هەڵبژارد، پاشان مرۆڤی کردە دو چین من لە چینە باشەکە بوم پاشان کردنیە هۆزو گەل من لە چاترینیان بوم، پاشان کردنیە بنەماڵە من لە باشترینیانم دەبزانن من لە باشترینی بنەماڵەکانتانم و چاکترین کەستانم))[٧٦].

## هیچ پێغەمبەرێك كۆیلە نەبوە :

یەکێك لەو سیفەتە تەواومەندیانەی پێغەمبەران ئەوەبو کە قەت کۆیلە نەبون، سەفارینی لەم بارەوە دەڵێ: کۆیلەیی کەموکوڕیەکە و شایەنی

٧٥ بوخاری گێڕایتیەوە (فتح الباری ٥٦٦/٦).
٧٦ ئەحمەدو ترمذی گێڕایتیانەوە (صحیح الجامع ٢٢/٢).

پێغەمبەرایەتی نیە، چونکە پێغەمبەر لەشەو و ڕۆژدا دەبێ بانگی خەڵکی بکات، بەڵام کۆیلە ئەمەی بۆ ناڕەخسێ، پاشان خەڵك وەدوای کۆیلە ناکەوێت و نایکەنە سەرمەشق و پێشەوای خۆیان، هەروەها کۆیلەیی شوێنەوارێکی بێبڕواییە، پێغەمبەران لێی بێبەشن.[٧٧]

## بەهرەو توانا:

پێغەمبەران زرنگیو زیرەکیو تێگەیشتن و وریاییەکی زۆریان هەیە، چەندین تواناو بەهرەی تریشیان هەیە کە مەرجن بۆ ڕاگەیاندن و دیدەوانی و پەروەردەکردنی شوێنکەوتوانی.

پێغەمبەرﷺ هەرچی بۆی سروش دەکرا دەهاتە بەریو ئەزبەری دەکرد، یەك وشە چیە لە بیری نەدەکرد:

﴿سَنُقْرِئُكَ فَلاَ تَنسَى: بۆ دیخوێنینەوە لەیادی نەکەی﴾ الأعلى/٦، کە بێبڕواکان بەرەنگاری دینی خوا دەبونەوە و مشتومڕیان دەکرد، کەچی ئەوان زۆر بێباك و سەرکەوتوانە دەهاتنە پێشێ، پێغەمبەر ئیبراهیمعليه السلام ڕقەبەرەکەی دەمکوت کردوە: ﴿فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ البقـــرة/٢٥٨، خوا لەدوای ئەم مشتومڕەدا دەفەرموێ: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَّنْ

---

٧٧ لوامع الأنوار البهية (٢/٢٦٥)، ڕەنگە پرسیارێك ڤیت بێتەوەو بلێی: لەدی یوسف کە لەمبیردا دۆزیانەوە نەکرا بەندە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە کە ئەم کۆیلەیە جۆرێکی تاقیکردنەوە بوە، ئەگەر نا خۆی ئازادو ڕەها بو، بەڵام ئەم ستەمەی لێ کراوە، پاشان ئەم کۆیلایەتیە زۆری نەخایەندوە و خوا لەئەنجامدا کردیە پاشا.

نَشَاءُ: ئەوەیە بیانوبڕیەکەی ئێمە کە بە ئیبراهیممان بەخشی تا لەگەڵ هۆزەکەی بەکاری بێنێ، کێمان مەبەست بێ چەندین پلە بەرزی دەکەینەوە﴾ الأنعام/٨٣.

پێغەمبەر موسایش﷤ هەرچی فیرعەون گوتی بەزاندی تا هەڕەشەی بەکارهێنانی هێزی لە موسا کرد: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ الْعَالَمِينَ، قَالَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنتُمْ مُوقِنِينَ، قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُ أَلاَ تَسْتَمِعُونَ، قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ آبَائِكُمْ الأَوَّلِينَ، قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ الَّذِي أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ، قَالَ رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَا إِنْ كُنتُمْ تَعْقِلُونَ، قَالَ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إِلَهًا غَيْرِي لأَجْعَلَنَّكَ مِنْ الْمَسْجُونِينَ: فیرعەون گوتی: جا پەروەردگاری جیهانیان چیە؟ موسا گوتی: پەروەردگاری ئەرزو ئاسمانەکان و نێوانیانە ئەگەر ئاوەردارن، فیرعەون بە دەوروپشتی گوت: گوێتان لێیە چ دەڵێ؟! موسا گوتی: پەروەردگاری ئێوەو باوانی پێشوتانە، فیرعەون گوتی: ئەو پەیامبەرەی بۆتان نێردراوە شێتە، موسا گوتی: پەروەردگاری رۆژهەڵات و رۆژئاواو نێوانیانە ئەگەر بفامن، فیرعەون گوتی: ئەگەر جگە لە من خواوەندیتر هەڵبژێری دەتخەمە زیندانەوە﴾ الشعراء/٢٣-٢٩.

## بەرپاکردنی بەندایەتی:

جگە لەو تەواوێتی شێوەو روخسارو ئەدگارو رەوشتی جەستەییو دەرونیدا، جگە لەو هەمو ئاکارو بەهرە پەسندانەی کە خوا بە پێغەمبەرانی بەخشیوە، جۆرە تەواوێتیەکیتر هەیە کە بریتیە لە هێنانەدی بەندایەتی، مرۆڤ تا پتر بەندایەتی لەخۆی بێنێتەدی، پتر بە پەیژەی تەواوێتی هەڵدەزنێ، تا لە بەندایەتیش دورکەوێتەوە سەر لەنشێوتر دەبێ.

پێغەمبەران پێشەنگی کاروانی بەندایەتین و سەرانسەری ژیانیان وەدیهێنانی بەندایەتی بوە، ئەوەتانێ پێغەمبەرمانﷺ لە ئەوپەڕی شوێنپایە بەرزیدا پەروەردگارەکەی بە بەندە ناوی دەبات و لە شوێنپایەی سروشدا بەوە وەسفی دەکات: ﴿فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى: سروشی بۆ بەندەکەی کرد، چ سروشێك﴾ النجم/١٠، لەشوێنپایەی دابەزینی قورئاندا: ﴿تَبَارَكَ الَّذِي نَزَّلَ الْفُرْقَانَ عَلَى عَبْدِهِ لِيَكُونَ لِلْعَالَمِينَ نَذِيرًا: بەپێزو پیرۆزگارە ئەو خوایەی کە جوداکەرەوەی رەواو ناڕەوای بۆ بەندەکەی ناردوە، تا بۆ سەرجەم جیهانیان ببێتە هەڕەشەگار﴾ الفرقان/١. لە شوێنپایەی بانگەوازدا: ﴿وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللهِ يَدْعُوهُ﴾ الجن/١٩، لە شوێنپایەی شەوڕەویدا: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ: پاکی بۆ ئەو خوایەی کە لە شەوێکدا شەوڕەوی بە بەندەکەی کرد لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقسا کە دەوروبەریمان بە فەڕوفیت کردوە﴾ الإسراء/١.

پێغەمبەرمان ﷺ بەسای ئەم بەندایەتیە لە ژین و ژیانەوەدا لە پێشەنگی سەرجەم خەڵکاندایە، لەرۆژی ژیانەوەدا کە خەڵك بۆ تکاخوازی رودەکەنە پێغەمبەر عیسا﷤ پێیان دەڵێ: بڕۆن بۆلای موحەممەد بەندەیەکە خوا لە گوناحی پێش و پاشی خۆش بوە[78]، ئەوەی خاتو عائیشەش(رەزای خوای لێبێ) دەیگێڕێتەوە وێنەیەکی تری بەندایەتی خۆشەویستمانەﷺ دەڵێ؛ جارێکیان گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا سەرگەردت بم، بە پاڵدانەوە نانەکەت بخۆ ئاسانترە، ئەویش سەری دانەواند نزیك بو نێوچەوانی بەزەوی بکەوێ و گوتی: ((بل آکل

---

٧٨ تخريج الطحاوية (شرح العقيدة الطحاوية ١٥٧).

كما يأكل العبد وأجلس كمـــا يجلـــس العبـــد: بەڵكو وەكو بـەندە دەخۆم و دادەنیشم)) رواه البغوي في شرح السنة وابن سعد والإمام أحمد في الزهد.[79]

## پیاوێتی:

یەکێکی تر لـەو تەواوێتیانـەی کە خوا بـە سـەرجەم پێغەمبـەرانی بەخشیوە پیاوێتی بوە، خوا هیچ ئافرەتێکی نەکردۆتە پێغەمبەر، لەم ئایەتەدا بە ڕێژگەی حەصر هاتوە کە خوا تەنها بۆ پیاوان سروشی دابەزاندوە: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلاَّ رِجَالاً نُوحِي إِلَيْهِمْ﴾ الأنبياء/٧.

## حیکمەتەکانی پیاوێتی پێغەمبەران:

کـە پێغەمبـەران پیاوبونـەو ئافرەتـان نەبونەتـە پێغەمبـەر چـەندین هـۆو حیکمەتی هەبوە:

١. پەیامبەرێتی وادەخوازێ لە نێو خەڵکدا بناسرێو قسـە لەگـەڵ پیـاو و ژندا بکات، بەنهێنیو ئاشکرا خەڵك ببینێ، بە شارو گونـدو هەرێمـەکانی سەر زەویدا بگەرێ، بەرانگژی بێبڕواو رقەبەران بێتەوەو مشتومڕیان دەگەڵ بکات، لەشکر ساز بکـات و سـەرکردایەتیان بکـات، ئـەم هـەمو ئەرکـە بـە ئافرەت ناکرێ.

٢. پەیامبـەرێتی رەگەزسـالاری (القوامـة) گەرەکـە تـا بتوانـێ بڕیـار و فەرمان بۆ شوێنکەوتوانی دەربکات و ناوبژییـان لـە نێواندا بکـات، ئەگـەر ئافرەت بەم کارە هەڵسابا ئەوا کەسانێکی زۆر دەسەنگرانەوە.

---

٧٩ صحيح الجامع الصغير (١/١٢٢).

٣. پیاوێتی بێ کەمایەسی ترە–هەروەکو باسمان کرد--هەر بۆیەشە خوا ڕەگەزسالاری بە پیاوان بەخشیوە ﴿الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ﴾ النساء/٣٤، پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکدا ئەم هەقیقەتەی ڕاگەیاندوە کە ئافرەت ئاوەزو دینیان کەمایەسی هەیە.

٤. ئافرەت دۆخی وای بەسەرداد‌ێت کە لە زۆر ئەرك و پیشەیان دەکات وەکو پیساریی‌و منداڵبون و زەیستانی، کە دەبنە مایەی هەڵشێوانی دەرونی‌و ژان وژوار و ئازار، ئەمە جگە لەو داخوازیانەی کە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ گەرەکە، ئەمانە هەموی لەمپەرن بۆ مشورخواردنی پەیامبەرێتی.

## پێغەمبەرێتی ئافرەتان:

چەند زانایەك[٨٠] بۆ نمونە ئەبولحەسەنی ئەشعەری و قورتوبی‌و ئیبنوحەزم[٨١] پێیان وایە خوا پێغەمبەرایەتی بە هەندێ ئافرەت بەخشیوە.

هەمو ئەوانەی پێیان وایە ئافرەتانیش هەن پێغەمبەر بوبن لە پێغەمبەرایەتی خاتو مەریەم یەکدەنگن، هەندێکیان پێیان وایە حەواو سارەو دایکی موساو هاجەرو ئاسیەش پێغەمبەر بون، ئەوانەی کە بیروباوەڕیان وایە گەر ئەو ئایەتانەیان بۆ بهێنرێتەوە کە پێغەمبەرایەتی بە پیاوان تایبەت دەکات دەڵێن لەوەدا ناکۆکی ناکەین، پەیامبەرێتی بۆ پیاوانە بەڵام ئەم ئایەتانە مەبەستی لە (پێغەمبەرایەتی: النبوة) نیە بەڵکو مەبەستی لە (پەیامبەرێتی: الرسول)ە، ئەو نادروستیانەش کە دەیژمێرن و پێتان وایە بۆ پەیامبەری ئافرەت نابێ

٨٠ جولەکەش پێیان وایە مەریەمی خوشکی موساو هارون؛ پێغەمبەر بوە (لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٦).
٨١ فتح الباري ٦/٤٤٧-٤٤٨، لوامع الأنوار البهية ٢/٢٦٦.

نایگرێتەوە، لەبەر ئەوەی ڕەنگە پێغەمبەرایەتی تەنها بە خودی خۆی تایبەت بێو کاری پێ بکات ئاتاج بەوە نەکات بەخەڵکانی تری ڕاگەیەنێ.

## بەڵگەکانیان:

بەڵگەی ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە کە خوا لە قورئاندا باسی ئەوەی کردوە سروشی بۆ چەند ئافرەتێك کردوە یەك لەوانە خوا سروشی بۆ دایکی موسا کردوە: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلاَ تَخَافِي وَلاَ تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنْ الْمُرْسَلِينَ: سروشمان بۆ دایکی موسا نارد: شیر بدە موسا، پاشان ئەگەر ترسای بیکوژن بیخە ناو ڕوباری نیل و لە خنکانی مەترسێ، پەژارە نەتگرێ چونکە بێگومان بۆتی دەگێڕینەوەو دەیکەینە پەیامبەر﴾ القصص/٧.

هەروەها جبریلی بۆ لای خاتو مەریەم ناردوەو قسەی لەگەڵدا کردوە: ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا، قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَانِ مِنْكَ إِنْ كُنتَ تَقِيًّا، قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لأَهَبَ لَكِ غُلاَمًا زَكِيًّا: جبریلمان نارده لای کە خۆی بۆ شێوەی مرۆڤ گۆڕیبو، خاتو مەریەم وتی: خۆم بە خوای میهرەبان پەنا دەگرم لەتۆ ئەگەر لە خواترسی، گوتی: بەڵکو خوا منی ناردوە تا کوڕێکت بە بەخششی خوا پێبدەم پاك بێ لەگوناح﴾ مريم/١٧-١٩.

فریشتە پێی گوت: ﴿وَإِذْ قَالَتْ الْمَلاَئِكَةُ يَامَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ، يَامَرْيَمُ اقْنُتِي لِرَبِّكِ وَاسْجُدِي وَارْكَعِي مَعَ الرَّاكِعِينَ: مەریەم! خوا تۆی هەڵبژاردوە و پاکی کردیەوە، تۆی لە نێو هەمو ئافرەتانی جیهان هەڵبژاردوە،

مەریەم! خوای خۆت بپەرستەو سوژدەی بۆ ببە، لەگەڵ کڕنوشبەران کرنوش ببە﴾ آل عمـــران/٤٢-٤٣. ئەبولحەسەنی ئەشعەری پێی وایە هەر یەکێك خوا فریشتەی بەمەبەستی فەرمان و بەرهەڵستیەك یا بە راگەیاندنێکی شتێك بۆ بنێرێ ئەوا پێغەمبەرە[٨٢]، دایکی موساو مەریەم و ئافرەتی تریش، هەروەها حەواو سارەو هاجەر وئاسیەش بەدەقی قورئان شتی لەم بابەتەیان بۆ وەدی هاتوە، هەروەها ئەوەشیان بەبەڵگە هێناوەتەوە کە خوا خاتو مەریەمی بەسەر ئافرەتانی جیهاندا هەڵبژاردوە: ﴿وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ﴾ آل عمـــران/٤٢، هەروەها ئەم فەرمودەیەش کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((کمل مـــن الرجـــال كثير، ولم يكمل من النساء إلاّ آسية إمرأة فرعون ومريم ابنة عمـــران: زۆر پیاو هەبون کامڵ بون، بەڵام ئافرەتان تەنها ئاسیەی خێزانی فیرعەون و مەریەمی کچی عیمران کامڵ بون))[٨٣].

دەڵێن ئەوانەی دەگەنە پایەی تەواومەندێتی کامڵێتی تەنها پێغەمبەرانن.

### وەڵامدانەوەیان:

هەڵبەت ئەو بەڵگانەی هێناویانە پێغەمبەرێتی ئافرەتانی پێ ناسەلمێ، لەچەند روێکیشەوە وەڵامیان دەدەینەوە:

یەکەم: ئەوەیان بۆ ناسەلمێنێن کە (پێغەمبەر: النبي) ئەرکی راگەیاندن و ئاراستەکردن و تێکەڵبونی خەڵکی لەئەستۆ نەبێ، چونکە جیاوازی لەنێوان پێغەمبەرو پەیامبەردا نیە، جیاوازیەکە هەر ئەوەیە کە پێغەمبەر ئەرکی دوبارە راگەیاندنەوەی بەرنامەی پەیامبەرەکەی پێشوی لەئەستۆ دایە. کەواتە ئەو

---

٨٢ فتح الباری (٦/٤٤٧).

٨٣ متفق علیه (مشکاة المصابیح ٣/١١٨).

نادروستیانەی بۆ ئافرەتانی پەیامبەر دەگوترێت ئافرەتانی پێغەمبەریش دەگرێتەوە، بێگومان نادروستیەکان ئەوەندە زۆرن کە بوار بە ئافرەت نادات بە ئەرکی پێغەمبەرایەتی هەڵبستێ.

دوەم: رەنگە ئەو سروشەی خوا بۆ دایکی موساو ئاسیەی کردوە، لەخەوندا بوبێ، رونمان کردەوە کە سروش هەیە لە خەونداو بۆ جگە لە پێغەمبەرانیش دەکرێت.

سێیەم: پێمان وانیە هەر یەکێك خوا فریشتەی بۆ هەناردو قسەی لەگەڵدا کرد ببێتە پێغەمبەر، لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺدا هاتوە کە جارێکیان پیاوێك لە پێناو خوا بەمەبەستی سەردانی برادەرێکی بۆ گوندێك دەچێ، لەرێگادا خوا فریشتەیەکی بۆ دەنێرێ و لێی دەپرسێ مەبەستی کە لەم سەردانەدا چیە؟ ئەویش دەڵێ چونکە لەپێناو خوا خۆشم دەوێ، فریشتەکە پێی دەڵێ مادەم وایە خواش تۆی خۆش دەوێت. روداوی کەچەڵ و بەڵەك و کوێرەکەش بەناوبانگە، زۆر جارانیش جبریل هاتۆتە لای پێغەمبەرﷺ یاوەرانیش بینیویانەو گوێیان لەوتەکەی بوە[84].

چوارەم: پێغەمبەرﷺ لە بە پێغەمبەر دانانی ذولقەرنەین هەڵوەستەی کردوەو بڕیاری نەداوە، کەچی لە قورئانیشدا یادکراوە کە خوا سروشی بۆ هەناردوە: ﴿قُلْنَا يَاذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَنْ تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَنْ تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا: ذولقەرنەین! یا ئەوەتا سزایان دەدەی وەیان چاکەیان لەگەڵ دەنوێنی﴾ الكهف/٨٦.

پێنجەم: هەڵبژاردنی خاتو مەریەم هیچ بەڵگەیەکی تێدا نیە، چونکە خوا بەڕاشکاوی باسی هەڵبژاردنی جگە لە پێغەمبەرانی کردوە: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ

٨٤ بۆ خوێندنەوەی ئەم فەرمودانەو فەرمودەی هاوشێوە بگەڕێوە بۆ بەشی دوەمی ئەم زنجیرەیە بەناوی (جیهانی فریشتان).

الذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفسِهِ وَمِنْهُمْ مُقتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللهِ: پاشان ئەو پەڕتوکەمان بۆ بەندە هەڵبژاردەکانی نەتەوەی موحەممەد ﷺ بەجێ هێشت کە زانایان دەگرێتەوە، ئەنجا ئەم نەتەوەیە هەیانە ستەمی لەخۆی کردوە، هەیانە میانە گیرە، هەشیانە دەستپێشخەری چاکانە﴾ فاطر/٣٢، هەروەها خانەوادەی ئیبراهیم و خانەوادەی عیمرانیشی هەڵبژاردوە، کەچی هی وا هەبوە پێغەمبەر نەبوە: ﴿إِنَّ اللهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى العَالَمِينَ: خوا ئادەم و نوح و خانەوادەی ئیبراهیم و خانەوادەی عیمرانی بەسەر جیهانان هەڵبژارد﴾ آل عمران/٣٣.

شەشەم: ئەو فەرمودەیەی کە بڕیاری تەواومەندێتی بۆ ئافرەتان داوە ئاماژەی پێغەمبەرایەتی تێدانیە چونکە مەبەستی فەرمودەکە ئەوەیە کە ئەوانە لە ئافرەتێتیدا تەواومەند بون نەك لە پێغەمبەرایەتیدا.

حەفتەم: لە چەندین فەرمودەدا هاتوە کە خاتو خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر ﷺیش لە تەواومەندەکان بوە[85] کەچی پێغەمبەریش نەبوە لەوەوە دەردەکەوێ کە مەبەست لەو تەواومەندیەدا پێغەمبەرایەتی نیە.

هەشتەم: لە هەندێ فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی فاتیمە سەرداری ئافرەتەکانی نێو بەهەشتە، تەنها خاتو مەریەمی کچی عیمرانی هەڵاواردوە[86]، کەواتە ئەم فەرمودانە تەنها مەریەم نەبێ، دەنا هەرچی ئافرەتیترە نەرێی لێ دەکات پێغەمبەر بوبن، چونکە ئاشکرایە خاتو فاتیمە

---

٨٥ ئیبنو مەردەوەێ تەخریجی ئەم فەرمودەیەی کردوە (البداية و النهاية ٢/ ٦١).

٨٦ ئیمام ئەحمد ئەم فەرمودەیەی بە ئیسنادێکی جەید گێڕاویەتەوە (فتح الباري ٦/ ٤٧٧).

پێغەمبەر نەبوە، وە لەسەرجەم ئافرەتانیتریش چاکترە، جا ئەگەر دایکی موساو ئاسیە پێغەمبەر بوبان ئەوا لە خاتو فاتیمە چاکتر دەبون.

نۆیەم: خوا لە شوێنی ستایش و پێداهەڵگوتن و پەسند کردنی خاتو مەریەمدا بە ئافرەتێکی چاکەخوازی ناوبردوە، دەفەرموێ: ﴿مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ: مەسیحی کوڕی مەریەم تەنها پەیامبەر بوەو بەر لەویش چەندین پەیامبەرمان ناردوە، دایکیشی راستپەروەر بو، هەردوکیشیان نانیان دەخوارد﴾ المائدة/٧٥. جا ئەگەر خاتو مەریەم وەسفێکی بەرزتری هەبوایە ئەوا لەم شوێنەدا ناوی پێ هەڵدەنا. پاشان هیچ ئایەت و فەرمودەیەکیش لەم بارەوە نیە بڵێ فلانە ئافرەت پێغەمبەر بوە.

(قازی عیاض) وتەی سەرجەم جەماوەری فەقیهانی هێناوەتەوە کە خاتو مەریەم پێغەمبەر نەبوە، هەروەها نەوەوی لە (الأذکار)دا لە (ئیمامولحەرەمەین)ەوە یەکدەنگی زانایان دێنێتەوە کە خاتو مەریەم پێغەمبەر نەبوە[87]، هەروەها ئەم وتەیەی لە (شرح التهذیب)دا بۆ کۆمەڵێك زانا گەڕاندۆتەوە.

حەسەنی بەسراییش دەڵێ: نەلە ئافرەت و نەلە جنۆکان پێغەمبەر نەبونە[88].

---

٨٧ یەکدەنگی زانایان بەوە دەبێ کە سەرجەم زانایان لەبارەی بابەتەکەوە کۆك و یەکدەنگ بن، بەڵام ئەگەر لەدوای ئەوەدا هی وا هەبو ناکۆك بو ئەوا لە یەکدەنگیی ناکەوێت.

٨٨ فتح الباري (٢/٤٧١-٤٧٣).

## چەند شتێك هەن بە پێغەمبەران تایبەتن و مرۆڤی تر نیانە:

### ١) سروش:

خوا سروشی تەنها بە پێغەمبەران تایبەت کردوەو مرۆڤی‌تر لێی بێبەشن، خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ: بڵێ منیش ئێوەئاسا مرۆڤم، سروشم بۆ دادەبەزێ کە خواوەندتان یەك خواوەندی یەکتایە﴾ الكهف/١١٠. سروش چەند شتێك دەگرێتەخۆ لەوانە: قسە لەگەڵدا کردنی خوا، پەیوەندیکردن بەهەندێ لە فریشتان، خوا هەندێ پەنامەکی داهاتو یان رابردویان پێ رادەگەیەنێ، خوا بەهەندێ کاری جیهانی پەنامەکی ئاگاداریان دەکاتەوە، لەوانە خوا شەورەوی بە پێغەمبەرﷺ کردو بۆ ئاسمانە بەرزەکان بڵند کردەوەو چەندین فریشتەو بەهەشت و دۆزەخ و ئازاری تاوانبارانی نێو گۆڕی دیت، لە فەرمودەیەکدا دەفەرموێ: ((لولا أن لا تدافنوا لدعوت الله أن يسمعكم عذاب القبر: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە مردو نەنێژن لە خوا دەپارامەوە گوێ بیستی سزای گۆڕتان بکات))[٨٩].

### ٢) پارێزراوێتی:

بەندێکی تایبەتمیان بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردوە، لەوێدا باسی دەکەین.

---

٨٩ ئەحمەد موسلیم و ئەبو داود و نەسائی گێڕایتیانەوە (صحيح الجامع الصغير ٥/٧٥).

## ٣ ) پێغەمبەران چاویان دەنوێ بەڵام دڵیان ناخەوێ:

ئەوەشیان تایبەتمەندێکیترە خوا بە پێغەمبەرانی بەخشیوە، ئەنەس لە فەرمودەی شەوڕەویدا دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (پێغەمبەر چاوی دەخەوێ، بەڵام دڵی ناخەوێ، پێغەمبەرانیش ئاوەهان چاویان دەخەوێ نەك دڵ) بۆخاری گێڕایتیەوە[٩٠] ئەم وتەیە ئەگەر چی وتەی ئەنەسە(رەزای خوای لێبێ)، بەڵام هی وەکو وی بە رای خۆی قسە ناکات ئەگەر بەڵگەیەکی نەبێ-هەروەکو ئیبنوحەجەر دەڵێ[٩١]، پاشان پێغەمبەرﷺیش هەر ئەنەس دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ((إنا معاشر الأنبياء تنام أعيننا ولا تنام قلوبنا: ئێمەی پێغەمبەران چاومان دەخەوێ بەڵام دڵمان واگایە)). هەروەها پێغەمبەرﷺ لەبارەی خۆیەوە دەفەرموێ: ((إن عيني تنامان ولا ينام قلبي: چاوەکانم دەخەون، بەڵام دڵم ناخەوێ))[٩٢].

## ٤ ) سەرپشککردنی پێغەمبەران لەمردندا:

تەنها پێغەمبەران لە سەرەمەرگدا سەرپشك کراون داخۆ حەزیان لەوە بوە بمرن یان بمێنن، خاتو عائیشە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ گوێم لە پێغەمبەرﷺ بو دەیفەرمو: ((ما من نبي يمرض إلاّ خيّر بين الدنيا والآخرة: هەر پێغەمبەرێك نەخۆش کەوتبێ لە هەڵبژاردنی ژین و ژیانەوەدا سەرپشك کراوە)) رواه البخاري ومسلم-سلسلة الأحاديث الصحيحة-.

---

٩٠ فتح الباري (٦/٥٧٩).

٩١ هەمان سەرچاوە.

٩٢ ئیبنو سەعد و ئیبنو حیبان گێڕایتیانەوە (صحيح الجامع الصغير ٣/٥٥).

پێغەمبەرمانﷺ لەسەرەمەرگدا خاتو عائیشە(رەزای خـوای لێبـێ) گوێـی لێ بـو دەیفەرمو: ((مع الذين أنعم الله عليهم مـن النبيـين والصديقـين والشـهداء والصالحين: لەگەڵ ئەوانە بم کە خوا بەهرەی لەگەڵدا کردون لە پێغەمبەران و راستان و شەهیدان و چاکەکاران))، دەڵێ زانیم سەر پشککراوە. بوخـاری گێڕاویەتیەوە[٩٣]، پێشتریش ئەو فەرمودەیەمان هێناوە کە مەلەکولمەوت موسای سەر پشککرد و پاشان موسا زللەیەکی لێدا و چاوی پەڕاند[٩٤].

## ٥) پێغەمبەران لەکوێ مردبن لەوێ ئەسپەردە کراون:

لەدوای مردندا خوا چەند شتێکی بە پێغەمبەران تایبەت کردوە:

**یەکەم:** لە کوێ مردبن لەوێ شراینەوە، لە فەرمودەدا هاتوە کە: ((لم يقبر نبي إلاّ حيث يموت: هەر پێغەمبەرێك مردبێ هەر لەوێندەر ئەسپەردە کراوە))[٩٥] هەر بۆیەش یاوەران(رەزای خوایان لێبێ) پێغەمبەریانﷺ لە ژوری خاتو عائیشە(رەزای خوای لێبێ) ئەسپەردە کرد چونکە لەوێدا مرد.

## ٦) زەوی جەستەیان ناڕزێنێ:

یەکێکی تر لەو رێزو روەتانەی خوا بە پێغەمبەرانی بەخشیوە ئەوەیە کە هەر چەندی رۆژگار درێژ بێتەوە و سەدە و سەردەم تێپەڕن جەستەیان نارزێو هەر بەساغی دەمێننەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((إن الله حـرم علـى الأرض أن

---

٩٣ صحيح البخاری بشرحه فتح الباری (٢٥٥/٨).

٩٤ سەرنجی پەرتوکی جیهانی فریشتەی ئەم زنجیرەیە بدە.

٩٥ ئیمام ئەحمەد بە ئیسنادێکی صەحیح لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتیەوە (صحيح الجامع الصغير ٤٦/٥).

**تأكل أجســـــاد الأنبيـــاء: خوا لـه زەوی حـەرام کـردوه جەستەی پێغەمبـەران بخوات))[٩٦].**

**مێژونوسان لەم بارەوە سەربردەیەکی سەیرمان بۆ دەگێڕنـەوە، ئیبنو کـەثیر لـە پـەڕتوکی (البدایـة والنهایـة)[٩٧]دا لـە یونسـی کـوڕی بوکـەیر دەگێڕێتـەوە کـە وتویەتی: کاتێك (تستەر)مان فتح کرد، لە ماڵی هورموزان تـەختێکمان دۆزیەوە پیـاوێکی مـردوی لەســەر راکشـــابو، پـــەڕتوکێکی لـــە لای ســـەری دانرابـــو، پەڕتوکەکـەمان هێنـا لای عومـــەر، ئـەویش بـانگی کـەعبی کـرد بـە عـەرەبی نوسیەوە، ئەمن یەکەمین کەس بوم لە عارەبەکان ئەو پەڕتوکەم زۆر بـەرەوانی- وەك خوێندنـەوەی قورئـان-خوێنـدەوە، بـە ئـەبو عالیـەم گـوت: چـی تێـدا بـو؟ گوتـی: سـەر گوزەشـتەو باسوخواس و قسـە و گوفتارەکـانی ئێـوەی تێـدا بـو، هـەروەها هـەرچی لـە ئایندەدا رودەدات، هـەر هـەموی تێدابـو، گـوتم: چتـان لـە پیاوەکە کرد؟ گوتی: بە رۆژ سێزدە گـۆڕی پەرتـەوازەمان لێدا کـە شـەو داهـات ئەسپەردەمان کـرد و گۆڕەکانمـان پرکـردەوە نـەبادا خـەڵك پێـی بزانـن و دەری بێنن[٩٨]، گـوتم: چیان پـێ مەبەست بـو؟ گوتـی: ئەگـەر بـاران نـەباریبا تـەخت و تەرمەکـەیان دەهێنـا دەرەوەو باران دەبـاری، گـوتم: پێتـان وابـو کێیـە؟ گوتـی: پیـاوێك بـو نـاوی دانیـاڵ بـو، گـوتم: ئـەوکاتی دۆزیتانـەوە تەمـەنی چـەند دەبـو؟**

---

٩٦ ئەبو داود نسائی -کە بە صـەحیحی داناوە- و ئیبنو خوزەیمەو هی تریش گێڕایتیانەوە، تەماشای فتح الباری (٦/٤٨٨) بکە.

٩٧ البدایة والنهایة (٢/٤٠).

٩٨ ئەم کردەوەیە بەڵگەی فام و تێگەیشتنی موسڵمانانی ئـەو سـەردەمە، دیـارە کـە رێزگرتنـی مـردو شاردنەوەیە، جا پێغەمبەر بێ یان نا، کە سێزدە گۆڕی پەرتەوازەیان لێداوە تا خەڵك نەزانێ و دەری بێنێ چونکە دەرهێنانی تەرمەکە ئەزیەتدانی پێغەمبەرە بەڕێزەکەیە، رەنگە ئەگەر بیانزانیبایە کام گۆڕ هی ئـەوە دەیانکردە جەژنگە یاخۆ مزگـەوت و گومبـەتیان بـۆ بنیـات دەنـاو دەبـوە شـوێنی پاڕانـەوەو نزرگـەی موسـڵمانە سادەکان، وەکو ئەمرۆ کە دەبینین لـە تەواوی جیهانی ئیسـلامیدا ئەم دیاردەیە هەیە.

گوتی: بەر لەسێ سەدساڵ مردبو، گوتم: هیچی لێ گۆڕا بو؟ گوتی: نەخێر تەنها چەند دانە موێکی پشت ملی، چونکە نە زەوی‌و نە درندە گۆشتی پێغەمبەران ناخۆن. ئیبنو کەثیر دەڵێ: زنجیرەی ئەم روداوە تا ئەبوعالیە صەحیحە.

وا پێدەچێ تەرمەکە پێغەمبەر بوبێ، یاوەرانیش پێیان وابوە دانیاڵ بوە، چونکە پاشای فارسەکان دانیاڵی گرت و لەلای خۆی بەندی کرد، وا پێدەچێ مەزەندەی ئەوانەی دۆزیویانە نەیپێکابێ چونکە هەشت سەدە بەر لە ئیسلام ژیاوە، وە ئەگەر مەزەندەکەشیان راست بێ ئەوا پێغەمبەر نەبوە چونکە لە نێوان عیساو پێغەمبەر موحەممەددا ﷺ هیچ پێغەمبەرێك نەبوە، رەنگە پیاو چاکێك بوبێ، بەڵام تاسەنگ وایە پێغەمبەر بوبێ چونکە نەرزین تایبەتمەندی پێغەمبەرانە، بەڵگەی ئەم تاسەنگیەش ئەم پەرتوکەیە کە لەلای سەری بوە، گومانی تێدا نەبوە پەرتوکی پێغەمبەرێك بوە، چونکە باس کردنی شتی پەنامەکی تەنها لە سروشی ئاسمانی دایە، کە ئێمەش پێمان وایە پێغەمبەرێکی بەنی ئیسرائیل بوە لە بەر دو هۆیانە:

**یەکەم:** کە یاوەران(رەزای خوایان لێبێ) پێیان وابوە دانیاڵ بوە، رەنگە شتی‌تریان لە بارەوە زانیوە کە لەم گێڕانەوەدا باس نەکراوە.

**دوەم:** ئەم پەرتوکەی لەلای سەری بوە وا پێدەچێ بە زمانی عیبری نوسرابێتەوە، چونکە ئوبەی کوڕی کەعب پاچڤەی کردوە کە بەر لە ئیسلام جولەکە بوە.

**٧ ) له نێو گۆڕدا زندون:**

بەصەحیحی له پێغەمبەریان گێڕاوەتەوەﷺ کە فەرمویەتی: ((الأنبياء أحيـــاء في قبورهم يصلّون: پێغەمبەران لە نێو گۆڕدا زندون و نوێژ دەکەن))[٩٩]، هەروەها دەفەرموێ: ((مررت على موسى ليلة أسري بي عند الكثيب الأحمر وهو قـــائم يصلي في قـبره: لـه شـەوڕەویەکەمدا بەلای گـۆڕی موسـادا تێپـەڕیم کـه لـه نزیـك کردێکی لمی سورە، راوەستابو نوێژی دەکرد))[١٠٠].

هـەروەها ئـەبو هورەیـرە(ڕەزای خـوای لێبـێ) لـه فـەرمودەی شـەوڕەویدا دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((وقد رأيتني في جماعة من الأنبياء فإذا موســى قــائم يصلي...، وإذا عيسى بن مريم قائم يصلي، وإذا إبراهيم قـــائم يصلـــي: خـۆم لـەناو کۆمـەڵێك لـه پێغەمبـەران بینیـەوە، موسـا راوەسـتابو نوێـژی دەکـرد ، عیسـای کـوڕی مەریـەم راوەسـتابو نوێـژی دەکـرد، ئیـبراهیم راوەسـتابو نوێـژی دەکرد))[١٠١].

۞ ۞ ۞

٩٩ رواه الجماعة عن أنس (صحيح الجامع ٢/٤١٤).
١٠٠ موسلیم گێڕاویەتیەوە (كتاب الفضائل ١٦٤١)، شرح النوى على مسلم (١٥/١٣٣).
١٠١ أنظر فتح البارى ٦/٤٨٧).

# بەندی شەشەم

# پاریزراویتی پەیامبەران

ئایا پێغەمبەران لە گوناح و تاوان پارێزراون؟ ئایا پارێزراویەکەیان سەرتاسەری و سەرتاپاگیرە؟ بە پشتیوانی خوا رونیان دەکەینەوە.

## پارێزراوێتی لە هەلگرتنی پەیام و لە راگەیاندندا:

نەتەوەی موسلمانان لەوە یەکدەنگن کە پێغەمبەران لە هەلگرتنی پەیامدا پارێزراون[١٠٢]، هیچ شتێك لە (سروش) لە یاد ناکەن، مەگەر ئەوانەی خوا نەسخی دەکردنەوە، خوا هەر سروشێکی بۆ پێغەمبەرﷺ ناردبێ وای کردوە لە یادی نەکات، مەگەر شتێك خۆی مەبەستی بوبێ: ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلاَ تَنسَى، إِلاَّ مَا شَاءَ اللَّهُ: سروشت بۆ دەخوێنینەوە، هەرگیز لە یادی ناکەی مەگەر ئەوانەی کە خۆمان مەبەستمانە﴾ الاعلى/٦-٧، خوا وای کردوە سەرجەم ئەو سروشانەی کە بۆ پێغەمبەری ناردوە لە سینگیدا کۆ ببێتەوە:

﴿لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَقُرْآنَهُ، فَإِذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ: کەبۆت دەخوێنینەوە پەلەپەل مەکە لە وتنەوەی، کۆکردنەوەی سروشەکان لەناو دلتدا

---

١٠٢ چەندین زانا وتویانە یەکدەنگی لە پارێزراوی هەلگرتنی پەیامدا هەیە، تەماشای مجموع الفتاوی ٢٩١/١٠ و لوامع الأنوار البهية (٢/٣٠٤) بکە.

ئەركی ئێمەیەو لەسەر ئێمەیە بیخوێنینەوە، ئەگەر ئێمە خوێندمانەوە تۆ تەنها گوێی بۆ بگرە﴾ القیامـــة/١٦-١٨، پێغەمبەران لە راگەیاندنیشدا پارێزراون، هەر شتێكی خوا سروشی بۆ كردبن رایانگەیاندوەو نەیان شاردۆتەوە، چونكە پەیام شاردنەوە گزیكردنە، پێغەمبەرانیش مەحاڵە گزی بكەن، خوا دەفەرموێ:

﴿یاأَیُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَیْكَ مِنْ رَبِّكَ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ: ئەی پێغەمبەر هەرچی بۆت دادەبەزێ رایگەیەنە گەر وانەكەی ئەوا پەیامی خوات رانەگەیاندوە﴾ المـائدة/٦٧. خۆ ئەگەر شتێكی شاردبایەوە یا بیگۆڕیبا ئەوا سروشی تری بۆ دانەدەبەزی و توشی سزای سەختی خوا دەبو:

﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَیْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِیلِ، لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْیَمِینِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِینَ: ئەگەر پێغەمبەر قسەی زیاد بەناوی ئێمەوە بڵێ ئەوا زۆر بە توندی سزامان دەدا، شاڕەگی خوێنمان دەقرتاند﴾ الحاقة/٤٤-٤٦، مەبەستی لە فەوتاندن دێ.

لەبیر نەكردنی سروش پارێزراوێتیە تا هیچ پەیامێك نەفەوتێ، لەبیرنەكردنی راگەیاندنیش دەچێتە بەر رۆشنایی ئەم ئایەتە: ﴿سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَى﴾ الأعلـــى/٦، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە بۆ پارێزراوێتی لە راگەیاندندا كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا یَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ یُوحَى: لەخۆڕا و بەهەوەستی خۆی سروش نابێژێ، بەڵكو ئەو سروشە رادەگەیەنێ كە بۆی دادەبەزێ﴾ النجم/٣-٤.

## ئەو كارانەی لەگەڵ پارێزراوێتیدا نەسازو هاودژ نین:

ئاكارە ئەفراویەكانی مرۆڤ لەگەڵ پارێزراوێتیدا پێچەوانە نیە، ئەوەتانێ پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ كە دیتی میوانەكانی دەست بۆ خواردن درێژ ناكەن

ترسێكی كەوتە دڵ، نەیدەزانی ئەو میوانانە فریشتەن: ﴿فَلَمَّا رَأَى أَيْدِيَهُمْ لاَ تَصِلُ إِلَيْهِ نَكِرَهُمْ وَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُوا لاَ تَخَفْ إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ: كە دیتی دەست بۆ خواردن نابەن ترسێكی كەوتە دڵ، گوتیان مەترسە ئێمە فریشتەین و خوا بۆ سزادانی هۆزی لوطی ناردوین﴾ هود/٧٠، ئەوەتانێ پێغەمبەر موساﷺ بەڵێنی بە (خدر) دا ئارامی لەگەڵدا بگرێ‌و پرسیار لە هیچ كارێكی ئەو چاكەكارە نەكات تا خۆی پێی دەڵێت، كەچی خۆی نەگرت و هەر جارەی رەفتارێكی سەمەرەی لێ دەدیت یان پرسیاری لێ دەكرد یان بەرانگژی دەبۆوە یانیش ئامۆژی دەكرد،[١٠٣] هەمو جارێكیش بەندەی چاكەكار (خدر) بەبیری دەهێناوەو پێی دەگوت: ﴿قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا: ئەدی نەمگوت ناتوانی ئارامم لەگەڵدا بگری؟﴾ الكهف/٧٥، كەنهێنی كارەكانیشی بۆ دەدركاند پێی دەگوت: ﴿ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا: ئەوەبو لێكدانەوەی كارەكانم كە نەتدەتوانی ئارامیان لەسەر بگری﴾ الكهف/٨٢.

موساﷺ كە لە میقات گەڕایەوەو دیتی وا گۆلك (گوێرەكە) دەپەرستن، زۆر تورە بو و سەری براكەی گرت و رایكێشا، ئەو تەختانەی لەدەستی دابو فڕێی دا: ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفًا قَالَ بِئْسَمَا خَلَفْتُمُونِي مِنْ بَعْدِي أَعَجِلْتُمْ أَمْرَ رَبِّكُمْ وَأَلْقَى الأَلْوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأْسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُ إِلَيْهِ قَالَ ابْنَ أُمَّ إِنَّ الْقَوْمَ اسْتَضْعَفُونِي وَكَادُوا يَقْتُلُونَنِي فَلاَ تُشْمِتْ بِيَ الأَعْدَاءَ وَلاَ تَجْعَلْنِي مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ: كە موسا گەڕایەوە تورەو ئەفسوس هەڵكێش بو، گوتی بەڕاستی كارێكی تا بڵێی بەدو خراپتان لەدوای

---

١٠٣ جاری یەكەم لە ئەنجامی لەبیركردن بو، كەچی لە جاری دوەم و سێیەمدا بە ئەنقەست قسەی لێ دەكرد.

من کردوه، پەلەپەل لە فەرمانی خوا دەکەن، تەختەکانی فڕێدا پێشە سەری هاڕونی برای گرت و بۆ لای خۆی رایدەکێشا، هاڕون گوتی: کوڕی داکم! ئەم هۆزە منیان زەبون کردو خەریکبو بمکوژن، دوژمنانم پێ کەیف خۆش مەکە، منیش لە ریزی ستەمکاران دامەنێ﴾ الأعراف/١٥٠.

لە فەرمودەدا هاتوە: ((ليس الخبر كالمعاينة، إن الله تعالى أخبر موسى بما صنع قومه في العجل، فلم يلق الألواح، فلمّا عاين ما صنعوا ألقى الألواح فانكسرت: هەواڵ پێدان وەکو دیتن نیە، خوا بە موسای راگەیاندبو گەلەکەی چییان بۆ گۆلك (گوێرەکە) کردبو، بەڵام تەختەکانی فرێنەدا کەچی کە بینی وا چ بۆ گۆلکەکە دەکەن تەختەکانی فرێدا و شکان.

## لەبیرچونەوە و نەسەلماندنەکەی ئادم ﷺ:

ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((لما خلــق الله آدم مسح ظهره، فسقط من ظهره كل نسمة هو خالقها من ذريته الى يوم القيامـــة، وجعل بين عيني كل منهم وبيصاً من نور، ثم عرضهم على آدم، فقـــال أي رب مَن هؤلاء؟ قال: هؤلاء ذريتك، فرأى رجلاً منهم فأعجبه ما بين عينيه، فقـــال: أي ربّ من هذا؟ قال: هذا رجل من آخر الأمم من ذريتك، يقـــال لـــه داود، قال: ربّ وكم عمره؟ قال ستين سنة، قال: أي رب زده من عمـــري أربعـــين سنة، فلما انقضى عمر آدم، جاءه ملك الموت، قال: أو لم يبـــق مـــن عمـــري أربعون سنة، قال: أولم تعطها ابنك داود؟ قال: فجحد آدم، فجحدت ذريتـــه، ونسي آدم، فنسيت ذريته، وخطىء آدم، فخطئـــت ذريتـــه: خوا کە ئادەمی ئەفراند دەستی بە پشتی داهێنا، هەر لە ئادەم ڕا تا ڕۆژی دوایی هەر کەسێکی

ئافەریدەی بکات لە پشتی بەربۆوە، لە نێو چەوانی هەر یەکێکیان ورشەی روناکی فەراهەم هێنا، پاشان خوا هەموانی نیشانی ئادەم دا، ئادەم گوتی: خوایە! ئەمانە کێن؟ فەرموی: نەوەی تۆن، لەناو ئاپۆرەکەدا پیاوێکی دیت سەرنجی راکێشا و گوتی: خوایە! ئەوە کێیە؟ فەرموی: پیاوێکە لە ئاخری نەتەوەکان پێی دەڵێن داود، گوتی: خوایە تەمەنی چەندە؟ فەرموی: شەست ساڵ، گوتی: خوایە! لەتەمەنی من چل ساڵی تری پێببەخشە، جا کە ئەجەلی ئادەم هات و فریشتەی روحکێش هاتە لای و ویستی گیانی بکێشێ، گوتی: ئەدی هێشتا چل ساڵم نەماوە؟ ئەویش گوتی: ئەدی بەداودی کورت نەبەخشی؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئادەم نەیسەلماند بۆیە نەوەکانی نەیان سەلماند، ئادەم لەبیری چۆوە بۆیە نەوەکانی لەبیریان چۆوە، ئادەم گوناحی کرد بۆیە نەوەکانی گوناحیان کرد))[104].

## پێغەمبەرێك شارە مێرولەیەك دەسوتێنێ:

جارێکیان مێرولەیەك یەك لە پێغەمبەران دەگەزێ، ئەویش تورە دەبێ‌و شارە مێرولەکە دەسوتێنێ، ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((نزل نبيٌّ من الأنبياء تحت شجرة، فلدغته نملة، فأمر بجهازه فأخرج من تحتها، ثم أمر ببيتها فأحرق بالنار، فأوحى الله إليه: فلاّ نملة واحدة: یەك لە پێغەمبەران رۆژێکیان لە ژێر درەختێکدا دەبێ‌و مێرولەیەك دەیگەزێ، فەرمان دەکا شمەکەکانی لەوێ لادەن، ئەنجا فەرمان دەکا شارەکە بسوتێنن، خوا

---

١٠٤ ترمذی گێڕایتیەوە و دەڵێ: فەرمودەیەکی حەسەن و صەحیحە حاکمیش لە (المستدرك) گێڕایتیەوەو دەڵێ: صحيح على شرط مسلم (البداية والنهاية ٨٧/١).

سروشی بۆ هەنارد و پێی فەرمو: دەبوایە تەنها مێرولەکە سزا بدەی)) بوخاری و نەسائی گێڕایتیانەوە[105].

## پێغەمبەرمان نوێژی نیوەڕۆی بەهەڵە بە دو کڕنوش کردوە :

پێغەمبەرﷺ لە ڕەفتاری تری بێ لە ڕاگەیاندن و بەرنامەڕێژیدا شتی لە بیرکردوە، یەکێك لەوانە ئیبنو سیرین لە ئەبوهورەیرە(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (جارێکیان پێغەمبەرﷺ نوێژی نیوەڕۆی بە دو کڕنوش پێ کردین و پاشان سڵاوی داوە، ئەنجا چو پشتی خۆی بە کۆڵەگە دارێکی ناو مزگەوت دا و تورە دیاربو، دەستی ڕاستەی خستە سەر دەستی چەپەی و پەنجەکانی تێکپەڕاند، پاشان روی ڕاستەی خستە سەر پشتی دەستی چەپەی، خەڵکیش ئەوانەی پەلەیان بو خێرا لە دەرگاکانی مزگەوت دەچونە دەرەوەو دەیانگوت نوێژ کورت بۆوە، ئەبو بەکرو عومەریش لە نێو خەڵکەکە دابون، بەڵام باکیان کرد قسەی لەگەڵدا بکەن، پیاوێك هەبو بە دەست گەورە ناسراو بو (دەستەکانی درێژ بو) چوە لای پێغەمبەر و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەیادت چو یان نوێژ کورت بۆوە؟، فەرموی نە لەیادم کردوەو نەکورتیش بۆتەوە، پاشان فەرموی: ئەوەی دەست گەورە دەیڵێ ڕاستە؟ گوتیان بەڵێ، ئەنجا چوە نوێژگەکەی و دو کڕنوشەکەی تریشی کرد، پاشان تەکبیری کردو سوژدەیەکی وەکو پێشو یان درێژتری برد ئەنجا هەڵساوەو تەکبیری کرد، پاشان سوژدەیەکی تریشی وەك ئەو یان درێژتری برد، ئەنجا سەری بەرز کردەوەو تەکبیری کرد، ئەنجا گوێگران لە ئیبنو سیرینیان پرسی ئایا دوبارە سڵاوی دایەوە؟ ئەویش گوتی: پێم گوتراوە کە عیمرانی کوڕی حوصەین(ڕەزای خوای لێبێ)

١٠٥ صحيح الجامع (٥/٢٨).

وتویەتی: لەدوای سوژدەکاندا سلاوی داوەتەوە[١٠٦]، کەچی بۆ موسڵمانیش دروست نیە دەستی بخاتە سەر دەستیو تێکیان بپەڕێنێ. لە بێژانەوەیەکی تردا ئەبو هەرەیرە(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا نوێژی نیوەڕۆمان دەکرد، لە دوەم کڕنوشدا سلاوی داوە، پیاوێك لە هۆزی بەنی سولەیم گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژ کورت بۆتەوە یا لەبیرت چوە) ئەحمەدو موسلیم گێڕایتیانەوە، ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە کە ئەم روداوە لە دیداری پێغەمبەرﷺو دوای موسڵمانبونی دەستگەورە رویداوە.

لە بێژانەوەیەکی تری (متفق علیه)دا دەڵێ (فەرموی: لەبیرم نەکردوەو کورتیش نەبۆتەوە، ئەویش وتویەتی: بەڵێ لەبیرت چو)، لەمەوە دەردەکەوێ کە دەست گەورە دوای ئەوەی زانیویەتی کورت نەبۆتەوە بەشێوەی ئیسپات قسەی کردوە[١٠٧].

پێغەمبەرﷺ بەراشکاوی گوتویەتی کە وەك هەمو مرۆڤێك منیش لەبیردەکەم، ئیبنو مەسعود(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((ولكني إنما أنـــا بشر، أنسى كما تنسون، فإذا نسيت فذكـــروني: منیش مرۆڤم ئێوە ئاسا لە بیردەکەم، گەر لەبیرم کرد بەبیرم بێننەوە))[١٠٨].. ئەم وتانەی لەدوای لەبیرچونێکی یەك لەنوێژەکانی فەرموە، بەڵام هەرچی ئەو بەناو فەرمودەیە کە دەڵێ: ((إني لا أنسى، ولكـــن أنسَّـــى لأســنّ: من لەبیر ناکەم، بەڵام لەبیرم دەبرێتەوە تا پەیڕەوێك بچەسپێنم)) دروست نیە روبەڕوی فەرمودەیەکی تر بکرێتەوە، چونکە هەروەکو ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەم فەرمودەیە ئەصلی نیە،

---

١٠٦ فەرمودەیەکی (متفق علیه) یە.

١٠٧ دەقی هەموو فەرمودەکانمان لە (منتقى الأخبار)ی ئیبنوتەیمیە هێناوەتەوە، تەماشای نیل الأوطـــار (١١٤/٣) بکە.

١٠٨ رواه الجماعة إلاّ الترمذي (نيل الأوطار ١٢٥/٣).

ئیبنو حەجەر دەڵێ: ئەم فەرمودەیە ئەصلی نیە، بەڵکو لە موبالەغەکانی مالیکە کە لەدوای کۆڵینەوەیەکی زۆر و فرەوانەوە مەوصولێتی بۆ نەدۆزراوەتەوە[109]

## ڕەنگە لە دادوەریشدا هەڵەبکەن و هەق نە پێکن:

پێغەمبەران بۆ بڕیاردان لەبارەی ئەو کێشانەی کە دەبرێنە لایان ئیجتیهاد دەکەن و بەپێی بە ئەنجام گەیشتنیان بڕیار دەدەن، چونکە ئەوان نازانن پەنامەکی چۆنە، ڕەنگە هەق نەپێکن، بەوێنە پێغەمبەر داود(ع) لە حوکمێکدا هەقی نەپێکا، بەڵام سلێمانی کوڕی بەیاریدەی خوا سەرکەوتنی هێنا.

ئەبو هورەیرە(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرمو: ((كانت إمرأتان معهما ابناهما، جاء الذئب بابن إحداهما، فقالت لصاحبتها: إنما ذهب بابنك، وقالت الأخرى: إنما ذهب بابنك، فتحاكمتا إلى داود، فقضى به للكبرى، فخرجتا به على سليمان بن داود، فأخبرتاه، فقال: إئتوني بالسكين أشقه بينهما، فقالت الكبرى: لا تفعل يرحمك الله، هو ابنها، فقضى به الصغرى: دو ژن بەیەکەوە بون، هەریەکەو منداڵی خۆیانیان لەلادا بو، گورگ هات منداڵێکی ڕفاند، دایکەکەی بەوەی تری گوت: منداڵی تۆی ڕفاند، ئەوەی تریش گوتی: نەخێر: هی تۆی ڕفاند، کێشەیان بردە لای داود، ئەویش حوکمی بۆ ژنە گەورەکە دا، پاشان چونە لای سلێمانی کوڕی داود و کێشەکەیان بۆ ڕانواند، ئەویش گوتی: چەقۆیەکم بۆ بێنن تا منداڵەکەی پێ بکەمە دو لەت و یەکەو لەتێکتان بدەمێ، ژنە گەورەکە گوتی: شتی وا نەکەی،

---

109 نيل الأوطار (٣/١١٧).

خوا میهرەوەرت بکا، منداڵەکە هی ئەوە، ئەنجا ئەویش حوکمی بۆ ژنە بچوکەکە دا))[110].

پێغەمبەرمانﷺ ئەم مەسەلەیەی رۆشن کردۆتەوە، دایکی سەلەمە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: رۆژێکیان گوێی لەدەنگی کێشەیەك بو کە لەبەر دەرگای ژورەکەی مشتومڕیان بو، بەرێزی چوە دەرەوەو فەرموی: ((إنما أنا بشر، وإنه يأتيني الخصم، فلعلَّ بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض، فأحسب أنه صادق، فأقضي له بذلك، فمن قضيت له بحق مسلم، فإنما هي قطعة من النار، فليأخذها أو ليتركها: ئەمنیش مرۆڤم، کە کێشەم دێننە لا رەنگە هی واتان هەبێ پاساو و بەڵگەی بەهێزتر بێنێتەوەو من بەڕاستی دابنێم و حوکم بەلای ویدا بدەم، ئاگاداربن ئەوەی مافی موسڵمانێکم بۆ بڕیارداو بۆی رەوا نەبو، ئەوا بزانن کڵپە ئاگرێکە جا یان وەریگرێ وەیان با وازی لێ بێنێ))[111]، ئەوانەی ئەم جۆرە ئاکارە ئەفراویانە ناسەلمێنن دژی ئایەت و فەرمودەن؟.

شیعەی دوازدە ئیمامی پێیان وایە پارێزراوێتی وا دەخوازێ کە نابێ پێغەمبەران هەڵەو لەبیرچونەوەو گوناح و ترس و شتیتری مرۆڤانەیان لێ روبدات، دیارە ئەم بۆچونە لەگەڵ دەقی ئەو ئایەت و فەرمودانە پێچەوانەیە کە گۆڕین و واتاوێڵی هەڵناگرن، ئەتۆش-براکەم-بەگوێرەی قورئان و سوننەت برۆ چونکە رێنوێنیت لەوێوەیە.

---

١١٠ صحيح البخاري-كتاب أحاديث الأنبياء-باب قوله تعالى: ﴿وَوَهَبْنَا لِدَاوُودَ سُلَيْمَانَ﴾ ص/٣٠، (فتح الباري ٦/٤٥٨).

١١١ رواه البخاري-كتاب المظالم-باب إثم من خاصم في الباطل (فتح الباري ٥/١٠٧).

# پاریزراویتی لە گوناحان

## ئەو کارە دزێوانەی جولەکە بە پێغەمبەرانیان هەڵبەستاوە:

جولەکـەکان زۆر کـاری ناشـیرین و نـاقۆڵاو نابـەجێیان بـە پێغەمبـەران هەڵبەستاوە کە ئەمانە هەندێکیانن:

١. (هارونی پێغەمبەری خوا گوێرەکەیەکی دروست کرد و لەگەڵ بەنی ئیسرائیلدا دەیپەرست) ئیسحاحی (٣٢)ی ژمارە یەکی سیفری خروج، قورئان ئەم درۆیەی پوکەڵ کردۆتەوە و پێی راگەیاندوین کە ئەو کەسەی پەیکەری گۆلکێکی بە قۆرەقۆڕی دروست کرد (سامری) بو، بەڵکو هارون بەرهەڵستی لێکردون.

٢. (ئیبراهیمی خۆشەویستی خوا سارەی ژنی بردۆتە لای فیرعەون، تاوەکو بەهۆیەوە قازانج وەدەست بێنێ) ئیسحاحی (١٢)ی ژمارە (١٤)ی سیفری تەکوین، هەڵبەت ئەم وتەیە قسەیەکی ناڕاستەو بە پێغەمبەر ئیبراهیمیان هەڵبەستوە، پێغەمبەرﷺ سەربردەکەی بۆ گێڕاوینەوە کە دەفەرموێ: کاتی خۆی کە پێغەمبەر ئیبراهیم چوە میسر، پاشایەکی ستەمکار و ملهوری لێ بو، هەر ئافرەتێکی جوانی مێرداری دیتبا، مێردەکەی دەکوشت و ژنەکەی بۆ خۆی دەبرد، کە لە ئیبراهیمی پرسی ئەوە چی تۆیە؟ گوتی: خوشکمە، واتە لەئیسلامدا خوشکیەتی، هەروەها پێغەمبەرﷺ باسی ئەوەشی کردوە کە سارە چۆتە لای ئەم ستەمکارە، خوا پاراستویەتی و ئازاری پێ نەگەییوە.

٣. (لوط عەرەقی خواردۆتەوە تا سەرخۆش بوە، پاشان چۆتە گژ هەردو کچەکەی و یەک لە دوای یەک زینای لەگەڵدا کردون) ژمارە (٣٠)ی

ئیسحاحی (١٩)ی سیفری تەکوین، لەبوختانی وا پەنا بەخوا، ئەو لوطەی کە پێغەمبەری خوایەو بەدرێژایی ژیان دژایەتی کاری نائەسەندو دزێو و بانگەوازی بۆ رەوشتبەرزی کردوە، مرۆڤ چۆن دەوێری ... بەلای ئەم بوختانانەدا ببات! بەڵام رق و کینەی جولەکان پێغەمبەرانیشی گرتۆتەوە، هەی نەفرەتی خوایان لێ بێ.

٤. (یەعقوب چەند رانە مەڕێکی لە خاوەنەکەی دزی، وە بەخۆ بە خێزانی بەدزی ئەوێیان جێهێشت بێئەوەی بە خاوەنەکەی بڵێن) ژمارە (١٧)ی ئیسحاحی (٣١)ی سیفری تەکوین.

٥. (راوبین زینای لەگەڵ ژنی یەعقوبی باوکی کرد، یەعقوبیش بەم کارە دزێوەی زانی بەڵام خۆی کڕ کرد) ژمارە (٣٢)ی ئیسحاحی (٣٥)ی سیفری تەکوین.

٦. (داود زینای لەگەڵ ژنی سەرکردەیەکی لەشکرەکەی کرد، پاشان پلانێکی بۆ داناوە تا بیکوژێ، سەرکردەکەی کوشت و ژنەکەی کردە ژنی خۆی و سلێمانی لێ بو) ژمارە (١)ی ئیسحاحی (١١)ی سیفری صمؤیل.

٧. (سلێمان لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیدا هەڵگەڕاوەو دەستی کردە بتپەرستی و چەندین پەرستگای دروست کرد) ژمارە (٥)ی ئیسحاحی (١١)ی سیفری ملوك.

بەڵێ، ئەوانە بەشێك بون لەو هەمو تۆمانج و قسە دزێو و ناجورانەی کە جولەکە نەگریسەکان بە پێغەمبەرانیان هەڵبەستاوە، هەڵبەت پێغەمبەران لەو جۆرە ناپەسندیانە پاك و دورن، بەڵام دەرونی نەگریس و هزری گەندەڵی نامەردان لەبەر ئەوە بوختان و هەڵبەستەی وا بانگەشە دەکات تاوەکو بیکاتە پاساوی رەفتاری هیچ و پوچ و تاوانەکانی.

## دیانەکانیش ڕەفتاری درێو و تۆمانجیان بە پێغەمبەران هەڵبەستاوە:

خۆ دیانەکان لە جولەکەکان باشتر نین، ئەوانیش بوختان و بەندوباوێکی زۆریان بە پێغەمبەران هەڵبەستاوە، بێ لەوانەی باسمان کرد چەندین نارەوای تریان هەڵبەستاوە، ئەوەش چونکە بڕوایان بەو ئینجیلە گۆڕاوەی بەردەستیان هێناوە، هەندێ لەم بوختانانە ئەمانەی خوارەوەن:

١. ئینجیلی مەتتێ دەڵێ: (عیسا لە نەژادی سلێمانی کوڕی داودە، کە باپیرەیان لە نەژادی زینای یەهوذای کوڕی یەعقوبە) ژمارە (١٠)ی ئیسحاحی یەکەمی ئینجیلی مەتتێ.

٢. لە ژمارەی (٤)ی ئیسحاحی (٢)ی ئینجیلی یۆحەننادا دەڵێ: (یەسوع لە نێو کۆمەڵە خەڵکێك دایکی خۆی ریسوا کردوە)، کەچی قورئان دەفەرموێ: ﴿وَبَرًّا بِوَالِدَتِي﴾ مریم/٣٢.

٣. (یەسوع گەواهی داوە کە سەرجەم پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل دزو جەردە بون) ژمارە (٨)ی ئیسحاحی (١٠)ی ئینجیلی یۆحەننا.

ئەوانەی هێنامانەوە مشتێکی خەروارێك بون کە لە ئینجیلی گۆڕاودا بە دەیان و سەدان بوختان و درۆ و دەلەسەی تری لەم جۆرە دەدۆزیەوە، بەڵام پێغەمبەران پاکترین و چاکترین و بێ پەڵەترینی خەڵکن لەو هەمو هاشەهاش و چاپ و گوپانە بێبەرین[١١٢]، سوێند بەو خوایە ئەوانە لەو قسانەیاندا درۆ دەکەن.

---

١١٢ هەمو ئەو دەقانەی هێنرانەوە لە پەرتوکی (محمد نبي الإسلام ل ١٤٥) وەرگیراوە، بۆ پتر ئاشنابون هەر بۆ ئەو پەرتوکە لاپەرە ١٤٦ بگەڕێوە.

## هەڵوێستی نەتەوەی ئیسلامی لە ئاست پارێزراوێتی پێغەمبەران لەم گوناحانە:

نەتەوەی ئیسلامی لەوە یەکدەنگن کە ئەو تاوان و گوناح و کارە دزێوانەی وەکو زیناو دزیو گزیکاری و بتپەرستیو تاد، کە جولەکەو دیانەکان بە پێغەمبەرانیان هەڵبەستاوە راست نین و بەهیچ جۆرێك لە شان و شکۆی پێغەمبەران ناوەشێنەوە و لێیان رونادات و پێغەمبەران لەم جۆرە کارانە پارێزراون.

## پارێزراوێتی لە گوناحە بچوکەکان

زۆرینەی زانایانی ئیسلام بۆچونیان وایە کە پێغەمبەران لە وردە گوناحان پارێزراو نین، ئیبنو تەیمیە دەڵێ: قسەی زۆربەی زانایانی ئیسلام و هەمو چینەکان تەنانەت زۆربەی کەلامناسەکانیش ئەوەیە کە پێغەمبەران لە وردە گوناحان نەبێ گینا لە تەواوی گوناحە گەورەکان پارێزراون، ئەبولحەسەنی ئامێدی دەڵێ: قسەی زۆرینەی ئەشعەریەکانیش وایە، هەروەها قسەی زۆربەی تەفسیرزان و فەرمودەناس و فەقیهەکانیش هەر وایە، پاشان هەر وتەیەکی پێشینان و پێشەوا و یاوەرو شوێنکەوتوان لەم بارەوە کرابێ لەگەڵ ئەم قسەیە تێکی کردۆتەوە و پێچەوانەی نەبوە [١١٣]، جەماوەری زانایان چەندین بەڵگەیان لەم بارەوە هەیە:

١) فەرمان شکاندنەکەی ئادەم(سلاوی خوایان لەسەر بێت) کە لە بەری ئەو درەختەی خوارد کە خوا بەرهەڵستی لێ کردبو: ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَائِكَةِ اسْجُدُوا

١١٣ مجموع فتاوی شیخ الإسلام (٣١٩/٤).

لآدَمَ فَسَجَدُوا إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبى، فَقُلْنَا يَاآدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلاَ يُخْرِجَنَّكُمَا مِنْ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى، إِنَّ لَكَ أَلاَّ تَجُوعَ فِيهَا وَلاَ تَعْرَى، وَأَنَّكَ لاَ تَظْمَأُ فِيهَا وَلاَ تَضْحَى، فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ الشَّيْطَانُ قَالَ يَاآدَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَى شَجَرَةِ الْخُلْدِ وَمُلْكٍ لاَ يَبْلَى، فَأَكَلاَ مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْآتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِنْ وَرَقِ الْجَنَّةِ وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى: **فەرمانمان بە فریشتان کرد کە سوژدە بۆ ئادەم ببەن، سەرجەمیان سوژدەیان برد تەنها ئیبلیس نەبێ چونکە فیزی زل کرد، گوتمان: ئادەم! ئەو ئیبلیسە دوژمنی خۆت و ژنەکەتە، لە بەهەشتتان دەرنەکات ئەوجا توشی ئەرك و نەستەم بیت، تۆ لەبەهەشتدا قەت برسی و روت و تێنو و تاوەنگاز نابیت، بەلاّم شەیتان وەسوەسەی خستە دڵ و گوتی: ئادەم! درەختی نەمرو دارایی نەبڕاوەت پێ نیشان بدەم؟ ئەوانیش لەبەری ئەو درەختەیان خوارد و شەرمگەیان وەدیارکەوت، بە پەلەپرۆزێ پەلك و گەلاّی درەختەکانیان لەخۆ دەهالاّند، ئادەم کە لەبەری ئەو درەختەی خوارد سەرپێچی لە فەرمانی خوا کرد، بە هۆی ئەمەوە لە راستەڕێ لایداو لەبەهەشتێ دەرکرا﴾** طه/١١٦-١٢١، **ئەم ئایەتە بە ئەوپەڕی راشکاوی ئەوە رادەگەیەنێ کەئادەم سەرپێچی کردوە.**

**٢) پێغەمبەر نوح﷣ لە پێناو کوڕە بێبڕواکەی لە خوا پاڕاوە:** ﴿وَنَادَى نُوحٌ رَبَّهُ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ابْنِي مِنْ أَهْلِي وَإِنَّ وَعْدَكَ الْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ الْحَاكِمِينَ: **نوح هاواری بردە لای خواو وتی: پەروەردگار! خۆ کوڕەکەشم لە خانەوادەی منە، بەڵێنی تۆش راست و رەوایە، تۆ دادوەرترینی دادوەرانی﴾** هـود/٤٥، **بەلاّم خوای گەورە سەرزەنشتی کردو پێی فەرمو: ئەم کوڕە لە خانەوادەی**

ئەو نیەو کرداری پەسند نەبوە: ﴿قَالَ يَا نُوحُ إِنَّهُ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ فَلَا تَسْأَلْنِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنِّي أَعِظُكَ أَنْ تَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ: خوا فەرموی: نوح! ئەم کورەت لە خانەوادەی تۆ نەبو چونکە کردەوەی چاك نەبو و بێبڕوابو، داوای شتێکم لێ مەکە نەیزانی، من ئامۆژت دەکەم لە نەفامان نەبی﴾ هود/٤٦، ئینجا نوح ژیوان بۆوەو لێبوردنی لە خوا خواست تا لە گوناحەکەی خۆش ببێ: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْأَلَكَ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي أَكُنْ مِنَ الْخَاسِرِينَ: نوح گوتی: خوایە من پەنا بە تۆ دەگرم لەوەی داوای شتێکت لێ بکەم زانیاریم دەربارەی نەبێت، ئەگەر نەمبوری و میهرەبانیم لەگەڵدا نەنوێنی لەریزی دۆڕاوەکانم ﴾ هود/٤٧، ئەم ئایەتە بەراشکاوی رادەگەیەنێ کە نوح﷤ گوناحێکی کردوەو شایەنی لێبوردنخوازیە: ﴿وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِي ﴾ هود/٤٧.

٣) پێغەمبەر موسا﷤ ویستی یارمەتی هاوهۆزەکەی بدات و تا گرتی بۆکسێکی لە رکەبەرە قیبطیەکە دا و کوشتی: ﴿قَالَ هَذَا مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ عَدُوٌّ مُضِلٌّ مُبِينٌ، قَالَ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ: گوتی ئەمە کاری شەیتان بو، شەیتان دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە، گوتی: خوایە ستەمم لە خۆم کرد لێم ببورە، خوا لێی بوری، خوا لێبوردەو میهرەبانە﴾ القصص/١٥-١٦، ئاشکرایە موسا دانی نا کە ستەمی لەخۆ کردوەو داوای لە خودا کرد لێی ببورێ، خوداش پێی راگەیاند لێی بوریوە.

٤) پێغەمبەر داودﷺ بەر لەوەی قسەی لایەنی دوەم لە کێشەیەك وەرگرێ بڕیاری دا، بەڵام پاشان دەستبەجێ پەشیمانی دەربڕی و خواش لێی خۆش بو: ﴿فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ، فَغَفَرْنَا لَهُ ذَٰلِكَ: داود داوای لێبوردنی لەخودا کرد و کڕنوشی بۆ خوا بردو ژیوان بۆوە، ئێمەش گوناحەکەمان بوری﴾ ص/٢٤-٢٥.

٥) خوا چەندین جار سەرکۆنەی پێغەمبەرمانی کردوەﷺ: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاةَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ: ئەی پێغەمبەر بۆچی ئەوەی خوا بۆی حەڵاڵ کردوی لەسەر خۆتی حەرام دەکەی و دەتەوێ خێزانەکانت لەخۆ رازی بکەی، خوا لێبوردەو میهرەبانە﴾ التحريم/١، ئەنگێزەی دابەزینی ئەم ئایەتە لەبەر ئەوە بو پێغەمبەرﷺ هەنگوین یان ماریەی قیبطی خێزانی لە خۆی حەرام کردبو.. هەروەها کە روی لە عەبدوڵڵای کوری ئوم مەکتوم گرژ کردو بەهۆی خەریکبونی لەگەڵ سەرسەختەکانی قورەیش کە بۆ ئیسلام بانگی دەکردن ئاگای لەو کوێرە خواویستە برا: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّى، أَنْ جَاءَهُ الأَعْمَى، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى، أَوْ يَذَّكَّرُ فَتَنْفَعَهُ الذِّكْرَى: روی گرژ کردو روی وەرسوراند کە پیاوە کوێرەکە هاتە لای، تۆ چوزانی بەڵکە دەیەوێ پاك بێتەوە یاخۆ یادەوەر بێ و ئامۆژ دادی بدات.﴾ عبس/١-٤.. هەروەها پێغەمبەرﷺ فدیەی لە یەخسیرەکانی شەڕی بەدر وەرگرت، لەم بارەوە خوا هەڕەشەی کردو فەرموی: ﴿لَوْلَا كِتَابٌ مِنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ: ئەگەر لەبەر نوسراوی پێشتر نەبوایە

که خوا له گوناحی پێش و پاشی بەشدارانی بەدر خۆش ببو ئەوا توشی سزایەکی سەختم دەکردن ﴾ الأنفال/٦٨.

پێمان وایە ئەوەندە وێنانەی هێنامانەوە ئامانج دەپێکێ، ئەگینا قورئان زۆر نمونەی تری تێدایە، وەکو تورەبونی پێغەمبەر یونس ﷺ، کە بەبێ ودمی خوا گەلەکەی بەجێ هێشت، هەروەها ئەو تاوانەی براکانی یوسف لەگەڵ یوسفیان کرد کە پاشان خوا سروشی بۆ ناردن و بونە پێغەمبەر.

## ئەوانەی پێیان وایە پێغەمبەران لە وردە گوناحان پارێزراون:

هەندێ تۆژەر پێیان وایە کارێکی زۆر ناقۆلاً و تاوانێکی گەورەیان کردوە ئەگەر گوناحی بچوك بدەنە پاڵ پەیامبەران[114] کە لە قورئان و فەرمودەدا یاد کراون، پێیان وایە تانەو تەشەریان لە پێغەمبەران داوە، بۆیە -هەروەکو ئیبنو تەیمیە دەڵێ- دەقەکان واتاوێڵ دەکەن، رەنگە واتاوێڵیەکەیان بگاتە پلەی دەست تێوەردان و گۆڕین، بەڵام باشتر وایە ئەوانە بەراستەقینەی خۆی لە مەسەلەکان بگەن و رێزی ئایەت فەرمودان بگرن، بیروباوەڕیان لە قورئان و فەرمودە هەڵێنجن و بە پێودانی ئەوان بڕیار دەربکەن، چونکە ئەو واتاوێڵی و واتاگۆڕینانەی بۆ ئایەتی راشکاو دەکرێن، لە رێ دەرچون و ئارەزوپرانیەوە. ئەم جۆرە واتاوێڵیانە لەلای نوسەرە هاوچەرخەکان بەشێوەیەکی بەرفرەوان پەیڕەوی لێ دەکرێ، هەروەکو ئیبنو تەیمیە دەڵێ: واتاوێڵی گەندەڵن وەکو واتاوێڵیەکانی باطنی و جوهمیەکان.

---

114 شیعەی دوازدە ئیمامی یەکدەنگن لەوەی کە پێغەمبەران و ئیمامەکانیان توشی گوناحی بچوکیش نابن، بگەرێوە بۆ عقائد الإمامية-محمد رضا ل ٨٠، ٩٥، عقائد الإمامية الاثنى عشرية-إبراهيم الموسوى الزنجاني ل ١٥٧.

## دو گومان:

ئەوانەی دەڵێن پێغەمبەران لە وردە گوناحان پاکن، دو گومان قیت دەکەنەوە کە ئەمانەن:

یەکەم: خـوا فـەرمانی پـێ کردویـن پێغەمبـەران بکەینـە سـەر مەشـق و پەیڕەویان لێ بکەین: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ الأحـزاب/٢١، هەڵبـەت ئـەم پێشـەنگیە سـەرجەم پێغەمبـەرانیش دەگرێتـەوە، فـەرمانی پەیڕەوکردن کردارو گوفتارو بیروباوەڕ و تـەواوی پەرستکاریەکان دەگرێتـەوە، کەواتە ئەگەر پێغەمبـەران توشی گونـاحی گچکـە بـبن ئـەوا ناسـازی لێ پـەیدا دەبێ، چۆن دەکرێ خوا فەرمان و بەرهەڵستی (ئەمر و نـەهی) بـۆ یـەك شـت بکات، ئێمەش دەڵێین: جا ئەگەر گوناحەکانی پێغەمبەر نادیار و شاراوە بان و ئەژنەوا بون و نا ئەژنەوابیان لە ئێمە تێکەڵ کردبا ئەوا قسـەکەیان بەڕاسـت دەردەچو، بەڵام ئاوەها نیە، چونکە خوا دەستبەجێ و یەکسەر پێغەمبەرانی لە سـەرپێچی ئاگـادار کردۆتـەوەو وای لێکـردون ژیوانـی دەربـڕن، کەواتـە بۆچونەکەیان نەپێکاوە، بەڵکو دەبێ لەوەدا بەپێشەنگیان بزانین کە پەلەیان لە ژیوانبونەوەکە کردوەو دوایان نەخستوە، ئێمەش چاو لەم بەرێزانە بکەین.

دوەم: ئەوانە وادەزانن گوناحکردن ئەگەر چی ژیوان دەربڕینیشی لەگەڵدا بێ بە کـەموکوڕی هـەژمار دەکـرێ، هەڵبـەت ئـەم بۆچونـە راسـت نیـە، چونکـە ژیوانبونەوە گوناح و تاوان رەش دەکاتەوەو لەگەڵ تەواومەندێتیدا ناکۆك نیە، گوناحکارەکەشی پێ سەرزەنشت ناکرێ، بەڵکو زۆر جاران بابای ژیوان لەداوی پەشیمانیەکەی باشتر دەبێ وەك لە پێش گوناحەکـەی، چونکـە ئەفسـوس هەڵدەکێشێ و ترسی خوای دەچێتە دڵ و لە خوا دەپاڕێتەوەو داوای لێبوردن

دەکات و هەر کردەوەیەکی چاکیش دەکات بەهومێدە خوا گوناحەکانی پێ ڕەش بکاتەوە، هەندێ لە پێشینانی چاکمان وتویانە: پێغەمبەر داود ﷺ لەدوای ژیوانبونەوەکەیدا زۆر چاکتر بو وەك لەپێشدا، یەکێکی تر دەڵێ: ئەگەر خوا ژیوانبونەوەی لەلادا خۆشەویست نەبوایە ئەوا چاترینی ئافەریدانی پێ گرفتار نەدەکرد.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی صەحیحدا باس لەوە دەفەرموێ کە خوا بە ژیوانبونەوەی ئەو بەندەیە زۆر شادە کە وشترەکەی بە نان و ئاوەوە لە بێرونێکدا بزر دەبێ، ئیتر ئەویش لێی بێ هومێد دەبێ‌و لە خەمان لێی دەخەوێ؛ کە واگا دێت دەبینێ وا وشترەکەی بەسەر سەریەوە راوەستاوە، کابرا لەخۆشیان هەڵە دەکات و دەڵێ خوایە تۆ بەندەمی و من خوانم.

هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ: خوا ژیوان و پاکەوەرانی خۆش دەوێت﴾ البقرة/٢٢٢، خوا لە ئایەتێکی تردا باس لە خەڵاتی ژیوانان دەکات و دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ : مەگەر ئەوانەی ژیوان بونەوەو بڕوایان هێناو کردەوەی چاکیان ئەنجام دا، ئەوانە خوا خراپەکانیان بە چاکە دەنوسێ﴾ الفرقان/٧٠، لە رۆژی ژیانەوەدا خوا پەنای بەندەکەی دەداو یەك یەك تاوانەکانی بۆ هەڵدەژمێرێ، بەجۆرێك بەندەکە وا بزانێ ئیتر فەوتا ئینجا خوا پێی دەفەرموێ: ئەوە هەرهەموم بۆ کردی بە چاکە، ئینجا بەندەکە داوا لە خوا دەکات ئەو تاوانە زلانەی پێ نیشان بدات کە ترسی هەبو ئاشکرا بن، بێ گومان باری ئەم بەندەیە لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریەدا زۆر باشترە وەك لە پێش گوناحکردن و گۆڕانکاریەکەدا، هەڵبەت پێغەمبەران هەر گوناحێکیان لێ رو دابێ یەکسەر بەبێ

دواخستن ژیوان بونەتەوەو داوای لێبوردنیان کردوە. قورئان بەڵگەیە، ئەوەتانێ ئادەم و ژنەکەی کە سەرپێچیان کرد یەکسەر ژیوان بونەوەو گوتیان: ﴿قَالاَ رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِنْ لَمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ: پەروەردگارمان! ستەممان لە خۆ کرد خۆ ئەگەر نەمانبوری و میهرەوەرمان نەکەی خۆمان لەریزی دۆڕاوان دەدۆزینەوە﴾ الأعراف/٢٣، هەروەها کە پێغەمبەر موسا عليه السلام کە بۆکسەکەی لە پیاوە قیبطیەکە دا هێشتا کابرا بەرنەببۆوە داوای بەزەیی‌و لێبوردنی خوای کردو گوتی: ﴿رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي: خوایە ستەمم لە خۆ کرد بمبورە﴾ القصص/١٦، پێغەمبەر داود عليه السلام هەر هەستی بە گوناح کرد یا نەکرد کرنوشێکی برد و داوای لێبوردنی کرد: ﴿فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ﴾ ص/٢٤، پێغەمبەران لە گوناحکاریدا سەقام ناگرن و بێئەوەی ساردی بنوێنن گەرماو گەرم ژیوانی دەردەبرن، خوا بەم جۆرە پاراستونی، کە ژیوانیش بونەتەوە لە پێشتر چاکتر بونە.

بەڵێ بەرێزان! ئەم دو گومانە بۆیە نەیانتوانیوە خۆیان راگرن و هەرەسیان بردوە، روی کۆری بەڵگەبرییان نیەو سوارچاکی مەیدانێ نین، ئەوەندە بەڵگەی لەم بارەوەش هێناومانە بۆ رێنوێنیخوازان بەسە.

## گوناحکردن بەڵگەی مرۆڤێتیە:

پێغەمبەرانیش وەك مرۆڤانی تر مرۆڤن، خوا لە هەڵگرتنی پەیام و راگەیاندندا پاراستونی و وتەیەك چیە لێیان کەم نەکردۆتەوە، بۆیە پەیام و سروشی خوا بەتەواوی و بێ کەم و کورتی وەك خوا ویستویوتی گەیشتۆتە

بەندەکان، بەڵام ئەم پارێزراوێتیە تەواوی کارەکانیان ناگرێتەوە، رەنگە جارجارە لەبەر ئەوەی مرۆڤن گوناحێکی بچوك بکەن، بەڵام پاشان رەحمی خوایان دەگاتیۆ لە گوناحەکەیان ئاگادار دەکاتەوەو هەڵیاندەنێ ژیوان و پەشیمانی دەربرن، شێخ موستەفای موراغی شێخی زانکۆی ئەزهەر دەڵێ: سروش هاودەمی هەمو کارو وتەیەکی پێغەمبەران نیە، ئەوانیش لەبەر ئەوەی کە مرۆڤن رەنگە گوناح بکەن، بەڵام لەوەدا جیاوازن لەگەڵ مرۆڤانی تر کە خوا وا ناکات لەسەر گوناحەکە سەقام بگرن، بەڵکو یەکسەر ئاگاداریان دەکاتەوەو رەنگە سەرکۆنەشیان بکات"[115].

## رێزنان لە پێغەمبەران:

ئەو وردە گوناح و هەڵە بچوکانەی پێغەمبەران کردویانە نابێ بکرێنە هۆی تەشەر لێدان و بەسوك سەیر کردنیان چونکە گوناحەکان چەند کارێکی ورد و سنوردارن و خوا لێیان خۆش بوە و پاکی کردونەتەوە، موسڵمانانیش دەبێ پەند و ئامۆژیان لێ وەرگرن، مادەم خوا لەسەر ئەم گوناحانە پێغەمبەران سەرزەنشت بکات، ئێمە دەبێ زێتر وریا بین و بترسین، دەبێ لەوەش بیانکەینە پێشەنگ کە بە پەلە ژیوان بینەوە و پەشیمانی دەربڕین و زۆر داوای لێبوردن بکەین.

## پارێزراوێتی بۆ نا پێغەمبەران:

یارانی رێبازو کۆمەڵ (اهل السنة والجماعة) لە پێغەمبەران بترازێ پارێزراوێتی بۆ هیچ کەسێکی تر بڕیار نادەن، تەنانەت ئەبوبەکر و عومەر و

---

١١٥ حیاة محمد-هیکل تەماشای پێشەکی پەرتوکەکە بکە کە بە پێنوسی شێخ موراغی نوسراوە ل ١١.

یاوەرانیش کە چاترینی ئەم نەتەوەیەن. پێشەوا ئەبوبەکر لە دوای وەرگرتنی ئەرکی جێنشینایەتی لە یەکەم وتاریدا بە خەڵکەکەی گوت: هۆ خەڵکینە! من کە کراوم بە جێنشین ئەوە ناگەیەنێ لە ئێوە چاتر بم، ئەگەر کارێکی چاکم کرد هەرەوەزیم لەگەڵدا بکەن، ئەگەر هەڵەیەکیشم کرد راستم بکەنەوە، عومەری پێشەوا و جێنشینیش کاتێك پیرەژنێك رەخنەی لێگرت و بەڵگەی بۆ هێنایەوە گوتی: ئافرەتێك راستی فەرمو و عومەر هەڵەی کرد.

## پارێزراوی موعیززی فاطیمی:

شوێنکەوتوانی (ئەلموعیزز مەعدی کوڕی تەمیمی) کە هەندێ خەڵك پێی دەڵێن: (ئەلموعیزز لدین الله الفاطمي) پێیان وایە خۆیو منداڵەکانی لە گوناح و هەڵەکردن پارێزراون، هەڵبەت قسەیەکی ناڕاست و پوکەڵەو تەنها بۆ ئەوەیان بوە خەڵکی پێ چەواشە بکەن و ناوبراوی پێ بکەنە پێغەمبەرو هەرچی بڵێ وەکو دین وەریگرن، ئەگەر نا ئەو ئەلموعیززە و ئەوانەش کە بە فاطیمیەکان ناویان دەرکردوە هیچیان لە نەژادی خاتو فاطیمە(رەزای خوای لێبێ) نین، بەڵکو بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر عوبەیدوڵای قەدداح، ئەوانە پارێزراوێتیان بۆ پێشەواکانیشیان بڕیار دەدا، ئەبو حامیدی غەزالی لەو پەڕتوکەدا کە بۆ بەرپەرچی ئەوان داینـاوە دەڵێ: لە رواڵەتی بۆچونەکانیاندا رافزین، لە ناوەرۆکیشدا بێبڕوای رەهان[١١٦].

---

١١٦ مجموع فتاوى شيخ الإسلام ٤/٣٢٠.

## پارێزراویتی پێشەوایان:

شیعە پێیان وایە دوازدە پێشەواکەیان[117] لە هەڵەو گوناح پارێزراون، ئەو پارێزراویەی مەبەستیانە هەمان ئەو پارێزراویەیە کە بۆ پێغەمبەران بڕیاری دەدەن، یەکێك لە رابەرە هاوچەرخەکانی شیعە تێگەیشتنی شیعە لەبارەی پارێزراویتیدا رون دەکاتەوە و دەڵێت: رەچاوی هەڵەو بێئاگایی لە پێشەواکانمان ناکەین، بیروباوەڕیشمان وایە پەی بە تەواوی بەرژەوەندیەکانی موسڵمانان دەبەن[118]، ئیبراهیمی موسەوی زەنجانی وتەیەکی صەدوق دێنێتەوە کە دەڵێ: بیروباوەڕی ئێمە لەبارەی پێغەمبەر و پێشەواو فریشتان ئەوەیە کە لە هەمو پیسیەك پاکن و گوناحی گچکە و گەورەش ناکەن و لە فەرمانی خوا دەرناچن و چییان پێ بگوترێ ئەو دەکەن[119]، هەر هێندەش نا بەڵکو ئەوانەش بە بێبڕوا هەژمار دەکات کە پێشەواکانیان بە پارێزراو دانانێت! هەر لەدوای قسەکەی پێش ئێستادا دەڵێت: هەر کەسێکیش نەریێ لە پارێزراویتیان بکات ئەوا بە نەفامی داناون ئەوەی بە نەفامیشیان دابنێ بێبڕوایە[120]، پاشان دەڵێ: بیروباوەڕمان وایە کە پارێزراون بە تەواومەندێتیو زانینی پێشین و پاشینی کارەکانیان سیفەتمەندن، هیچ ژیوارێکیاندا کەمایەسی و سەرپێچی تێدا نیە[121]، ئەلمەجلیسی دەڵێ: هاوڕێبازە ئیمامەکانمان لەوە یەکدەنگن کە پێغەمبەر و پێشەواکان لە گوناحی گچکە و گەورەی ئەنقەست و هەڵە و لەبیرکردن پارێزراون، چ بەر لە پێغەمبەرایەتی و پێشەوایەتی چ لە پاشان،

---

117 هەر لە عەلی ئەبوتالیبەوە تا موحەممەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری کە بە مەهدی مونتەزەر ناوی دەبەن (وەرگێر).

118 الحکومة الإسلامیة للخمیني ل ٩١.

119 عقائد الإمامیة الإثني عشریة ل ١٥٧.

120 هەمان ژێدەر.

121 هەمان ژێدەر.

بەڵکو هەر لەو کاتەی لە دایك دەبن پارێزراون تاوەکو بەدیداری خوا دەگەن، کەس نەبوە لەم بۆچونە لاری هەبوبێ تەنها صەدوق: موحەممەدی کوڕی بابەوێ و ئیبنولوەلیدی شێخەکەی نەبێ، چونکە ئەوان پێیان وایە لەو شتانە نەبێ کە پەیوەندی بە راگەیاندن و رونکردنەوەی ئەحکامەکانەوە هەیە دەنا لەوانیتر خوا خۆی هەڵەیان پێ دەکات، بەلام لەو هەڵەیەش پارێزراون کە لە مەڕ شەیتانەوەیە[١٢٢]، شیعە پارێزراوێتی پێشەواکانیان پێ بابەتێکی سەرەکی بیروباوەڕە بۆیە ئەوانە تەکفیر دەکەن کە لەگەڵیاندا پێچەوانەن، ئەم بیروباوەڕە گەندەڵەیان زۆر شتی تری لێ دەکەوێتەوە، پێیان وایە وتەی پێشەواکانیان وەکو قورئان و سوننەت بەڵگەی شەرعین، بۆیە پێیان وایە هێشتا بەرنامەدانان (تەشریع) تەواو نەبوەو بە مردنی پێغەمبەرﷺ کۆتایی نەهاتوە، بەڵکو هەتا پێشەوای دوازدەمینیان بزر دەبێ هەر کاتی ماوە، هەروەها پێیان وایە دەتوانن پەیامی پێشەوا نادیارەکەیان بەسای بریکارەکەیەوە وەرگرن، کەواتە ئەو پێشەوایانە لەبەر ئەوەی پارێزراون ئەوان بۆ جێنشینایەتی شایەتترن، ئەوان لە ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان و یاوەرانیتر-خوا لێیان رازی بێت-شایەتترن!.

## هۆی پارێزراوێتی پێشەواکان:[١٢٣]

هەڵبەت پێغەمبەران بە پێی ئایەت پارێزراون: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى، إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى﴾ النجم/٣-٤، ئەوە پێغەمبەران، بەلام پێشەواکان بۆچی پارێزراون؟ زاناکانی شیعەی ئیمامی دەڵێن: خوا چەند روحێکی خستۆتە ناو جەستەی

---

١٢٢ بحار الأنوار للمولى محمد باقر المجلسي (٢٥/٣٥٠-٣٥١)، (الإمامة للسالوس ل ٢١).

١٢٣ هەمو ئەو دەقانە و سەرچاوەکانیان کە لێرەدا هێناومانە لە پەرتوکی (الإمامة عند الجمهور والفرق المختلفة)ی د. علي أحمد السالوس (ل ٢٠) وەرگیراوە.

پێشەواکان و کۆمەکیان دەکەن، تەنانەت ئەلکلینی لە پەرتوکەکەی بە ناوی (أصول الكافي)دا سەرناوێکی بۆ ئەم بابەتە داناوە بەناو نیشانی (باب فيه ذكر الأرواح التي في الأئمة[124]) (١/٢٧١-٢٧٢) هەروەها ئەوەش (باب الروح التي يسدد الله بها الأئمة[125]) (١/٢٧٣-٢٧٤)، لەم دەروازەیەدا شەش بەناو فەرمودەی لە ئەبوعەبدوڵلاوە لەبارەی ئەو روحەی کە لەم ئایەتەدا باسکراوە، هێناوەتەوە: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا﴾ الشورى/٥٢، دەڵێ: خوا ئافەریدەیەکی هەیە لە جبریل و میکائیل گەورەترە، ئەو ئافەریدەیە لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا بو و هەواڵی پێ رادەگەیاندو هاریکاری دەکرد پاشان کە مرد، ئێستا لەگەڵ پێشەواکانە، لە دەروازەکەی پێشتردا وتەی ئیمام صادق دێنێتەوە کە دەڵێ: گیانی پیرۆز تایبەتە بە پێغەمبەران، جا ئەگەر پێغەمبەر مرد ئەوا گیانی پیرۆز دەگوازرێتەوە و لەگەڵ پێشەوادا دەبێ، گیانی پیرۆز نانوێ، بێ ئاگا نابێ، یاری ناکات، خۆ بەگەورە ناگرێ، پێشەوا بەسای ئەمەوە دەبینێ[126]، لەپ مراوێزدا (بينين)ی راڤە کردوەو دەڵێ: واتە ئەوانە دەبینێ کە لە کەنارەکانی زەوی و ئاسۆکانی ئاسمانن و لێی بزرن، بەگشتی هەمو ئەو شتانەی لەژێر عەرەشەوەن تا بن خاك و خۆڵی زەویش، لەپەرتوکی (بحار الأنوار)ی مەولا موحەممەد باقری مەجلیسی (٢٥/٤٧-٩٩) دەروازەیەکی کردۆتەوە بەناوی (ئەو گیانانەی کە تێیاندایە) و دەڵێ: پێشەواکان بە گیانی پیرۆز پشتیوانی دەکرێن، ئیبنو بابەوێی قوممی لە (رسالة للصدوق في الإعتقادات)[127] (ل ١٠٨-١٠٩) دەڵێ: لەبارەی ئەو هەواڵە صەحیحانەی لەبارەی پێشەواکان وتراوە بە بیروباوەڕی ئێمە راستەو لەگەڵ قورئان تێك دەکاتەوە و واتاکانی هاوسازن،

---

١٢٤ دەروازەیەك لەبارەی ئەو گیانانەی لە پێشەواکانماندان.

١٢٥ دەروازەیەك لەبارەی ئەو گیانای خوا هاریکاری پێشەوایانی پێ دەکات.

١٢٦ عقائد الإمامية الإثني عشرية، إبراهيم الموسوي الزنجاني ل ١٦١.

١٢٧ واتە: سیارەیەکی صەدوق لەبارەی بیروباوەڕەوە.

ناکۆك نین، ئەمەش لەبەر ئەوەی لەرێگەی سروشی خواوە وەرگیراوە، ئەو کابرایە قوممیە پەرتوکی (فقیه من لا یحضره الفقیه)ی نوسیوە کە یەکێکە لەو چوار پەرتوکە جێباوەڕەی فەرمودان کە جەعفەریەکان متمانەی پێ دەکەن دەڵێ: زانایانی شیعە پێیان وایە پێغەمبەر ئەگەر ئامۆژ نەکرێ ئەوا پێغەمبەرایەتی و پەیامەکەی کەم و کورتە و نەتەوەکەشی بەفیڕۆ داوە[128]، بێگومان ئەم بانگەشەیەی ئەوان دەیکەن کە دەڵێن پێشەواکان پارێزراون و واجبە بەبێ بەڵگەش بۆیان ئەژنەوا بین هەڵبەت بانگەشەیەکی پوکەڵ و گەندەڵە و فڕی بە راستیەوە نیە، چونکە ملکەچ نەبون بۆ ناپارێزراو دروستە، بەڵکو واجبیشە ئەگەر بێتو پێچەوانەی شەرع بو، خوا فەرمانی پێ کردوین ملکەچی خوا و پێغەمبەر بین، بێ لە پێغەمبەرانیش ئەگەر فەرمانی بە رێوشوێنی پێغەمبەرﷺ کرد ئەوا فەرمانبەری بۆ دەکرێ، بەڵام بەپێچەوانەوە نەء، وە ئەگەر لە کارێکدا ناکۆکیمان کەوتە نێوان ئەوا دەبێ بۆ قورئان و فەرمودە بگەڕێینەوە:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنْكُمْ فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً:

بڕوادارینە! ئەژنەوای خواو ئەژنەوای پێغەمبەر بن، هەروەها فەرمان و کاربەدەستەکانیشتان، جا ئەگەر لە شتێکدا ناکۆك بون دادوەریەکەی بۆ خواو پێغەمبەری خوا بگەڕێننەوە، ئەگەر بڕواتان بە خواو بەرۆژی دوایی هەیە، ئەوەتان بۆ باشترە و باشترین وەلامەتانە﴾ النساء/٥٩، جا ئەگەر ئەژنەوابونی پێشەواکان واجب با، ئەوا دەبوایە کێشەکان بۆ خواو پێغەمبەر و کاربەدەستان بگەڕێندرابانەوە، بەڵام کە گەڕانەوەی کێشەکان بۆلای ئەوان واجب نیە کەواتە پارێزراو نین، ئەوەتانێ عەلی و دو کوڕەکەی و یارەکانی لە زانست و فەتوادا وەکو سەرجەم زاناکانیتر لەگەڵ یەکتریدا جیاوازیان هەبوە، خۆ ئەگەر پارێزراو

١٢٨ هەمان سەرچاوە ل ١٧١.

بونایه ئەوا نەدەبو بۆچونەکانیان پێچەوانەی یەکتر بن، حەسەن لەبارەی شەڕدا لەگەڵ رای باوکی جیاواز بو، شەڕەکەشی زۆر پێناخۆش بو. ئەنجا عەلی لە ئاخرو ئۆخری شەڕدا لە رایەکەی پاشگەز دەبێتەوە و پێیر ۱۰ ۱۰۰سیٚ ئەگەر بە پێچەوانە رەفتاری بکردبا ئەوجا راستی دەپێکا، هەروەها زۆر فەتوای هەیە لێی پاشگەز بۆتەوە، بەڵام پارێزراو دو وتەی پێچەوانەی یەکتری نابێ تەنها لەو کاتە نەبێ کە یەکێکیان نەسخی ئەوەی تر بکاتەوە، هەروەها حەسەن ئامۆژگاری حوسێنی برای کرد کە گوێڕایەڵی خەڵکی عێراق نەکات و داوای ئەم ئەرکەیان لێ نەکات، خۆ ئەگەر پارێزراو بوایە ئەوا حوسێن بۆی دروست نەبو سەرپێچی بکات[129].

۱۲۹ مجموع الفتاوی (۳۵/۱۲۰،۱۲۵،۱۲٦).

# بەندی حەفتەم

# بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی

**ڕێخۆشەکی:**

پێغەمبەران -کە خوا بۆ گەلانی ناردون- بەخەڵکیان گوتوە: خەڵکینە! ئێمە لەلای خواوە نێردراوین و لەسەرتان پێویستە هەرچی پێتان دەڵێین بەڕاستی بزانن و هەرچی فەرمانتان پێ‌دەکەین یا بەهەڵستیتان لێ دەکەین دەبێ ملکەچی بن و یاخی نەبن، خوای گەورە لە سورەتی شوعەرادا یادی نوح دەکاتەوە کە بە گەلەکەی گوتوە: ﴿إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ، إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ، فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ: بۆ لەخوا ناترسن؟ من پێغەمبەرێکی بێ زیان و پاکم بۆ ئێوە، لەخوا بترسن و بەرفەرمانی بن﴾ الشعراء/١٠٦-١٠٨، هەڵبەت پێغەمبەر (هود و سالح و لوط و شوعەیب)یش بەهەمان وتە و ئامۆژ لەگەڵ گەلەکانیان ئاخافتون، نەك هەر ئەوان بەڵکو سەرجەم پێغەمبەران هەر هەمان وتەیان بە گەلەکانیان فەرموە، دیارە بانگەشەی لەم جۆرەش بەڵگەو ئاماژەی گەرەکە تا بسەلمێ ئەو پیاوانە راست دەفەرمون و پەیامبەری خوان، هەروەها بۆ ئەوەش خەڵك هەنجەت و بیانوی ببڕێ و پاساو بۆ بێبڕوایی‌و نافەرمانی نەهێننەوە: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ: پێغەمبەرانمان بە کۆمەڵە بەڵگەیەك ناردوە﴾ الحديد/٢٥، بەڵگەکانیش راستێتیان دەسەلمێنێ.

## هەمە جۆریتی بەڵگەکان:

هەر پێغەمبەرێك بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیەکەی ژمارەیەکی هێجگار زۆر بەڵگەی جۆراو جۆری هەبوە، تەنانەت هی پێغەمبەری خۆمان -کە هەندێ لە زانایان لەم بارەوە پەرتوکیان لەسەر نوسیوە- لە هەزار تێپەریوە، دەتوانین سەرجەم بەڵگەکان بۆ چەند بەندێك دابەش بکەین هەر بەندێك کۆمەڵێك بەڵگەی هاوشێوە لەخۆ بگرێ، جا بەم پێیە ئێمەش بەڵگەکانمان بۆ پێنج جۆر دابەش کردوە:

یەکەم: ئەو نیشانە و موعجیزانەی خوا ئەنجامی دەدات تا راستێتی پێغەمبەرایەتی پێ بسەلمێنێ.

دوەم: موژدەی پێغەمبەرانی پێشتر بۆ پێغەمبەرانی پاشتر.

سێیەم: رامان و سەرنجدان لە ژین و ژیواری پێغەمبەران.

چوارەم: رامان و سەرنجدان لە بانگەوازی پێغەمبەران.

پێنجەم: کۆمەك و پشتیوانی خوا بۆیان.

ئیتر هەریەك لەم پێنجانە کەمێك بە رون و درێژی لەسەریان دەدوێین:

# یەکەم: نیشانەو موعجیزە

لە زمانی عەرەبیدا (الآية: نیشانە) بەو نیشانەیە دەگوترێ کە دەستنیشانی شتێك دەکات، بەڵام لێرەدا چەند کارێکی لە ئاسابەدەری پێ‌مەبەستە کە خوا لەسەر دەستی پێغەمبەران دەیهێنێ و توانستی مرۆڤ لەباریدا نیەو ناتوانێ شتیوا ئەنجام بدات، بۆ وێنە گۆڕینی گۆچان بۆ مارێکی بزۆك و جموجۆڵ کە نیشانەیەکی لە ئاسابەدەرەو بەڵگەیەکی هەڵنەوەشاوەیەو کەس ناتوانێ بیپوچێنێتەوەو بەڵگەیەکە راستێتی بانگەشەکەیان دەسەلمێنێ.

## پێناسەی نیشانەو موعجیزە:

وا هاتوە زانایان بەم نیشانانە بڵێن (موعجیزە)، کە ئیسم فاعیلە و لە ریشەی (العجز) وەرگیراوە، (عەجز نەبونی توانستە بۆ ئەنجامدانی کارێك یا وتەیەك یا بۆچونێك یان تەگبیرێك[١٣٠]، (فەخری رازی) لە بواری باو ونەریتەوە پێناسەی دەکات و دەڵێ: کارێکی لە ئاسابەدەرە بەرەنگار بونەوەی تێدایەو لە بەرانگژێدا سەرکەوتوە[١٣١]، (ئیبنو حومدانی حەنبەلی) ئاوەها پێناسەی دەکات و دەڵێ: بریتیە لە هەر وتەو کردەیەکی ئاسا سمێن کە هاوبەندی بانگەوازی پەیامبەرێتی بێت و بەرەنگاریەکی وای تێدابێ کەس نەتوانێ هاوشێوەی ئەنجام بدات یان شتێك بکات لێیەوەی نزیك بێت[١٣٢]، بەپێی ئەم پێناسانە، ئەمانەی خوارەوە لە ریزی موعجیزان نین و بە موعجیزە هەژمار ناکرێن:

---

[١٣٠] بصائر ذوي التمييز (١/٦٥).

[١٣١] لوامع الأنوار البهية (٢/٢٨٩-٢٩٠).

[١٣٢] هەمان سەرچاوە.

١. ئەو ئاساسمێنانەی پێغەمبەرانی پێ بەهرەوەر دەکرێت و مەبەستی بەرەنگار بونەوەی تێدا نیە، بۆ وێنە: هەڵقوڵانی ئاو لە نێو پەنجەکانی پێغەمبەرﷺدا، زۆربونی خواردنی کەم، پاکیکردنی (تسبیح) وردە بەرد لەنێو لەپیدا، درەخت کەسەردانیان کردوە، کورکاندنی بنکە دارخورما شتی تری لەم بابەتە.

٢. ئەو ئاساسمێنانەی کە خوا بە کەسانی دیکەی جگە لە پێغەمبەرانی دەبەخشێ کە پاشینان پێیان گوتوە کەرامەت، زانایانی پاشین ئەمەیان جیا کردۆتەوە، بەڵام لەزماندا و لەلای زانایانی پێشینیشدا-وەکو ئیمام ئەحمەد-هەمو ئەوانەش دەگرێتەوە[١٣٣].

ئێمە وشەی (ئایەت: نیشانە)مان بەکارهێناوە چونکە قورئان بەکاری هێناوە، وشەیەکیشە هەمو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە خوا بۆ سەلماندنی راستێتی بانگەواز بە پێغەمبەرانی بەخشیوە، ئەنجا مەبەستی بەرەنگار بونەوەی تێدا بێ یان نا.

## جۆری نیشانەکان:

ئەگەر لە نیشانەو موعجیزەکان رامێنین کە خوا بە پێغەمبەرانی بەخشیوە، سەرجەمیان لە سێ وشان کۆدەبنەوە: زانست، توانا، بێنیازی.[١٣٤] گێڕانەوە و باسکردنی شتە پەنهانەکانی رابردو و داهاتوی وەکو گێڕانەوەی باسوخواسی پێغەمبەر عیسا ﷺ کە چیان خواردوە و چیان پەزمەندە کردبو، یان کە باسی

---

[١٣٣] مجموع فتاوى شيخ الإسلام ١١/٣١١، و لوامع الأنوار البهية ٢/٢٩٠.

[١٣٤] مجموع فتاوى شيخ الإسلام ١١/٣١٢-٣١٣.

سەرگوزەشتەی گەلانی رابردومان بۆ دەکات یان کە باسی کارەسات و نیشانەکانی رۆژی دواییمان بۆ دەکات  ئەوانە هەر هەموی دەچنە نێو خانەی زانستەوە، گۆڕینی گۆچان بۆ مار و چارەسەرکردنی بەڵەك و کوێری‌و زندو کردنەوەی مردوان و شەقکردنی مانگ و ئەم جۆرانەش دەچنە نێو خانەی توانستەوە، خوا کە پێغەمبەری لە ئازار و نیازپیسی دوژمان  پاراستوە یان کە بە بەردەوامی بەرۆژو بوە و شەکەت و کەشەنگ و چالاکی سست نەبوە، ئەوانەش دەچنە نێو خانەی بێنیازیەوە، ئەم سێیانە (زانست و توانست و بێنیازی) کە مایەی موعجیزەکانن قەت بەو شێوە تەواومەندیە نین کە بەس شایەنە بە خوا، بۆیە خوا فەرمانی بە پێغەمبەرﷺ کردوە کە بە رەهاییەوە بانگەشەی ئەم سیفەتانە نەکات:

﴿قُلْ لاَ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَائِنُ اللهِ وَلاَ أَعْلَمُ الْغَيْبَ وَلاَ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّي مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلاَّ مَا يُوحَى إِلَيَّ: پێیان بلێ پێتان ناڵێم گەنجینەی خوا لەلای منە، پەنامەکیش نازانم، پێشتان ناڵێم من فریشتەم، بەڵکو من تەنها شوێن سروشی خوا دەکەوم.﴾ الأنعام/ ٥٠.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ پاکانەی خۆی دەردەبڕێ کە بانگەشەی پەنامەکزانی ناکات، خاوەن گەنجینەی زەوی نیە، فریشتەیەك نیە لە نان و ئاو و دارایی دەستبەردارو بێنیاز بوبێ، پێغەمبەران لەهەر یەك لەم سێیانەدا بەجۆرێك بەهرەمەند دەبن کە باو و نەریتی خەڵك ببەزێنێ بەڵام قەت نابێتە رەها، هەر هەموشی بەخششی خوایە، ئەوەی خوا فێریان بکات دەیزانن، ئەوەی خوا توانایان پێ ببەخشێ دەتوانن، لەوەی خوا بێنیازیان بکات بێنیازن.

## چەند نمونەیەك لە نیشانەكانی پێغەمبەران:

### ١) نیشانەی پێغەمبەر ساڵح:

پێغەمبەر ساڵح ﷺ گەلەكەی خۆی بۆ پەرستنی خوای تاك و یەكتا بانگ دەكرد: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا أَنْ اعْبُدُوا اللَّهَ: ساڵحی برایمان بۆ گەلی ثەمود ڕەوانە كرد تا بانگیان بكات تەنها خوا بپەرستن﴾ النمل/٤٥، بەلاَم بڕوایان پێ نەهێنا و داوای نیشانەیەكیان لێكرد تا ببێتە بەڵگەی ڕاستێتی: ﴿قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنْ الْمُسَحَّرِينَ، مَا أَنتَ إِلاَّ بَشَرٌ مِثْلُنَا فَأْتِ بِآيَةٍ إِنْ كُنتَ مِنْ الصَّادِقِينَ: پێیان گوت: هیچ گومانێك لەمەدا نیە تۆ جادوت لێكراوە، تۆش وەك ئێمە مرۆڤێكی، دە ئەگەر ڕاست دەكەی نیشانەیەكمان بۆ بێنە﴾ الشعراء/١٥٣-١٥٤.

ئیبنو كەثیر دەڵێ: تەفسیرزانان دەڵێن: ڕۆژێكیان ماقولاَنی ثەمود لە دیوەخانێ دانیشتبون، ساڵحی پێغەمبەری خوداش چوە لایان بۆ خوا پەرستی بانگی كردن و پەند و ئامۆژێكی زۆری دادان، ئەوانیش گوتیان: ئەگەر ئەتۆ لەم تاشە بەردەوە -پەنجەیان بۆ بەردێكی نزیك ڕاداشت- وشترێكی ئاوەها و ئاواو ئەوەندە سیفەتەی هەبێ و دەمانگیش ئاوس بێ -زۆر ئەستوریان ڕێست- بۆمان لەم بەردە بێنیە دەرێ ئەنجا بڕوات پێ دێنین، ساڵح ﷺ فەرموی: ئەگەر وام كرد بڕوام پێ دێنن؟ گوتیان بەڵێ، ئەویش پەیمان و بەڵێنی لێ وەرگرتن، ساڵح چوە نوێژگەكەیو تا خوا كردی نوێژی كرد، ئەنجا لە خوا پاڕاوە وەلاَمی داواكەیان بداتەوە، خوای گەورە فەرمانی بە بەردەكە كرد شەق ببێ و وشترێكی دە مانگ ئاوسی وەك چۆن داوایان كردبو وەدەر نێت، كە دیتیان دیمەنێكی ئاوەها سەمەرەو توانایەكی سەراسیمەركارو بەڵگەیەكی ببڕو سەلماندنێكی بێ

پەڵەیە، زۆریان بڕوایان هێنا، بەڵام زۆریشیان لە کەڵی شەیتان نەهاتنە خوارەوە و لە سەر کوفرەکەیان مانەوە[١٣٥].

بەڵێ خوای گەورە وەڵامی سالّحی داوەو داواکەیانی بەجێهێنا: ﴿قَالَ هَذِهِ نَاقَةٌ لَهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَعْلُومٍ: ئەمە وشترەکەیە، ئێوە نۆرە ئاوی خۆتان هەیەو ئەویش نۆرە ئاوی خۆی هەیە، جا نۆرە بڕی نەکەن﴾ الشعراء/١٥٥، ﴿قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ هَذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ: پەروەردگار رێڕونی بۆ ناردن، ئەمە وشترەکەی خوایەو نیشانەکەی ئێوەشە وازی لێ بێنن با بەئارەزوی خۆی لە زەوی خوا بلەوەڕێ، نەکەن زیانی پێ بگەیەنن﴾ الأعراف/٧٣، خوا پێی راگەیاندوین کە ئەم وشترە نیشانەیەکی ئاشکراو رون و رەوانە بۆیە بە (مبصرة) سیفەتمەندی کردوە: ﴿وَآتَيْنَا ثَمُودَ النَّاقَةَ مُبْصِرَةً﴾ الإسراء/٥٩.

## ٢) موعجیزەی پێغەمبەر ئیبراهیم:

کە ئیبراهیم ﷺ بەناوخواکانی گەلەکەی شکاند، ئاگرێکی گەورەیان بۆ هەڵکرد و هەڵیاندا ناوی، خوا فەرمانی بە ئاگر کرد ئازاری نەدات: ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ فَاعِلِينَ، قُلْنَا يَانَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ: گوتیان بیسوتێنن، لەسەر خواکانتان وەدەنگ وەرن،

---

[١٣٥] البداية والنهاية (١٣٤/١).

ئێمەش گوتمان: ئاگر! بۆ ئیبراهیم ساردو بێ ئازار بە، ئەوان ویستیان ئیبراهیم بفەوتێنن بەڵام ئێمە ئەوانمان فەوتاند و دۆڕاندیان ﴾ الأنبياء/٦٨-٧٠.

نیشانەیەکی تری ئیبراهیم زندوکردنەوەی مردو بو، خوا ئەم باسەخواسە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِ الْمَوْتَى قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِنْ قَالَ بَلَى وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِنَ الطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ اجْعَلْ عَلَى كُلِّ جَبَلٍ مِنْهُنَّ جُزْءاً ثُمَّ ادْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا: ئیبراهیم گوتی: پەروەردگار! نیشانم بدە چۆن مردوان زندو دەکەیەوە؟ فەرموی: بۆ بڕوا ناکەی؟ گوتی: بەڵێ بەڵام دەمەوێ ببینم تا دڵم ئاوەر وەرگرێ، فەرموی: چوار مەل بگرە ئینجا رامیان بکە بۆلای خۆت، پاشان پارچەپارچەیان بکەو هەر پارچەیەکی لەسەر شاخێك دابنێ، پاشان بانگیان بکە بە خێرایی بۆ لات دێن.﴾ البقرة/٢٦٠، خوا فەرمانی پێکرد ئەم باڵندانە بکوژێتەوە، پاشان پارچەپارچەیان بکات و بەسەر چەند شاخێکدا دابەشیان بکات، ئەنجا بانگی کردن، پارچەکان هەمو هاتن و یەکیان گرتەوە و وەکو جاران بونەوە باڵندەو ژیانیان بەبەردا هاتەوە، بەرەو ئاسمان پەروازیان دەکرد. پاکی بۆ خوا چەندە بە تواناو بەدەسەڵاتە.

## ٣) نیشانەکانی پێغەمبەر موسا:

خوا نۆ نیشانەی رون و رەوانی بە موسا ﷺ بەخشیبو: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ﴾ الإسراء/١٠١:

١) مەزن و گەورەترینیان گۆڕینی گۆچان بو بۆ مارێکی زل ئەستور:

﴿وَمَا تِلْكَ بِيَمِينِكَ يَامُوسَى، قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّأُ عَلَيْهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَى غَنَمِي وَلِيَ

فِيهَا مَآرِبُ أُخْرَى، قَالَ أَلْقِهَا يَامُوسَى، فَأَلْقَاهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَى، قَالَ خُذْهَا وَلاَ تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا الأُولَى: خوا فەرموی: ئەدی ئەوە چیە کە لە دەستی ڕاستتە؟ موسا!، موسا گوتی: گۆچانەکەمە کە لەرۆیشتندا متمانەی دەکەمە سەر و پەلك و گەلأی دارانی پیٚ هەڵدەوەرێنم و زۆر سودی تریشی لیٚ دەبینم، فەرموی: موسا! هەڵیدە، موساش هەڵیدا و بو بە مارێکی بزبزۆك، فەرموی: بیگرەوە و مەترسە کە گرتت وەکو خۆی دەیکەینەوە گۆچان ﴾ طـه/١٧-٢١، گۆچانەکە بو بە مار و بەدەیان گوریس و گۆچانی هەڵلوشی کە جادوگەرانی ڕکەبەر لەگەڵ خۆیاندا بۆ ململانیٚ هێنابویان:

﴿قَالُوا يَامُوسَى إِمَّا أَنْ تُلْقِيَ وَإِمَّا أَنْ نَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى، قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِنْ سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى، فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُوسَى، قُلْنَا لاَ تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الأَعْلَى، وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلاَ يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى: جادوگەرەکان گوتیان: موسا! یان تۆ هەڵیدە یان ئێمە یەکەمجار هەڵیدەدەین، موسا بێباکانە گوتی: بەڵکو ئێوە هەڵیدەن، ئیتر گوریس و گۆچانی جادوگەرەکان لەبەر چاوی موساو بینەران بون بەماری بە جولە و گورج و گۆڵ، موسا کە ئەمەی بینی ترسێکی کەوتە دڵ، گوتمان: مەترسە تۆ سەرکەوتوی، گۆچانی نێو دەستی ڕاستت هەڵدە، هەموو ئەو گوریس و گۆچانە بەناو مارانەی ئەوان هەڵدەلوشیٚ، چونکە هی وان هەر جادوە و ڕاستەقینە نیە، جادوگەر دەربازبونی بۆ نیە جا لە هەر شوێنکاتێکدا جادوەکەی بکات ﴾ طه/٦٥-٦٩، جادوگەرەکان کە کاری ماری موسایان دیت، زانیان ئەمە کاری مرۆڤ نیە، بەڵکو کاری ئافەریدگاری مرۆڤە، ئیتر خۆیان بۆ نەگیراو یەکڕاست دانەوین و لەبەر چاوی ئەم هەمو

حەشامات و ئاپۆرەیەدا سوژدەیان بۆ پەروەردگاری بونەوەر برد: ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى: جادوگەرەكان سوژدەیان بردو گوتیان: بڕوامان بە پەروەردگاری هارون و موسا هێنا﴾ طه/٧٠.

٢) نیشانەیەكی‌تر ئەوەبو كە دەستی دەبردە ناو باخەڵی‌و دەری دەهێنا وەك مانگی رون و گەش دەدرەوشایەوە: ﴿وَاضْمُمْ يَدَكَ إِلَى جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاءَ مِنْ غَيْرِ سُوءٍ آيَةً أُخْرَى: دەستت بخە بن باخەڵت، پاشان كە دەری دێنی رەنگەكەی سپیەكی زۆر رون و روناك دەبیٚ بێئەوەی نەخۆشی هەبیٚ، تا ببێتە نیشانەو موعجیزەیەكی تر﴾ طه/٢٢.

خوای گەورە لە سورەتی ئەعرافدا حەفت نیشانەی تری یاد كردوە كە توشی گەلی موسای كردوە.

٣) نەهاتی؛ كە زەوی و زاریان بەهۆی كەمبونەوەی ئاوی (نیل) و باران نەبارین وشكی كرد.

٤) كەمبونەوەی بەروبومی كشتوكاڵیان، ئەو بەروبومەی وەبەرهەمیش دەهات، دەردو نەخۆشی لێی دەدا.

٥) لافاو؛ كە دەغڵو شینایی و شارو دێهاتی وێران دەكرد.

٦) هەزارەزیلەی كللۆیان كە تەڕو وشكی بنبڕ دەكرد.

٧) ئەسپیٚ؛ كە خەڵكی هەراسان كردبو.

٨) بۆق؛ كە هێندە زۆر ببو تەنانەت خۆی ئاخنیبوە نێو خواردن و خۆراكیش.

٩) خوێن؛ كە خواردن و خواردنەوەیان خوێناوی دەبو.

﴿وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِنَ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ، فَإِذَا جَاءَتْهُمُ الْحَسَنَةُ قَالُوا لَنَا هَذِهِ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا بِمُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَلَا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِنْدَ

اللهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ، وَقَالُوا مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِ مِنْ آيَةٍ لِتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ، فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُفَصَّلاَتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُجْرِمِينَ﴾ الأعراف/١٣٠-١٣٣.

**نیشانەی تر:**

**ئەم نۆ نیشانەیە ئەوانە بون کە خوا موسای پێ ناردە لای فیرعەون، ئەگینا خوا زۆر نیشانەی تریشی لەسەر دەستی موسا والا کرد، بۆ نمونە: کە موسا بە گۆچانەکەی زەبرێکی لە دەریا دا و کردیە دو شەق، یان کە بە گۆچانەکەی لە گاشەبەردێکی دا و دوازدە سەرچاوەی لێ هەڵقوڵی، یان کە لەو بێرونەی سینادا گەزۆ و شێلاقەی[١٣٦] بۆ ئیسرائیلیەکان دابەزاند زۆریتر.**

## ٤) موعجیزەکانی پێغەمبەر عیسا:

**لەو موعجیزانەی خوا پێمانی راگەیاندوە ئەمانەن: قوڕی وەك باڵندە شێوەڕێژ دەکرد پاشان فوێکی پێدا دەکردو بەکاری خوا دەبوە باڵندەیەکی روح لەبەر، دەستی بە چاوی کوێران و بە بەڵەکی بەڵەکان دادەهێنا یەکسەر بەکاری خوا چاك دەبۆوە، بەلای مردواندا رادەبوری و بانگی دەکردن خوا زندوی دەکردنەوە، خوا لە قورئاندا ئەوانە یاد دەکات و لەگەڵ عیسا دەدوی:** ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ مِنْ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِئُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ

---

[١٣٦] شێلاقە جۆرە باڵندەیەکە لە کەو گەورەترە، وەرگێڕ.

بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوْتَى بِإِذْنِي﴾ المائدة: ١١٠، یەکێکی‌تر لە نیشانەکان ئەو سفرەیە بو کە خوا لە ئاسمانڕا ناردی، ئەمەش لە کاتێکدا بو کە حەواریەکان داوایان لە عیسا کرد دابەزێت، عیسا چۆنی داوا کرد ئاوەها دابەزی و بوە جەژنی یەکەمین و دواهەمینیان: ﴿إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَاعِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ، قَالُوا نُرِيدُ أَنْ نَأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَنْ قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ، قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنْزِلْ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِنْكَ وَارْزُقْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ، قَالَ اللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَنْ يَكْفُرْ بَعْدُ مِنْكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لَا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ: حەواریەکان بە عیسایان گوت: پەروەردگارت دەتوانێ خوانێکمان بۆ لە ئاسمان بێنێتە خوارەوە؟ گوتی ئەگەر بڕوادارن ئەم داوایە مەکەن و لە خوا بترسن، گوتیان دەمانەوێ نانی لێ بخۆین، هەروەها تا دڵیشمان ئاو بخواتەوە و ببینە گەواهیدەریش، عیسای کوڕی مەریەم گوتی: خوای پەروەدگار! خوانێکمان لە ئاسمانێڕا بۆ دابەزێنە، رۆژی دابەزینی دەکەینە جەژنی ئێستاو ئایندەمان، هەروەها ببێتە نیشانەیەکی هێزو توانات، بژێویشمان بدە تۆ چاکترین بژێوی بەخشی، خوا فەرموی: من بۆتانی دادەبەزێنم بەڵام هەر یەکێکتان لەدوای ئەم خوانە هەڵگەڕێتەوە دەبێ سزایەکی وای بدەم قەت کەسی تر بەو جۆرە سزا نادەم﴾ المائدة ١١٢-١١٥.

## 5) نیشانەکانی دواهەمین پێغەمبەر ﷺ:

خوا زۆر موعجیزەی سەراسیمەکارو نیشانەی رۆشنی وای لەسەر دەستی پێغەمبەرﷺدا رانواندوە کە هەر راستی پەروەرێك تێوەیان رامێنێ بڕوا بە راستێتی خواو پێغەمبەرﷺ دێنێ. زانایان چەندین پەرتوك و نوسراویان لە بارەوە نوسیوە، هەندێکیان کە هەڵی ژماردون لە هەزاری تێپەڕاندوە، زانایانی یەکتاناسی و تەفسیر و فەرموودە و مێژوش زۆر راقەو لێکدانەوەیان بۆ کردوە.

### نیشانەی هەرە مەزن:

گەورەترین نیشانەی پێغەمبەرﷺ، بەڵکو پێغەمبەران–علیهم السلام– قورئانی پیرۆزە، کە نیشانەیەکە لەگەڵ ناخ و ژیری مرۆڤدا دەدوێ‌و تا دنیا دنیا بێ هەر دەمێنێ‌و گۆڕانی بەسەردا نایێت: ﴿وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ، لاَ يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلاَ مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ: ئەوانەی بێبڕوایی لە ئاست قورئاندا دەکەن خوا سزایان دەدات و قورئانیش زۆر لەوە بەهێزترو زاڵترە کە خەوش و کەمایەسی لێ وەدۆزن، کە نەپەڕتوکەکانی پێشو نەهی پاشو ناتوانن یەك کەموکورتی لێ ببیننەوە، ئەم قورئانە لەلای پەروەردگاری لێزان و ستایشکراوەوە دابەزیوە﴾ فصلت/٤١-٤٢، خوا قورئانی هێناوەتە بەرەنگاری رەوانبێژانی عەرەب کە رەوانبێژی‌و زمان تەڕو پاراوی و قسەپوختەیی عەرەبەکان لە ئەوپەڕیدا بو، عەرەبەکان دژایەتیەکی ناقولای بانگەوازی ئیسلامی‌و پێغەمبەریان دەکرد، هانی رەوانبێژەکانیان دەدا وتەی هاوشێوەی قورئان ببێژن تا بانگەوازەکەی پێ دامرکێنن، بەلام نەیانتوانی و دەسەوسان بون: ﴿وَإِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا

عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ، فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ: ئەگەر لەم قورئانەی کە بۆ بەندەی خۆمان ناردوە لە گومان دان، دەی سورەتێك بێنن بەوێنەی ئەو، لەم پێناوەدا بانگی شاعیرو رەوانبێژە هاوکاتەکانیشتان بکەن جگە لە خوا با یارمەتیتان بدەن، ئەگەر راست دەکەن و پێتان وایە لەلای خوا دانەبەزیوە، ئینجا ئەگەر ئەمەتان نەکرد-کە هەرگیز ناشیکەن-ئیتر بێبڕوایی مەکەن و خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤی بەدکارو بەردە، کە ئامادەکراوە بۆ بێبڕوایان ﴾ البقرة/٢٣-٢٤.

## ئەشم و شێوازێکی دانسقەو ناوازەی موعجیزیان:

خوا موعجیزەیەکی ئەوتۆی بە موحەممەدﷺ بەخشی لەگەڵ موعجیزەی سەرجەم پێغەمبەران جیاواز بێ، خۆ خوا دەیتوانی موعجیزەیەکی بەرهەستەکی دابەزێنێ‌و بینەرانی پێ سەیرماو بکات: ﴿إِنْ نَشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ آيَةً فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا خَاضِعِينَ: ئەگەر مەبەستمان بوایە نیشانەیەکمان لە ئاسماندا دەناردە خوارەوە ملی بێبڕوایانی کەچ بکردبا﴾ الشعراء/٤.

ئەگەر خوا مەبەستی با نیشانەیەکی وای دادەبەزاند زەبونیان بکات و ملیان پێ دانەوێنێ کە دەمبەستیان بکات و نەتوانن مشتومڕ بکەن و نەیانتوانیبا رو لە بڕوا وەرگێڕن.

ئەم ئایەتە ﴿فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا خَاضِعِينَ﴾ وێنەی ملکەچی و دانەوینێکی وا دەخاتە بەرچاو وەك بڵێی شێوەیەکی هەمیشەییە و لێیان جوێ نابێتەوە، بەڵام

خـوا وای نەویسـت، ویسـتی وابـو موعجـیزەی پـەیامی کۆتـایی نیشـانەیەکی ناچارکەر نەبێ، قورئانی کردە نیشانە، ئەو قورئانەی کە بەرنامـە و ڕێوشـوێنی تـەواوی ژیانـە و لـە هـەر ڕوێکـەوە بیگـری موعجیزەیـە، لـە ڕوی دارشـتەی دەسـتەواژەکانی، لـە ڕوی هاوسـازی هونـەری، لـەوەی کـە تایبەتمەندیـەکانی هەمان چەشنە و وەك قسەی مرۆڤ هەوراز و نشێوان ناکات و خۆی لێ ناگۆڕێ، چونکە بەرهەمی مرۆڤ بەرزی و نزمیو بەهێزیو لاوازیو گۆڕانی حاڵەتی تێدا بەدی دەکرێ، بەڵام قورئان وا نیە، لە دەربڕیندا یەك نەشم و شێوازی گرتۆتە بەر، یەك ئاستی هەیە، جێگیرە و پاشەکشێ ناکات بەڵگەیە بۆ خاوەنەکەی کە گۆڕانکاری بەسەردا نایێت.

لەروی دارشتەی هزریدا و لە هاوسـازی پـارژو تەواویـەکانیدا موعجیزەیـە، زارترەکی و ڕێکەوتی تێدا نیە، هەمو بەرنامەرێژیـەکانی یـەکدی دەگرنـەوە و هاوسازی یەکترو یەکدگرن، لای لـە تـەواوی ژیـانی مـرۆڤ کردۆتـەوەو هـەمو بوارێکی گرتۆتەوەو داخوازیـەکانی بـۆ دێنێتـەدی ئەمانـە هـەموی بێئـەوەی تەنانـەت بچوکترین نەسـازی خسـتبێتە بەرنامـە تـەواو و تێروتەسـەلەکەی بێئەوەی تەنانەت بۆ جارێکیش لەگەڵ ڕێختی مرۆڤدا هەڵەنگوتێ هەرهـەموی خولاوەی دەورەی یـەك تـەوەرن، هاوسازیەکی وای هەیـە کـە هـەرگیز لـێزانیو شـارەزایی سنورداری مـرۆڤ نایگـاتێ، قـەت نـاکرێ! دەبێ شـارەزاییەکی ڕەهـا هەبێو قۆڵبەستەی شوێن و کات نەبێ، ئەنجا توانیبێتی پەی بەم هـەمو بوارانـە ببات و ئەم شیرازەیە هەڵچنێ.

موعجیزەیـە، لـەوەی زۆر بەهاسـانی دەچێتـە نێـو دەروازەکـانی نـاخ و دڵ، کلیلەکانی هـەڵدەگرێو قوفلـەکانی پـێ دەکاتـەوە، جۆش دەخاتـە ژیلـەمۆکانی دڵ، گرفت و گرێوگاڵەکانی دڵ بەوپەڕی سادەو هاسانیەوە چارەسـەر دەکات، بەبێ هاڵۆزی و هـەراو سەرێشـەو بەهاسـانترین تـاودان دڵ و دەرون پـەروەردە

دەكات، خـوای گـەورە ویسـتی وابـو قورئـان ببێتـە موعجـیزەی ئـەم پەیامـەو نەیویست نیشانەیەکی ماددیی مل شۆڕکەر دابـەزێنێ و جـ ـی ناچار خـەڵك ئەژنەوا بکات، چونکە ئەم کۆتا پەیامـە بۆ هـەمو نەوەو نە ، کراوەتـەوە، تایبەت نیە بە خەڵکانی شوێنکاتێکی دیاری کراو، بۆیـە دەبێ موعجیزەکەشی بۆ نزیك و دور و سەرجەم نەوەو نەتەوان والاّ بێت، بەڵام ئاساسمێنی زەبونکەر تەنها ملی بینـەرانی کەچ دەکات و پاشان دەبێتـە سەربردە نـەك دیاردەیـەکی بینراو، کەچی قورئان پتر لە سێزدە سەدەیە پەرتوکێکی کراوەو ڕێوشوێنێکی بەرنامەڕێژەو بە درێژایی ڕۆژگار خـەڵك-کە دەیکەنە پێشـەوا-بنـەماو بنـەڕەتی ژیـانی خۆیـانیـانی لێ وەردەگرن و ئـەویش پێداویستی و ئاتـاجی تـەواویان پـێ دەبەخشـێ و بـەرەو جیـهانێکی چاکـترو ئاسـۆیەکی بـەرزترو سـەرەنجامێکی پەسندتر هەنگاویان پێ هەڵدەگرێ، نـەوەکانی دوای ئێمـەش زۆر شـتی تـری لێ دەدۆزنـەوە و لێـی بەهرەمـەند دەبـن کـە ئێمـە نـەماندۆزیوە و لێـی بەهرەمـەند نـەبوین، چونکـە قورئـان بـەپێی پێویسـتی خوزایـاران شـت دەبەخشـێ و دەسمایەکەشی لە بن نایێ و ڕۆژگار بۆ ڕۆژگار نوژەن دەبێتەوە[١٣٧].

## شەوڕەوی و بەرزبونەوە:

شەوڕەوی‌و بەرزبونەوە یەکێکە لە نیشانە ڕون و موعجیزە ئاساسمێنەکانی پێغەمبەرﷺ، شەوڕەوی ئەوە بو کە خوا لە مزگەوتی حەرامەوە بەرەو مزگەوتی ئەقسا شـەوڕەوی پێکـرد و لـەوێدا پێشـنوێژی بـۆ تـەواوی پێغەمبـەران کـرد: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا﴾ الإسراء/١، لەوێدا لە مزگەوتی ئەقصا-خوا بۆ ئاسمـان بـەرزی

---

[١٣٧] بگەڕێوە بۆ في ظلال القرآن (١٩/٢٥٨٤).

کردەوە و زۆر نیشانەی مەزن مەزنی خوای بینی، جبریلی لە سەر شێوە ڕاستەقینەکەی خۆی بینی کە خوا ئەفراندبوی و بەرەو درەختی سیدرەتولمونتەها بەرزی کردەوە، هەر حەفت ئاسمانی بڕی‌و خوا نزیکی کردەوەو قسەی لەگەڵدا کرد: ﴿أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى، وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى، عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى، إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى، مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى، لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى: مشتومڕ لەوە دەکەن جبریلی دیبێ؟ ئێ دەنا جارێکی تریش کە جبریل دابەزیوەو لەسەر شێوەی خۆی دیتویەتی، لە کن سیدرەتولمونتەها کە بەهەشتی مەئوای لێیە، خوا بزانێ سیدرەت چ دایپۆشیوە! چاوی موحەممەد ڕەشکەو پێشکەو ناڕونی نەکردوە، لەم شەوەدا چەندین نیشانەی مەزن مەزنی پەروەردگاری دیتوە﴾ النجم/١٢-١٨،

قورەیشیەکان زۆریان پێ سەیر و نەستەم بو! چۆن موحەممەدﷺ شتی وا دەڵێ؟! کاروان گەر بچێتە بەیتولمەقدیس و بگەڕێتەوە چەندین هەفتەی گەرەکە، چۆن پیاوێك لە ساتێکی شەودا دەتوانێ ئەم هاموشۆیە بکات؟!، سەیرە! بەڕاستی سەیرە!. بەڵام ئێمە کە دەزانین خوا شەوڕەویەکەی پێ کردوەو خواش هەمو شتێك دەتوانێ تەمتومانی سەرسوڕمان و پێ‌نەستەم بون دەڕەوێنێتەوە.

## لەتبونی مانگ:

موعجیزەیەکی تری پێغەمبەر ﷺ لەتبونی مانگ بو، خەڵکی مەککە داوای موعجیزەیەکیان لە پێغەمبەرﷺ کرد، وەڵامەکە لەتبونی مانگ بو، تەنانەت شاخی حیرای لە نێواندا بینرا، ئەو شەویش مانگی چواردە بو، خوا ئەم نیشانەیەی لە قورئاندا تۆمار کردوەو دەفەرموێ: ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ،

وَإِنْ يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ: رۆژی دوایی نزیك بۆتەوەو مانگیش لەت بوە، هەر نیشانەیەك ببینن رو وەردەگێڕن و دەڵێن جادوێکی بەردەوامە﴾ القمر/١-٢، ئیبنو کەثیر یەکدەنگی زانایان لە بارەی لەتبونی مانگ دەهێنێتەوە و پاشان دەڵێ لە چەندین رێگاوە بە موتەواتیری فەرمودەی لە سەر هاتوە کە بەڵگەی بڕ دەبەخشن[١٣٨]، خەڵك لە سەرتاسەری دورگەی عەرەبیدا ئەم موعجیزەیان بینی، بەڵام خەڵکی مەککە بڕوایان نەکردو گوتیان موحەممەد جادوی لێ کردوین، پاشان گوتیان چاوەڕێ بن تا کاروان دەگەڕێتەوە، خۆ موحەممەد ناتوانێ جادو لە هەمو خەڵك بکات، بۆ سبەینێ شاندێك لە دەرەوەی شار هاتە مەککەو لەم بارەوە لێیان پرسین، ئەوانیش گوتیان بەڵێ ئێمەش دیتومانە.

خەڵکی دەرەوەی دورگەی عەرەبیش دیتویانە، ئیبنو کەثیر دەڵێ: (زۆر لە هەرێم و ناوچەکانی روی زەوی ئەم لەتبونەیان بینیوە، هەندێ دەڵێن لە هیندستانیشدا مێژودێر کراوە، لەم شەوەدا باڵاخانەیەکیان بیناکردوەو بە شەوی لەتبونی مانگ مێژودێریان کردوە). [١٣٩]

لەوانەیە بڵێن: ((لەتبونی مانگ ئەستەم و مەحاڵ نیە، چونکە زانست لەتبونی (کلکداری بروکس)ی لە ساڵی ١٨٨٩ز بینیوە، هەروەها لەتبونی کلکداری بیلای لە ساڵی ١٨٤٦ز بینیوە)) ، هەروەکو (سبنسەر جۆنز) لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (چەند جیهانێکی بێپایان) لە بەندی (نیازك و کلکدارەکان)دا باسی کردوە. [١٤٠]

---

[١٣٨] البداية والنهاية (١١٨/٣).

[١٣٩] البداية والنهاية ١٢٠/٣.

[١٤٠] هەمان سەرچاوە ١٣٠.

بۆ وەڵام دەڵێین: (جیاوازی نێوان لەتبونی مانگ و لەتبونی ئەم دو کلکدارە ئەوەیە کە مانگ پاشان بە یەکتر لکاوەتەوە، بەڵام کلکدارەکان نەلکاونەوە، بەڵێ، ئەمەیە جیاوازی نێوان دیاردەیەکی ئاسایی گەردون و موعجیزەیەکی گەردونی لەسەر دەستی پێغەمبەرێك، چونکە موعجیزە شتێکی کاتیەو کە مەبەستەکەی دێنێتە جێ نامێنێ، خۆ ئەگەر هەمیشەیی بوایە ئەوا لە ریزی موعجیزان دادەبەزی و دەبوە دیاردەیەکی سروشتی.)[141]

## زۆرکردنی نان و خواردن:

چەندین جار شتی وا لە پێغەمبەرﷺ پشکوایتەوە لەوانە: ئەنەسی کوڕی مالیك(رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەبوطەلحە بە دایکی سولەیمی گوت: گوێم لە دەنگی پێغەمبەرﷺ بو دەنگی کز بو، دەزانم لە برسانە، هیچت لەلادا هەیە بۆی بنێرین؟ گوتی: بەڵێ، چەند کولێرەیەکی جۆی دەرهێناو بەلایەکی لەچکەکەی پێچایەوەو خستیە بن دەستی من و لایەکەی تری لەچکەکەی تێوە ئاڵاندم تا نانەکان دەرنەکەون و کەس نەیبینێ، ئەنجا ناردمی بۆ لای پێغەمبەرﷺ، کە چوم دیتم لە مزگەوتێ دایە، خەڵك لەلای دانیشتبون، منیش بە دیاریانەوە راوەستام، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموم: ئەبوطەلحە ناردوتی، گوتم بەڵێ، فەرموی: بە خواردنەوە؟ گوتم: بەڵێ، بەوانەی فەرمو کە لە خزمەتیدا بون: (هەڵسن) و پاشان بەرێکەوت، (ئەنەس دەڵێ: ئەوان کەوتنە رێو منیش پێش ئەوان گەڕامەوە بۆ لای ئەبو طەلحە و حاڵەکەم تێگەیاند، ئەویش بە دایکی سولەیمی گوت: دایکی سولەیم! پێغەمبەرﷺ وا خەڵکەکەی هێناو هات، ئێمەش نانی ئەم هەمو خەڵکەمان نیە، چار چیە؟ ئەویش گوتی: مەترسە، خواو پێغەمبەر باشتر ئاگایان لە حاڵی ئێمەیە.. ئەبو طەلحە بەخۆی چوە پێشوازی

---

[141] هەمان سەرچاوە ١٣٠.

پێغەمبەرﷺ و لەگەڵیاندا هاتەوە ماڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: دایکی سولەیم! چ خواردنێکت هەیە بیهێنە، ئەویش کولێرەکانی هێنا، پێغەمبەرﷺ دەستوری دا وردیان کرد، دایکی سولەیمیش هیزۆڵکەیەکی هێناو بەسەریدا گوشی و چەوری کرد، بو بە پێخۆری و بو بە چنگاڵو رون، ئەوجا پێغەمبەرﷺ ئەوەندەی خوا ویستی نزای بەسەردا خوێندو فەرموی: با (دە) کەس بێن، فەرمویان لە (دە) کەس کرد، ئەوانیش هاتن تا تێر بون چنگاڵ و رونیان خواردو چونە دەرەوە، پێغەمبەرﷺ داوای دە کەسی تری کرد، ئەوانیش هاتن تێریان خواردو چونە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ هەر جارەی دەیفەرمو با دە کەسیتر بێنە ژورەوە، ئیتر بەم جۆرە هەر جارەی دە کەسیان دەهاتن تێریان دەخواردو دەڕۆیشتن تا تەواو بو، کە ژمارەیان دەوری حەفتا یان هەشتا پیاوێك دەبون. بوخاریو موسلیم گێڕایتیانەوە. [١٤٢]

## بەسەرهاتەکەی جابری کوڕی عەبدوڵلا:

هەروەها جابری کوڕی عەبدوڵلا(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((لە کاتی هەڵکەندنی خەندەقەکە چومەوە لای ژنەکەم و پێم گوت: هیچمان هەیە؟ چونکە پێغەمبەرم دیتوە تا بڵێی برسی بو، ئەویش هەمبانەیەکی هێنا کە چەند مستێك جۆی تێدابو، بەرخۆلەیەکی دابەستیمان هەبو ئەویشم سەربڕی، ژنەکەم جۆیەکەی هاڕیو منیش بەرخەکەم جنیو کردمە ناو دیزەیەك و هەردوکمان پێکەوە لێ بوینەوە، ئیتر کە ویستم بچمەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ، خێزانەکەم پێی گوتم: نەکەی شەرمەزارم کەی، نەچی پێغەمبەرو ئەو هەمو خەڵکەم لێ بکەیە میوان چونکە چێشتەکە هێندە نیەو بەشی ئەم هەموە ناکات.. چومە لای پێغەمبەر ﷺ بەچرپە پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا! خۆت و چەند کەسێك نیوەڕۆ بفەرمونە

---

[١٤٢] مشكاة المصابيح (١٨٢/٣).

ماڵی ئێمە، کەچی پێغەمبەرﷺ بانگەوازی هەڵدا و فەرموی: هۆ خەڵکی خەندەق ئەم نیوەڕۆیە جابر قاوەڵتی دروست کردوە فەرمون با زو بڕۆین، ئەنجا فەرموی نە مەنجەڵەکەتان دابگرن و نە هەویرەکەتان بکەن بە نان تا خۆم دێم، منیش گەڕامەوە، پێغەمبەرﷺ وەپێش مەردومەکە کەوت و هات، کە چومەوە ژنەکەم گوتی: هەی وەهاو وەهات بەسەربێ بۆ وەهات کرد، گوتم: من هەر ئەوەندەم بە پێغەمبەرﷺ گوتوە کە گوتت، ژنەکە هەویرەکەی بۆ پێغەمبەرﷺ هێنا، ئەویش تفی پیرۆزی خۆی تێکرد و نزای پیرۆزی بەسەردا خوێند، ئەنجا چوە لای مەنجەڵەکە و تفی کردە ئەویش و نزای بەسەردا خوێند و فەرموی ژنێکی نانکەری تریش بانگ بکە با نانت لەگەڵدا بکا، چێشتەکەش لە سەر ئاگرەکە دامەگرە و بە ئەسکوێ تێ بکە، خەڵکەکە هەزار کەس بون، ئێ بەو خوایە مەنجەڵەکەمان هەرچەندی لێی تێدەکرا هەر وەکو خۆی بو، هەویرەکەش چەندی نانی لێ دەکرا هەر وەك خۆی بو!)) بوخاری و موسلیم گێڕاتیانەوە[١٤٣].

## هەڵقوڵانی ئاو لە نێو پەنجەکانی:

چەندین جار شتیوا رویداوە، لێرەدا چەند روداوێکی لێ دەگێڕینەوە: جابیر(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((رۆژی حودەیبیە خەڵکەکە تێنویان بو، جەوەندەیێ ئاو لەبەردەستی پێغەمبەردا بو، کە دەست نوێژی هەڵگرت، خەڵکەکە پەلاماری جەوەندەکەیان دا، فەرموی: ئەوە چیتانە؟ بۆ وادەکەن؟ گوتیان: جگە لەم ئاوەی بەردەستت نە بۆ دەستنوێژ نە بۆ خواردنەوە ئاوی ترمان نیە، پێغەمبەرﷺ دەستی خستە ناو جەوەندەکەوە ئیتر ئاو لە نێو پەنجەکانیەوە وەك کانی ئاو هەڵدەقولا، هەم تێرمان لێ خواردەوەو هەم دەستنوێژمان لێی گرت. لە جابریان

---

[١٤٣] مشكاة المصابيح (٣/١٦٨).

پرسی: (چەند کەس دەبون؟) گوتی: (هەزارو پێنج سەد کەس بوین، بەلام ئەگەر سەد هەزار کەسیش باین بەشی دەکرد)). بوخاری‌و موسلیم گێڕایتیانەوە[144].

هەروەها ئاوی بیری حودەیبیەی زۆر کردوە: بەڕائی کوڕی عازب(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((لە ڕۆژی حودەیبیەدا لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ هەزار و چوارسەد کەس دەبوین، حودەیبیە بیرێکە، ئاوەکەمان هەڵێنجا و دڵۆپێکمان تێدا نەهێشتەوە، خەبەری ئەمە بە پێغەمبەرﷺ گەیشت، بەرێزی هات لە لێواری بیرەکە دانیشت، لە ئاوی بیرەکە دۆلکە ئاوێکی داوا کردو بۆمان برد، دەستنوێژی پێ شوشت و هەندێ ئاوی لە دەم وەردا، ئەنجا نزای خوێندو ئاوەکەی ڕژاندەوە ناو بیرەکە، پاشان فەرموی: ماوەیەك وازی لێ بێنن، ماوەیەك وازمان لێ هێنا، ئیتر تا ڕۆیشتین ئاومان لێ هەڵێنجا هەم خۆمان و هەم وشترەکانیشمان لێ تێراوکردن.)) بوخاری گێڕایتیەوە[145].

عەبدڵلای کوڕی مەسعود(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((ئێمە نیشانەو موعجیزەمان بە فەڕوفیت هەژمار دەکرد، کەچی ئێوە بە هەڕەشەی تێدەگەن، جارێکیان لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بوین، ئاو زۆر کەم بو فەرموی: بگەڕێن بزانن هەندێ ئاو نادۆزنەوە، لە قاپێکدا ئاوێکی کەمیان بردە خزمەتی، دەستی پیرۆزی خستە ناوی‌و فەرموی: ((حيَّ على الطهور المبارك والبركة من الله: دەی ئاوی پاك هەڵڕێژەو بەرەکەتیش لەلای خوایە))، دیتم ئاو لە نێو پەنجەکانی پێغەمبەرداﷺ هەڵدەقولا، گوێمان لە پاکیکردنی خواردنیش بو کە دەخورا.)) بوخاری گێڕایتیەوە.

---

[144] متفق عليه (مشكاة المصابيح ٣/١٧٠).

[145] مشكاة المصابيح (٣/١٧٠).

## پارێزراو بونی لە چنگی دوژمنان:

کاتێك پێغەمبەرﷺ بەرەو شاری مەدینە کۆچی دەکرد، سوراقە شوێن پێی هەڵگرت و خەریکبو بیگاتیٚ، بەڵام ئەسپەکەی هەتا بن زگی لە هەردی رەق رۆچو، سوراقە گوتی: وا دەزانم توکتان لیٚ کردم، نزام بۆ بکەن رزگارم بێت وازتان لیٚ دێنم، پێغەمبەرﷺ نزای بۆ کردو رزگاری بو، ئیتر هەر کەسێکی لە رێگەدا بدیتبا پێی دەگوت بگەڕێوە لێرە نیە. بوخاریو موسلیم گێڕایتیانەوە[١٤٦].

لە جەنگی حونەین کە موسڵمانان شکستیان خوارد، پێغەمبەرﷺ و هەندێك لە موسڵمانەکان کە پەیمانیان لە ژێر درەختەکەدا بەستبو خۆیان راگرت و هەڵنەهاتن، کە شەڕ گەرم بر پێغەمبەرﷺ چەند وردە بەردێکی هەڵگرتەوەو بەروی بێبڕواکانی داکرد، پاشان فەرموی: خوایە! با ئەم کافرانە شکست بخۆن، عەبباس کە روداوەکە دەگێڕێتەوە دەڵێ: بەو خوایە هەرکە وردە بەردەکانی هەڵدانیٚ ئیتر شەکەت بون و گلۆڵەیان کەوتە لێژی. موسلیم گێڕایتیەوە[١٤٧]

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع(رەزای خوای لێبێ)، ئەویش وا دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((لە جەنگی حونەیندا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بوین و شەڕمان لەگەڵ بێبڕواکان دەکرد، کە پەلاماریان هێنا، پێغەمبەرﷺ لە سەر هێسترەکەی دابەزیو مشتە خۆڵێکی هەڵگرتەوەو بەروی کافرەکانیدا پەرش کردو فەرموی: (خوا روتان دزێو کا)، ئیتر کەسیان نەبو لەم خۆڵە نەچێتە چاوی، ئیتر دەستبەجیٚ پشتیان هەڵکردو

---

[١٤٦] مشكاة المصابيح (١٦٦/٣).

[١٤٧] مشكاة المصابيح (١٧٢/٣).

خوا شكستی پیّ خواردن، پیّغەمبەریشﷺ غەنیمەكانی بەسەر موسڵمانان دابەش كرد.)) موسلیم گێڕایتیەوە[148]

هەروەها جارێكیان ئەبو جەهل سوێندی بەلات و عوززا خوارد ئەگەر ببینیّ پیّغەمبەرﷺ لە مزگەوتیّدا نوێژ دەكات دەبیّ لەبەر چاوی ئاپۆرەی قورەیشیان پێی بخاتە سەر ملی و دەموچاوی لە خۆڵیّ وەر بدات، كە پیّغەمبەرﷺی دیت وا لە سوژدە دایە ویستی سوێندەكەی بێنیّتە جیّ بەڵام كە نزیك كەوتەوە لە هێكڕا پاشەكشەی كردو دەستەكانی بەملاوئەولادا دەكوتا، گوتیان: ها چیە؟ گوتی: نیّوانمان كەندەلانێكی پڕ لە ئاگری ترسناك و بلێسەدارە، پیّغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر لیّم نزیك بكەوتبایەوە فریشتەكان گازگاز دەیانڕفاند.)) موسلیم گێڕایتیەوە[149].

---

[148] مشكاة المصابيح (٣/١٧٢).

[149] جامع الأصول (١٢/٩٤).

## قبوڵبونی نزا:[150]

### موسڵمانبونی دایکی ئەبو هورەیرە:

ئەبو هورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((دایکم بتپەرست بو، دەمویست بیکەمە موسڵمان بەڵام نەدەبویٚ، رۆژێك گوتم وەرە ببە موسڵمان، کەچی قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەرﷺ گوت، منیش زۆرم پێ ناخۆش بو، بەگریانەوە چومە خزمەت پێغەمبەرﷺ و پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ماوەیەکی درێژە تەقەلاّ دەدەم دایکم ببێتە موسڵمان نابتیٚ، ئەمرۆ روم لێنا موسڵمان بێ، کەچی وێڕای ئەوەی بەگوێی نەکردم زۆر قسەی ناشیرینی بە تۆش گوت، جا لە خوا داوا بکە ببێتە موسڵمان، فەرموی: (خوایە! دایکی ئەبو هورەیرە رێنوێن بکەو ببێتە موسڵمان)، منیش بەم نزایە دڵخۆش بوم و گەڕامەوە، کە گەیشتمە بەر دەرگا دیتم داخرا بو، دایکم گوێی لە دەنگ و خشپەی پێم بو، گوتی: ئەبو هورەیرە! لەجێی خۆت بوەستە، لە هەمان کاتدا گوێشم لە خوڕەو شڵپەشڵپی ئاو بو، تومەز خۆی دەشوشت، پاشان کراسەکەی لەبەرکردو دەرگاکەی کردەوە، لە خۆشییان لە بیری چوبو سەرپۆشەکەی بەسەر خۆی دادات، ئەنجا گوتی: اشهد أن لا إلـه إلاّ الله واشـهد أن محمـداً رسـول الله، ئیـتر منیـش گەڕامـەوە لای پێغەمبەرﷺ لەخۆشیان دەگریام، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا مژدەت دەمیٚ خوا نزاکەی قبوڵ کردیو دایکم موسڵمان بـو، پێغەمبـەرﷺ سـوپاس و ستایشی خوای کرد و گەلیٚ قسەی باشی فەرمو.)) موسلیم گێڕایتیەوە.

---

[150] بگەڕێوە بۆ پەرتوکی (معجزات المصطفى)ی خير الدين وائلی/٦١ و لەوێدا تەماشای ئەم فەرمودانە بکە.

**به سای نزای پێغەمبەر ﷺ بو بە سوارچاك:**

جەریری کوڕی عەبدوڵلا(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەرﷺ پێی گوتم: ئەو ذولخەلەصەیەم[151] لەکۆڵ ناکەیەوە؟ گوتم: بەسەر چاو، بەڵام من خۆم لەسەر ئەسپ راناگرم، پێغەمبەرﷺ دەستێکی لە سنگم دا بە جۆرێك شوێنەواری دەستی لەسەر سنگم نەخشا، فەرموی: (خوایە سەقامگیری بکەو رێنوێنی پێ ببەخشەو بیکە رێنوێنیکەر)، دەڵێ: ئیتر هەرگیز لەسەر ئەسپدا نەگلاوم، پاشان بەخۆ بە پێنج سەد سوارچاکی مەردو بەجەرگ بۆی دەرچوین سوتاندمان و تێکمان شکاند.)) متفق علیه.

ئەنەس دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ خەڵکی مەدینە توشی قاتیوقڕی بون، رۆژی هەینی بو پێغەمبەرﷺ خەریکبو وتاری دەدا لەو کاتەدا پیاوێکی رەشماڵنشین هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لەبەر بێ‌بارانی ئاژەل و وڵاخ و ماڵاتمان قڕ بون، لە خوا بپاڕێوە بارانمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەرﷺ هەر دو دەستی راهێلاو پاڕایەوە، ئەنەس دەڵێ: ئاسمان یەك پەڵە هەور چیە نەیبو، سوێند بەخوا هێشتا دەستی نەهێنابوە خوارێ با هەڵیکردو پەڵە هەوری وەك کەرتە شاخی هێنا، هێشتا لەسەر دوانگەکەی دانەبەزیبو تنوکە باران بە ریشیدا دەهاتە خوارەوە، ئیتر باران دایکرد، ئەو رۆژی و سبەینێ‌و بۆ دو سبەی و تا هەینی هەر دەباری.

لە هەینی داهاتودا هەر ئەم پیاوە بو یا یەکێکیتر هەڵساوەو گوتی: ئەی پەیامبەری خوا! لەبەر بارانێ خانو و ماڵ روخاو رێگەوبان بڕا، لە خوا بپاڕێوە چیتر نەبارێ، پێغەمبەریش دەستی بۆ نزا بەرزکردەوەو فەرموی: خوایە لە

[151] ذولخەلەصە خانوی خەثعەمی یاخی بو پێیان دەگوت کەعبەی یەمامە.

دەوروبەرمان بیبارێنە نەك بەسەر سەرمان، تەماشام کرد گورج هەورەکە لەسەر ئاسمانی مەدینە رەویەوەو وەك بازنە لە دەوری مەدینەدا خەرمانەی دا، دۆڵی قەنات تا مانگێك هەڵسا هەر یەك بهاتبایە مەدینە باسی بەرەکەتەکەی دەکرد.))

لەگێڕانەوەیەکی تردا: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((خوایە! بەسەرسەرمان مەیبارێنە لە دەوری شاردا بەسەر زورگ و گرد و دۆڵ و بنی درەختان بیبارێنە، دەڵێ: باران وەستا و کە لە مزگەوت چوینە دەرەوە هەتاو بو.)) بوخاری‌و موسلیم گێڕایتیانەوە

## فیزبەرزێك توك کاری تێکرد

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پیاوێك لە ئامادەبونی پێغەمبەرﷺ نانی بە دەستی چەپ دەخوارد پێی فەرمو: بەدەستی راستت بخۆ. گوتی ناتوانم، فەرموی: یاخوە هەر نەتوانی، دەڵێ ئیتر نەیتوانی ئەم دەستەی بەرزبکاتەوە، ئەم پیاوە لەبەر فیزبەرزی ئەژنەوای پێغەمبەرﷺ نەبو. موسلیم گێڕایتیەوە

## بەرەکەتی نزای پێغەمبەرﷺ وشتری جابر بەهرەمەند دەکات

جابر(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ غەزام دەکرد، لەسەر وشترێك بوم شەنگی لێ بڕابو و نەیدەتوانی بڕوات، پێغەمبەرﷺ لە پشتەوە پێم گەیی فەرموی: وشترەکەت چی بەسەر هاتوە؟ گوتم کەشەنگ و ماندوە، پێغەمبەرﷺ دوا کەوت و خۆی تێخوڕی‌و نزای بۆ کرد ئیتر دوای ئەمە هەر لە پێشی پێشەوەی وشترەکانی‌تر بو، پێی فەرموم: ئێستا وشترەکەت چۆنە؟ گوتم: زۆر چاکە بەرەکەتی تۆی پێ گەیی، فەرموی: بە نۆقیە ئاڵتونێك

دەمفرۆشیێی؟ گوتم: بەڵێ، بەڵام تا مەدینە من سواری پشتی دەبم، کە پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە گەڕاوە وشترەکەم بردە خزمەتی، پارەکەشی دامێو وشترەکەشی دامەوە.)) متفق علیه.

## چاکردنەوەی نەخۆشان:[152]

### چاکردنەوەی پێی شکاو:

بەراء(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((پێغەمبەرﷺ چەند یاوەرێکی هەنارد تا ئەبورافیع بکوژن، کە شەو داهات عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك چوە ناو خانوەکەی و چوە ژورێ، ئەبورافیع نوستبو، عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك دەڵێ: شمشێرێکم دە زگی ئاخنیو لە پشتی دەرچو، زانیم کوشتم، ئیتر گەڕامەوەو دەرگاکانم دەکردەوەو دەهاتمە دەرەوە تا گەیشتمە پەیژەیەك، پێم داناو بەربومەوە لەم مانگەشەوەدا لاقم شکا، بە مەندیلەکەی سەرم لاقم پێچایەوەو گەڕامەوە تا گەیشتمەوە هاوڕێیانم، کە هاتینەوە لای پێغەمبەرﷺ روداوەکەم بۆ گێڕاوە، فەرموی: لاقت درێژکە، منیش درێژم کرد، دەستێکی بەسەر داهێنا، وا چاك بۆوە وەك بڵێی قەت نەشکاوە))[153].. ئەبورافیع کابرایەکی جولەکە بو و یەکێك بو لە دڕندەترین دوژمنەکانی پێغەمبەرﷺ پەیمانی خۆی شکاندبو و زۆر جوێنیشی بە پێغەمبەرﷺ دەدا.

---

[152] بۆ (معجزات المصطفی) بگەڕێوە.

[153] بوخاری گێڕاویەتیەوە.

## چاکردنەوەی چاوی عەلی کوڕی ئەبو تالیب:

سەهلی کوڕی سەعد(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا فەرموی: سبەینێ ئەم بەیداخە دەخەمە دەست یەکێك کە خواو پێغەمبەری خۆش دەوێ و خوا و پێغەمبەریش خۆشیان دەوێت، کە بەیانی داهات هەمو یاران چونە لای پێغەمبەرﷺ و هەر یەکەیان حەزی دەکرد ئەو بێ، فەرموی: کوا عەلی کوڕی ئەبو تالیب لە کوێیە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر ژانی چاوی پێی نەکراوە ئامادە بێت، فەرموی: بانگی بکەن، بانگیان کرد و هات، پێغەمبەرﷺ تفێکی خستە ناو چاوی، دەستبەجێ چابۆوە دەتگوت چاوی هەرگیز نەئێشاوە، بەیداخەکەی پێدا، عەلی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! هەتا وەك ئێمەیان لێ دێت هەر شەڕیان لەگەڵ بکەم؟ فەرموی: هێدی هێدی لەگەڵ سوپاکەتدا بەڕێ بکەوە تا دەگەیە مەیدان و نزیك ماڵەکانیان، لەوێ بۆ ئیسلام بانگیان بکەو ئەوەی مافی خوایەو ئیسلام لەسەری پێویست کردون پێیان ڕابگەیەنە، گەر ئەژنەوا بون باشە، دەنا شەڕیان لەگەڵ بەرپا بکە، عەلی! دە بەو خوادیە ئەگەر خوا یەك کەست پێ ڕێنوێن بکا ، لە هەرچی وشتری سور هەیە هەتبێ چاکترە، کە نایابترین مالی عەرەبە.)) متفق علیه

## لاقی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع:

یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید دەڵێ: ((شوێنەواری ڕاوەشانی شمشێرێکم لە لاقی سەلەمەی کوڕی ئەکوەع دیت، گوتم: ئەبو موسلیم! ئەوە چیە؟ گوتی: لە ڕۆژی غەزای خەیبەردا شمشێرێکیان ڕاوەشاندمێ و بە لاقم کەوت، خەڵك گوتیان سەلەمە پێی کەوت، هاتمە لای پێغەمبەرﷺ سێ فوی لێ کرد، ئێستاشی لەگەڵدا بێ ژانی نەکردەوە.)) بوخاری گێڕاتیەوە

## دەرکردنی جنۆکە لە جەستەی ڤێدارێك:

یەعلای کوڕی موڕەی ثەقەفی دەڵێ: ((لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا بوین بەدەم ئاوێك تێپەڕین، ئافرەتێك هات منداڵێکی پێ بو، جنۆکەیەکی مێینەی توش ببو، پێغەمبەرﷺ کەپوی گرت و فەرموی: (ئەمن پێغەمبەر موحەممەدم، وەرە دەرەوە)، پاشان ئەوێمان بەجێ هێشت، بەلای هەمان ئاودا گەڕاینەوە لە حاڵی منداڵە پەرکەمدارەکەی پرسی، دایکەکەی گوتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بەڕاستی ڕەوانەکردوە لە پاش هەنگیوە توش نەبۆتەوە))[١٥٤]

## ئاشکرا کردنی شتی پەنامەکی:

بۆ وێنە: باسکردنی خواو ناو و سیفەت و کردەوە پیرۆزەکانی، باسکردنی فریشتەو سیفەتەکانیان، باسکردنی جیهانی جنۆکان، باسکردنی بەهەشت و دۆزەخ.

هەروەها باسکردنی سەر گوزەشتە و روداوی رابردوان وەکو باسکردنی پێغەمبەران: ئادەم و نوح و هود و صالح و ئیبراهیم و موسا و عیسا و پێغەمبەرانی دیکەش، بە درێژی باسی گفتوگۆکانی کردوە کە لەگەڵ نەتەوەکانیان ئەنجامیان داوە، ئەم جۆرە کارە لە باری نەخوێندەوارێکی نەنوس و نەخوێنددا نیە، زانیاریەکانیش لەگەڵ زانیاری تۆژەرەوانی مێژوی گەلان و زاناکان پێچەوانە نیە، هەروەها هەندێ هەواڵی داوە کە نەتەوەناسی پەی پێ نەبردوە، یاخۆ شتی وای باس کردوە کە زاناکانی نامەوەران شاردوتیانەوەو

---

[١٥٤] لە (شرح السنە)دا گێڕاویتیەوە، هەروەها ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا (١٧٢/٤) بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویتیەوە، هەروەها لە (المشكاة) (١٨٨/٣) دا هاتوە بە تەحقیقی شێخ ئەلبانی.

زۆر زانیاری چەواشە کراوی لای ئەوانیشی راست کردۆتەوە، ئەمانە هەر هەموی بەڵگەی ئەوەن کە لە لایەن خوایەکی زاناو شارەزاوە ئەم پەیامانەی وەرگرتوە: ﴿تِلْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَا أَنتَ وَلاَ قَوْمُكَ: ئەوانە هەموی هەواڵی پەنامەکین کە بە سروش بە تۆی رادەگەیەنین، نە تۆ دەتزانی نە گەلەکەت﴾ هود/٤٩، خوا لە چەندین شوێنی تردا ئاماژە بەم بەڵگەیە دەکات: لە رەوتی گێڕانەوەی باسوخواسی مەریەمدا دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يُلْقُونَ أَقْلاَمَهُمْ أَيُّهُمْ يَكْفُلُ مَرْيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ يَخْتَصِمُونَ: ئەوانەی کە پێت دەڵێین هەواڵی پەنامەکین، بە سروش بۆت دەنێرین، تۆ لە لای ئەوان نەبوی کاتێ قەڵەمەکانیان هاوێشت ئاخۆ دەستە بەرێتی مەریەم بەرکامیان دەکەوێ، تۆ لە لای ئەوان نەبوی کە لەم بابەتەوە مشتومڕیان بو﴾ آل عمران/٤٤.

لە رەوتی گێڕانەوەی باسوخواسی پێغەمبەر موسا(سڵاوی خوای لە سەر بێت):
﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ الطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَكِنْ رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَا أَتَاهُمْ مِنْ نَذِيرٍ مِنْ قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ: تۆ لە تەنیشت شاخی طور نەبوی کە بانگمان کردە موسا بەڵام خوا بە میهری خۆی سروشی بۆ ناردوی تا گەلێکی پێ بێدار بکەیەوە کە بەر لە تۆ پێغەمبەریان بۆ نەهاتوە بەڵکە یادەوەر دەبن﴾ القصص/٤٦.

جگە لەمانە زۆر روداوی هەنوکەیی نادیاری لە کاتی خۆیدا ئاشکرا کردوە:

لە رۆژی جەنگی موئتەدا هەواڵی شەهید بونی هەر سێ سەرکردەی موسڵمانان و بە فەرماندەبونی خالیدی کوڕی وەلیدی بە یاوەران راگەیاند. بوخاری ئەمەی گێڕاوەتەوە.

که نەجاشی مرد هەمان رۆژ بە موسڵمانانی راگەیاند، کە کیسراش مرد هەر رایگەیاند.

هەروەها پێغەمبەرﷺ هەواڵی چەندین رووداوی ئایندەی ر ـەیاندوە کە هەندێکیان رویانداوەو هەندێکی تریش وا رودەدەن و هەندێکی تریش هێشتا رویان نەداوە:

کاتی خۆی بەر لە روودانی شەڕی بەدر پێغەمبەرﷺ شوێنی کوژرانی سەرکردە یاخی و سەرسەختەکانی قورەیشی دیار کرد، ئەنەس(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ هانی خەڵکەکەی دا و رۆیشتن تا لە (بەدر) دابەزین، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئێرە شوێنی کوژرانی فلان کەسە، دەستی لەسەر زەوی دادەناو دەیفەرمو ئێرە هی فلانە، ئێرە هی فلان کەسە، دەڵێ: ئەوانەی پێغەمبەرﷺ دیاری کردبون بە بست لە شوێنەکە لایان نەدابو، رێك لەوێ کوژرابون. موسلیم گێڕایتیەوە[155].

یەکێکی تر لەو پەنامەکیانەی پێغەمبەرﷺ لەدوای مەرگی خۆی هەواڵی پێداوە ئەو فەرمودەیە کە ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە: ((إذا هلك كسرى فلا كسرى بعده وإذا هلك قيصر فلا قيصر بعده، والذي نفسي بيده لتنفقن كنوزهما في سبيل الله: ئەگەر کیسرا لەناو بچێت ئیتر کسرای تر پەیدا نابێتەوە، ئەگەر قەیسەر لەناو بچێ ئیتر قەیسەری تر پەیدا نابێتەوە، سوێند بەو خوایەی گیانی منی لەدەستە، گەنجینەکانیان ئێوە لە پێناو خوا خەرج دەکەن)) رواه البخاري ومسلم والترمذي[156]، هەڵبەت پێغەمبەرﷺ چۆنی فەرمو ئاوەها رویدا.

---

[155] مشكاة المصابيح (٣/١٦٧).

[156] جامع الأصول (١٢/٥٩).

پێغەمبەرﷺ زۆر فەرمودەی تری لەبارەی روداوەکانی ئاخیرزەمانی باس کردوە؛ حوذەیفەی کوڕی یەمان(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەرﷺ جارێکیان هەڵسایەوە وتارێکی بۆ فەرموین، لەم وتارەدا هەتا رۆژی دوایی هەرچی رودەدات هەر هەموی باس کرد هیچی هەڵنەبوارد، جا ئەوەی ئەزبەر کرا ئەزبەر کرا، ئەوەی لەیاد کرا لەیاد کرا، ئەو برادەرانەی من دەیزانن، منیش زۆر شتم لە یادکردوە، بەڵام هەرکە رودەدات یەکسەر دێتەوە یادم، وەك چۆن یەکێك کەسێك ببینێ پاشان ماوەیەك نەیبینێ و لەیادی بکات، جا هەر کاتێك بیبینێتەوە بەیادی بێتەوە، من و روداوەکانیش ئاوەهاین.)) بوخاریو موسلیم و ئەبو داود گێڕایتیانەوە[١٥٧]

## کوڕکاندنی بنکە دارخورما:

لە صەحیحی بوخاریدا هاتوە کە: ((بانی مزگەوتەکەی پێغەمبەرﷺ لەسەر چەند کۆڵەگەیەکی دارخورما دروست کرابو، لە پێشدا پێغەمبەرﷺ کە وتاری دەخوێندەوە لە پاڵ یەکێك لەو کۆڵەگە دارخورمایانەدا رادەوەستاو شانی پێدا دەدا.. بەڵام پاشان کاتێ دوانگە دروست کرا، پێغەمبەرﷺ چوە سەریو ئەوی جێ هێشت، گوێمان لێبو ئەو بنکە دارخورمایە وەك وشترێك کە لەسەر گوان بێ یا وشترێك کە تازە زابێ ئاوەها بۆ پێغەمبەرﷺ ئاوەها دەیکورکاند، پاشان پێغەمبەرﷺ دابەزیوەو دەستێکی پێدا هێناوە ئەنجا داسەکناو بێ دەنگ بو))[١٥٨].

[١٥٧] جامع الأصول (٦٣/١٢).

[١٥٨] جامع الأصول (٦٨/١٢).

## شوێنکەوتن و سڵاو و گوفتاری دار و درەختان:

جابر(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((لەگەڵ پێغەمبەردا کەوتینە ڕێو ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە دۆڵێکی پان وپۆڕ و بەرین و لەوێ لاماندا، پێغەمبەرﷺ چو دەست بە ئاو بگەیەنێ، منیش بە مەتارەیێ ئاو شوێنی کەوتم، پێغەمبەرﷺ تەماشای کرد هیچی نەدیت خۆی پێ پەنادات، لەوپەڕ دۆڵەکەوە دو درەخت هەبون، پێغەمبەرﷺ چوە لای یەکێکیان و لقێکی لێ گرت و بەدرەختەکەی فەرمو: بە فەرمانی خوا شوێنم کەوە و لەدوام وەرە، لە دوای ڕۆیشت، چوە لای درەختەکەی ترو کە گەیشتە نێوان هەردوکیان، فەرموی: بە فەرمانی خوا بەیەکەوە بنوسێن و پەنام بۆ بکەن، درەختەکانیش بەیەکەوە نوسان و تێکچرژان و بونە پەنا تا سەراوەکەی تەواو کرد، جابر دەڵێ: منیش بەغار دور کەوتمەوە نەبادا پێغەمبەرﷺ هەست بکا نزیکم و ئەو دور بکەوێتەوە -یا زیاتر خۆی دور بگرێ- ئینجا دانیشتم و لەبەرخۆمەوە بیرم لەوە دەکردەوە و سێ و دوی دڵی خۆم دەکرد، کە ئاوڕم دایەوە تەماشام کرد وا پێغەمبەرﷺ بەرەو لای من دێت، درەختەکانیش لەیەك جوێ بوینەوە و هەر یەکەی لەسەر بنکی خۆی وەستاوە و چاوەنواڕی فەرمانی پێغەمبەرن، بینیم پێغەمبەرﷺ ئێستێکی کرد ئاماژەیەکی بەسەری کرد، ئەوجا درەختەکان چونەوە شوێنی خۆیان.)) موسلیم گێڕایتیەوە

یەعلای کوڕی مورەی ثەقەفی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: ((لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەرێ کەوتین و ڕۆیشتین تا لە شوێنێك هەوارمان هەڵدا، پێغەمبەرﷺ پالی داوەو خەوی لێکەوت، درەختێك هێدی هێدی زەوی هەڵدەدڕیو دەهات تا لە پێغەمبەرﷺ نزیك بۆوەو سێبەری لێکرد، پاشان گەڕاوە شوێنی خۆی، کە

**پێغەمبەر ﷺ لەخەو هەڵسا بۆمان گێڕاوە، فەرموی: ئەم دارە ودمی لە خوا خواست تا بێت سڵاو لە پێغەمبەری خوا بکات، خواش دەستوری دا))[١٥٩].**

**ئەنەس**(ڕەزای خوای لێبێ) **دەگێڕێتەوەو دەڵێ: پێغەمبەرﷺ بە سەبارەتی ئازارەکانی خەڵکی مەککە لەشی خوێناوی ببو و بە ماتەمی دانیشتبو، جبریل هاتەلای و پێی فەرمو: (حەز دەکەی نیشانەیەکت پێ نیشان بدەین؟) فەرموی: (بەڵێ)، تەماشای درەختێکی دواوەی خۆی کردو گوتی: (تەماشای بکە)، پێغەمبەرﷺ تەماشای کرد فەرموی: (بانگی بکە)، بانگی کرد، هات لەبەر دەستی راوەستا، پێی گوت: (فەرمانی پێ بدە بگەڕێتەوە)، فەرمانی پێکردو گەڕاوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (ئەوەندەم بەسە، ئەوەندەم بەسە)[١٦٠].**

**ئیبنو عەبباس**(ڕەزای خوای لێبێ) **دەڵێ: ((ڕەشماڵنشینێك هاتە لای پێغەمبەرﷺ و گوتی: چۆن بزانم تۆ پێغەمبەری؟ فەرموی: (بانگی ئەو هێشوەی ئەم دارخورمایە دەکەم، ئەگەر هات ئەوا گەواهی پێغەمبەرایەتیمە)، کەبانگی کرد دابەزی تا هاتە لای پێغەمبەرﷺ پاشان فەرمانی پێکرد بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، گەڕایەوە، ڕەشماڵنشینەکە کە ئەمەی دیت بوە موسڵمان.)) ترمذی گێڕایتیەوە و بە صەحیحیشی داناوە**

**حەقی کوڕی عبدالرحمن دەڵێ: خۆم لە باوکم ژنەوت دەیگوت: لە مەسروقم پرسی کێ هەواڵی بە پێغەمبەرﷺ دا کە جنۆکە گوێدێری قوڕئان خوێندن بون،**

---

[١٥٩] لە (شرح السنە)دا گێڕایتیەوە، هەروەها ئیمام ئەحمەدش گێڕایتیەوە و سەنەدەکەی زەعیفە، بەڵام لە فەرمودەیەکی جابردا کە دارمی (١٠/١) گێڕایتیەوە دەبێتە شاهیدی، چیرۆکەکە ڕاست و صەحیحە هەروەکو شێخ ئەلبانی لە (المشکاة: ١٨٨/٣)دا گوتویەتی.

[١٦٠] دارەمی گێڕایتیەوە و سەنەدەکەشی صەحیحە هەروەکو لە (المشکاة) (١٨٨/٣) باسکراوە.

گوتی: باوکت-که عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودە-گوتی: درەختێك ئەم هەواڵەی پێداوە. متفق علیە

ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((لەگەڵ پێغەمبەرﷺ لە سەفەرێکدا بوین ڕەشماڵنشینێك ڕوەو ڕومان دەهات کە نزیك بۆوە پێغەمبەرﷺ بانگی کرد: (گەواهی دەدەی خوا تاکەو هاوەڵی نیە، منیش پێغەمبەری خوام؟) گوتی: (ئەدی کێ گەواهی لەسەر قسەی تۆ دەدات؟) فەرموی (ئەو درەختە)، درەختەکە لە ڕەخی دۆڵدا بو پێغەمبەرﷺ بانگی کرد، درەختەکە زەوی هەڵدەدڕی و بەرەو لای پێغەمبەرﷺ هات تا لەبەر دەستی ڕاوەستا پێغەمبەرﷺ سێ جاران داوای شایەتمانی لێکرد دارەکەش سێ جاران شایەدی داو پێغەمبەرﷺ چی فەرمو گوتیەوە، پاشان گەرایەوە شوێنی خۆی.))[161]

## سڵاو کردنی بەرد:

جابری کوڕی سەمورە(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: ((پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئێستاش بەردێك لە مەککەدا دەناسمەوە کە پێش ئەوەی ببم بە پێغەمبەر سڵاوی لێ دەکردم.)) موسلیم و ترمذی گێڕایتیانەوە.

## سکاڵای وشتر:

یەعلای کوڕی موڕەی ثەقەفی دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەڕێدا دەڕۆیشتین، بەلای وشترێك ڕابورین ئاوکێشی پێ دەکرا کە پێغەمبەرﷺی دیت کوڕکەکوڕکێکی کردو ملی خستە سەر زەوی، پێغەمبەرﷺ هەڵوەستەی کردو

---

[161] دارەمی گێڕایتیەوە و ئیسنادەکەی صەحیحە هەروەکو شێخ ئەلبانی لە (مشکاة المصابیح) (١٨٩/٣) گوتویەتی.

فەرموی: (کوا خاوەنی ئەم وشترە؟) خاوەنەکەی هات پێی فەرمو: (بمفرۆشێ)، گوتی: (بەڵکو پێشکەشت بێ ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵام هی خانەوادەیەکە جگە لەمە بژێوی تریان نیە)، فەرموی: (مادەم وایە ئاگاتان لێبێ، چونکە سکاڵای بۆ لای من هێناوە زۆری ئیش پێدەکەن و ئالیکی کەم دەدەنێ)[١٦٢].

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر(ڕەزای خـــوای لێبێ) دەڵێ: ((ڕۆژێک لە پشت پێغەمبەرﷺ سوار ببوم، قسەیەکی بە نهێنی پێ گوتم قەت بە کەسی ناڵێم، پێغەمبەرﷺ لە پێشاودا حەزی دەکرد خۆی لە نێو دارخورمای تێکچرژاودا پەنا بدات، بەم مەبەستە چوە نێو باخی یاریدەدەرێک کە وشترێک لەوێدا بو کە پێغەمبەرﷺی دیت کورکاندی و فرمێسک لە چاوەکانی هاتەخوارەوە، پێغەمبەرﷺ هات دەستی بەسەر پشتی داهێنا، دەستی بەسەر هێسکی پشت گوێ تا کۆپارەکەی دادەهێنا، وشترەکە داسەکناو بێدەنگ بو، فەرموی: (کێ خاوەنی ئەم وشترەیە؟ ئەم وشترە هی کێیە؟) گەنجێکی یاریدەدەر هات و گوتی: (هی منە ئەی پێغەمبەری خوا)، فەرموی: (لە خوا ناترسێی کە ئەم وشترەی پێداوی و سکاڵای بۆ من هێناوە برسی و ماندوی دەکەی؟))[١٦٣].

---

[١٦٢] لە (شرح السنە)دا گێڕایتیەوەو ئیمام ئەحمەدیش گێڕایتیەوە و سەنەدەکەی زەعیفە بەڵام لە فەرمودەکەی جابردا شاهیدی هەیە کە دارمی (١٠/١) گێڕایتیەوە، روداوەکەش صەحیحە هەر وەکو شێخ ئەلبانی لە (المشکاە ١٨٨/٣)دا وای وتوە.

[١٦٣] ئەبو داود و حاکم و ئەحمەد و ئیبنو عەساکر-کە بێژەکە هی ئیبنو عەساکیرە-گێڕایتیانەوە، ئیسنادەکەشی لەسەر شەرتی موسلیم صەحیحە، موسلیم بە هەمان ئیسناد فەرمودەی تری هێناوە (بگەڕێوە بۆ سلسلە الأحادیث الصحیحە - للألبانی ٢٨/١).

# ئاساسمێنەكانی جگە لە پێغەمبەران

## كەرامەتی دۆستانی خوا:

یەكێك لە بنەما و بنەڕەتەكانی یارانی ڕێباز و كۆمەڵ بەڕاست زانینی كەرامەتی [١٦٤]دۆستانی خوا و هەمو ئەو ئاساسمێنانەیە كە لە بارەی جۆرەها زانست و ئاشكراكردن و جۆرەها توانست و كارتێكردن خوا لەسەر دەستی دۆستانی خۆی رایدەنوێنێ[١٦٥]، چەند چینە موسڵمانێك هەبون لارییان لە بونی كەرامەتی دۆستانی خوا دەكرد، یەكێك لەم چینانە موعتەزیلەكان بون، بیانویان ئەوەبو گوایە ئەگەر ئاساسمێنی جگە لە پێغەمبەران راست بوایە ئەوا پێغەمبەر و دۆستی خوا تێكەڵ دەبون و لەیەك جیا نەدەكرانەوە، موعجیزەش نەدەبوە بەڵگەی راستێتی پێغەمبەرایەتی[١٦٦]، هەڵبەت ئەم وتەیە وەرناگیرێ و دروست نیە، چونكە قورئان خۆی چەندین كەرامەتی دۆستانی خوای یاد فەرموە، چەندینیان لە فەرمودەی تەواوی پێغەمبەرﷺدا یاد كراون تەنانەت بە پلەی موتەواتیریش هەژمار دەكرێن، شاراوەش نیە كە لە هەمو رۆژگار و هەرێمێكدا شتی وا بوەو دەبێ، گومانی ئەم چینە موسڵمانە ئەو كاتە راستە ئەگەر دۆستەكە كەرامەتی هەبێو بانگەشەی پێغەمبەرایەتیش بكات، كە

---

[١٦٤] یەكتاناسان بەم جۆرە پێناسەی كەرامەت دەكەن: بریتیە لەو ئاساسمێنانەی كە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی لەگەڵدا نیەو پێشینەیەكیش نیە بۆ بە پێغەمبەر بون، لەسەر دەستی بەندەیەكی چاكەكار و پەیرەوكاری بەرنامەی ئەو پێغەمبەرەی بۆی بەرفەرمانە دێتەدی، هەروەها خاوەن بیروباوەڕێكی راست و دروست و بكەری كرداری چاك بێ، ئەنجا بە كەرامەتەكەی بزانێ یان نا (لوامع الأنوار البهية ٢/٣٩٣).

[١٦٥] مجموع فتاوى شيخ الإسلام (٣/١٥٦).

[١٦٦] شرح العقيدة الطحاوية لاپەڕە ٥٦٣.

ئەمەش ناکرێ چونکە لەو کاتەدا نابێتە دۆستی خوا بەڵکو دەبێتە پێشبینێکی (کاهن) درۆزن و ساختەکار[١٦٧]، ئەحمەدی پێشەواش ناشادی خۆی بەرامبەر ئەوانە دەربڕیوە کە بڕوا بە کەرامەتی دۆستان ناهێنن و بە گومڕاوی داناون[١٦٨].

## حیکمەتی کەرامەتی دۆستانی خوا:

خوا کە هەندێ لە بەندەکانی خۆی بە چەند کارێکی ئاساسمێن بەهرەمەند دەکات لەبەر خاتری چاکەمەندیو پتەوی بڕواکەیانە، رەنگە بۆ ئەوە بێ ئاتاجێکیان بێنێتە دی وەکو ئاتاجی خواردن و خواردنەوە، یان رەنگە بۆ بەرزەوە بون و سەرکەوتنی دینی خوا بێ، یان بۆ دامەزران و سەلماندنی رەواو پوچاندنەوەی ناڕەوا بێت[١٦٩]، بۆ وێنە خوا لە قورئاندا باسی پایەی خاتو مەریەم دەکات کە لە زستاندا میوەی هاوینی لەلادا بو، لە هاوینیشدا میوەی زستانی لەلادا بو: ﴿كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقًا قَالَ يَامَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ: هەر جارەی زەکەریا بچوبایە لای مەریەم خواردنی لەلادا دەبینی، گوتی: مەریەم! ئەم خواردنەت لە کوێ بو؟ گوتی: لە خواوەیە، خوا بژێوی بەبێ هەژمار بە هەر کەسێك دەدا کە بیەوێ﴾ آل عمران/٣٧.

---

[١٦٧] شرح العقيدة الطحاوية.

[١٦٨] لوامع الأنوار البهية (٢/٣٩٣).

[١٦٩] کەلامناسان زۆربەیان ئاساسمینەکان تەنها بۆ پێغەمبەران دەسەلمێنن (شرح العقيدة الطحاوية ل ١٥٨).

هەروەها ئەوەی بەسەر ئەشکەوتیەکاندا هات، کە خوا بۆ ماوەی سێسەدونۆ ساڵان گوێی کەڕ کردن، بە درێژایی ئەم ماوە دورو درێژە جەستەیانی لە رزیبون پاراست، لە سورەتی کەهفدا یادیانی فەرموە.

زۆر کەرامەتی دیکەش کە بەسەر یاوەرانی خۆشەویستمان داهاتوە.

## گۆچانی پرشنگدار:

لە شەوێکی تاریکی شەوەزەنگدا ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و عوببادی کوڕی بیشر(رەزای خوایان لێبێ) بە ئیشێك دەچنە لای پێغەمبەرﷺو پاشان کە دێنە دەرەوە گۆچانی یەکێکیان داگیرسا تا پێکەوە بون لەبەر روناکیەکەیدا رۆیشتن، کە لێك جویێ بونەوە گۆچانی ئەوی تریشیان هەڵگیرسا، تا گەیشتنەوە ماڵێ هەر داگیرسابون. بوخاری گێڕایتیەوە[170].

## خۆراکی بە پیت و بەرەکەت:

پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە موسڵمانان کرد ئەوانەی لەژێر کەپرەکە دان میوانداری بکرێن، ئەبو بەکری بڕواڕاست(رەزای خوای لێبێ) سێ موسڵمانی بەمیوان بردەوە ماڵێ، لە ماڵێی بەجێ هێشتن تا خێزانەکەی خواردنیان بداتێ، بە خۆشی چوە لای پێغەمبەرﷺ، درەنگی شەو گەڕایەوە ماڵێ، خێزانەکەی گوتی: بۆ نەهاتیەوە خزمەت میوانەکان؟ گوتی: بۆ خواردنت نەداونێ؟ گوتی: رازی نەبون نان بخۆن تا دێیتەوە، ئەبو بەکر تورەبو و گوتی: بەو خوایە مادەم وایە ئەمن نایخۆم، ژنەکەش گوتی: بەو خوایە! ئەمنیش نایخۆم، میوانەکانیش گوتیان: بەخوای دەنا ئێمەش نایخۆین، ئەبو بەکر سارد بۆوە و گوتی: ئەوە

---

[170] مشكاة المصابيح (١٩٧/٣).

دنەی شەیتانە، خواردنەکە بێنە با بیخۆین، ئەو دەستی پێکردو مێوانەکانیش لە دوای ئەو دەستیان پیێکرد، هەر پارویێکیان دەخوارد پتری لەبن بەجیێ دەماو زۆرتر دەبو، ئەبو بەکر گوتی: خوشکی بەنی فیراس ئەوە چیە؟ گوتی: ئای لە خۆشی خۆم ئێستا بەقەد سێ هەندەی پێشوە! پاشان بۆ پێغەمبەریشی نارد ئەویش خواردی. متفق علیه[١٧١].

هەڵبەت ئەمە رێزلێنانێکی خوا بو بۆ ئەبوبەکر چونکە بەهۆی تورەبونەکەوە کاری ناپەسندی نەکرد، بەڵکو سارد بۆوە و لوتی شەیتانی لە خۆڵێ نا و خواردنەکەی خوارد، خواش رێزی لێ نا.

## سوفەینە و شێرێك:

سوفەینەی ئازادکراوی پێغەمبەرﷺ لە ناو خاکی رۆمەکاندا لە لەشکری موسڵمانان دابڕابو یان یەخسیر کرابو، پێی لێناو هەڵات، لە رێگادا شێرێکی دوچار بو، پێی گوت: ئەی شێرەکە ئەمن ئازادکراوی پێغەمبەرمﷺ وام بەسەر هاتوە و نیازم وایە، دەستبەجێ شێر دامرکاوەو کلکەسوتێی بۆ کردو چوە تەنیشتی، لە رێگادا هەر دەنگێك بهاتبایە شێرەکە تاوی دەدایێو پاشان دەهاتەوە تەنیشت سوفەینە، بەم جۆرە تا گەیشتەوە لەشکری موسڵمانەکان، ئەنجا شێرەکە گەڕاوە[١٧٢].

---

[١٧١] مشكاة المصابيح (١٩٨/٣).

[١٧٢] تەبریزی لە مشكاة المصابيح دا دەڵێ: لە (شرح السنە)دا گێڕاێتیەوە لێکۆڵەرەکەش دەڵێ: رواه الحاكم بنحوه، وقال: صحيح على شرط مسلم وافقه الذهبي وهو كما قالاه (مشكاة المصابيح ١٩٩/٣).

## هاوارێك له مه‌دینه‌وه ده‌گاته شام:

ئیمام عومه‌ری خه‌تتاب(ره‌زای خـوای لێبـێ) له‌شـكرێك ده‌نـێرێ و (ساریه)ش ده‌كاته فه‌رمانده‌یان، رۆژێكیان ئیمام عومه‌ر(ره‌زای خـوای لێبـێ) وتاری هـه‌ینی ده‌دات، له نكاوێك هاوار ده‌كات: (ساریه! چیاكه بگره چیا)، پاشان نامه‌به‌رێك له له‌شكره‌كه‌وه ده‌گه‌ڕێته‌وه‌و ده‌ڵێ: فه‌رمانده‌ی بڕواداران! كه له‌گه‌ڵ دوژمن به‌ره‌نگار بوین شكاین له‌و كاته‌دا ده‌نگی هاوارێكمان بیست و ده‌یگوت: ساریه! چیاكه بگره چیا، ئێمه‌ش پشتمان دا چیاكه و خوا سه‌ری خستین[١٧٣].

## كۆمه‌ڵه كه‌رامه‌تێكی‌تر:

جگه له‌وانه‌ی باسمان كردن ئیبنو ته‌یمیه كۆمه‌ڵێك كه‌رامه‌تی تری هێناوه‌ته‌وه[١٧٤] كه ئێمه‌ش لێره‌دا ده‌یاننوسینه‌وه:

كاتێك خوبه‌یبی كوڕی عه‌دی(ره‌زای خوای لێبێ) یه‌خسیری ژێر ده‌ستی خه‌ڵكی مه‌ككه بو، خوا رێزی لێناو ترێی بۆ ئاماده ده‌بو، كه‌چی له سه‌رانسه‌ری مه‌ككه‌دا ده‌نكه ترێیه‌ك چیه نه‌بو.

ئوم ئه‌یمه‌ن كه كۆچی كرد نان و ئاوی له‌گه‌ڵ خۆیدا نه‌بردبو، له‌ڕێگه‌دا خه‌ریكبو له‌به‌ر تێنوێتی بمرێ، له وه‌ختی به‌ربانگدا گوێی له ده‌نگێك بو،

---

[١٧٣] ته‌بریزی ده‌ڵێ: به‌یهه‌قی له (دلائل النبوه)دا گێڕایه‌تیه‌وه، لێكۆڵه‌ری (المشكاه)یش ده‌ڵێ: ئیبنو عه‌ساكریش به ئیسنادێكی حه‌سه‌ن هاو شێوه‌ی گێڕاوه‌ته‌وه.

[١٧٤] مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١١/٢٧٦-٢٨١).

سەری بەرز کردەوە بینی دەولکێکی هەڵواسراوەیەو پڕی ئاوە، تێر تێری لێ خواردەوەو رۆژوەکەی شکاند پاشان تا مرد تێنوی نەبو.

بەرائی کوڕی مالیك(رەزای خوای لێبێ) ئەگەر سوێندی بخواردبا خوا بۆی دەهێنایە جێ، جارێکیان لە شەڕدا موسڵمانەکان لە ماندوێتیان رەتا بون، هاواریان کرد: بەراء! سوێند بخۆ، ئەویش گوتی: خوایە! سوێندت پێ دەخۆم قۆڵبەستیان بکەین و بیانشکێنین.. کە شەڕی قادسیە داهات گوتی: خوایە! سوێندم پێ خواردی قۆڵبەستیان بکەین و ببمە یەکەم شەهید، پاشان کە شەڕ روی دا قۆڵیان بەستن و شەهیدیش بو.

جارێکیان خالیدی کوڕی وەلید(رەزای خوای لێبێ) گەمارۆی قەڵایەکی سەختیان دابو و فەتح نەدەکرا، ئەوانیش دەیانگوت: دەست نادەین تا خالید ژەهر نەخوات، خالیدیش ژەهری خواردو کاری تێ نەکرد.

(زوبێرە) لەکاتی ئەشکەنجەداندا داوای بێبڕواییان لێ دەکرد، ئەویش تەنها ئیسلامی قبوڵ بو، چاوەکانی کوێر بون، بێبڕواکان گوتیان: لات و عوززا کوێریان کرد، گوتی: سوێند بە خوا درۆ دەکەن، خواش چاوەکانی پێ بەخشیەوە.

حەسەنی بەسرایی خۆی لە حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی شاردەوە، شەش جاران لێی دەچونە ژورەوە، ئەویش لەخوا دەپاڕاوە کە نەیبینن، ئەوانیش نەیان دەدیت.. هەروەها جارێکیان دوعای لە خەوارجێك کرد کە ئەشکەنجەی دەدا، دەستبەجێ قەلاویژ بۆوە و مرد.

ئوەیسی قەرەنی کە مرد لە ناو جل و بەرگەکانیدا هەندێ کفنیان دۆزیەوە کە پێشتر نەیبو، پاشان گۆڕێکی هەڵکەندراویان دۆزیەوە لادڕێکی لە تاشە

بەردێك بۆ هەڵكەندرابو، دواى ئەوەى لە كفنەكەيان هالأند و لە گۆڕەكەيان شاردەوە.

## راستاڵى مەزنترين كەرامەتە:

كە كەرامەت بە يەكێك دەبەخشرىٚ ماناى ئەوە نيە لە خەڵكان باشترو پايەدار ترە، چونكە رەنگە خوا بە بڕوا لاوازانى ببەخشىٚ بۆ ئەوەى بڕواكەيان پتەو بىٚ، يا بە ئاتاجێك بيبەخشىٚ بۆ ئەوەى ئاتاجيەكەى نەمێنىٚ، رەنگە ئەو كەرامەتانە بە كەسانى خاوەن بڕواى بەهێزترو پايەدارتر نەدرا بىٚ چونكە پێويستى پێى نەبوە، هەر بۆيەشە كەرامەت لە نێو شوێنكەوتوان زۆرتر بوە تا لە ناو ياوەران، بەم پێودانە نابىٚ كەس خۆى بە خەمى كەرامەت هەبون خەريك بكات و نابىٚ خەمبار بىٚ ئەگەر نەيبو، ئەبو عەلى جەوزجانى راستى فەرموە كە دەڵىٚ: (خوازيارى راستاڵى بە نەك كەرامەت، چونكە دەرونەكەت لەسەر خوازيارى كەرامەت رێختى گرتوە، خواش داواى راستاڵيت لىٚ دەكات) هەندىٚ لە وانەى لە وتەكەى فاميون وتويانە: ئەم وتەيە بنەڕەتێكى مەزن و گرنگى ئەم بابەتەيە، نهێنيەكە كە زۆر لە هەوادارانى دەرونپەروەران و فێرخوازان لێى بىٚ ئاگان[١٧٥].

## ئاسامێن و ساختەكاريەكانى شەيتان:[١٧٦]

گەلىٚ كەس هەن كە رەش و سپى لێك جياناكەنەوەو هەر يەكێك ببينن ئاساسمێنێك رابنوێنىٚ پێيان وايە دۆستێكى چاكەخوازى خوايە! كەچى وانيە چونكە هىٚوا هەيە شەيتان بە قوتابى وى دەشىٚ كەچى ئاساسمێنى هێند سەراسيمە ئەنجام دەدات چاو مۆڵەق دەكات لە ئاسمانێدا دەفرىٚ يان لەسەر

---

[١٧٥] مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١١/٣٢٠).

[١٧٦] بۆ پتر رونبونەوە بگەڕێوە بۆ (جيهانى شەيتان و جنۆكان).

ئـاو دەڕوات! ڕەنگـە ئاسـاسمێنکاری وا هـەبێ بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتیش بکات! لە شامدا لـە سـەردەمی عەبدولمـەلیکی کوڕی مـەروان پیـاوێك پـەیدابو نـاوی حـاریثی دیمەشـقی بـو بانگەشـەی پێغەمبەرایـەتی دەكـرد، كـاری ئاساسمێنی سەیر سەیری دەكرد، هەردو پێیان كۆت و زنجیر دەكرد پێی خۆی دەردەهێنا، لەشیان دەدا بەر شمشێران كاری تێ نەدەكرد، دەستی بـە بـەرد دادەهێنا بەرد (سبحان الله)ی دەگوت، ئەسپ سوار و پیادەی لە هەوادا نیشانی خەڵك دەدا و دەیگوت ئەمانـە فریشـتەن، هەڵبەت ئـەم سـاختەكاریانە شـەیتان ئەنجامی دەدات تـا خـەڵكی پـێ لە خشتە ببات، پیـاو چاكانیش راسـتەقینەی كارەكەیان زانیوە بۆیە ئەگەر ئامادەی دیتنی ئەم دیاردانە بوبان یـادی خوایـان دەكرد و ئایەتولكورسیان دەخوێند یا هەندێك قورئانیان دەخوێند و كارەكەیان پوچەڵ دەكردەوە، حاریثی دیمەشقی درۆزن كە موسڵمانان گرتیان و ویستیان بیكوژن، یەكێكیان تا هێزی تێدابو رمێكی لێدا بەڵام نەیبڕی، عەبدولمەلیك پێی گوت: ئەتۆ نـاوی خـوات لێ نـەهێناوە، ئـەمجارەیان نـاوی خـوای هێنـا لێیـدا و كوشتی[177].

هەروەها جەجاڵیش چەندین ئاساسمێنی سەیرو سەراسیمەی وای لەسەر دەستدا رودەدات پیـاوی پـێ هـۆت دەكـات، كـەچی پیاوچـاكیش نیـە، بـەڵكو بانگەشەی خوایەتیش دەكات! كەواتـە ئاساسمێنكاری بەڵگـەی پیاوچـاكێتی نیە. كەرامـەت بە ئەنگێزەی بڕواو لـە خواترسـان و راسـتاڵی دێتـە ئـارا، بـەڵام ئەگەر ئەنگێزەی ئاساسمێنكاریەك بێبڕوایی‌و شـرك و یـاخیبون و سـتەم و دور لە خوایی بێ ئەوا ساختەكاری شەیتانە نەك كەرامەتی پیاوچاكان.

---

[177] بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١١/٢٨٤-٢٨٥).

# دووەم: موژدەی نەتەوەکانی پێشو

خوا دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ آيَةً أَنْ يَعْلَمَهُ عُلَمَاءُ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾ الشعراء/١٩٧، لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ یەکێك لەو بەڵگە رۆشنانەی کە راستێتی پێغەمبەرﷺ وەدەر دەخات، زانستی نەوەکانی ئیسرائیلە کە لە پەڕتوکەکەیان نوسراوە و پارێزراوە هەروەکو خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ﴾ الشعراء/١٩٦.

## قورئان لەبارەی موژدەی پێغەمبەرانی پێشو دەدوێ:

قورئانی پیرۆز کە لەلایەن خوای زاناو شارەزاوە بۆمان دابەزیوە پێمان رادەگەیەنێ کە لە پەڕتوکە ئاسمانیەکانی پێشودا باسی موحەممەد و نەتەوەکەی کراوەو پێغەمبەرانی پێشو موژدەیان پێداوە، کۆمەڵێك لە تەفسیرناسەکانیش وا لەم ئایەتە فامیون کە خوا بەڵێن و پەیمانی لە هەمو پێغەمبەرەکان وەرگرتوە کە ئەگەر موحەممەدﷺ لە ماوەی ژیانی ئەواندا هەناردرا ئەوا بڕوای پێ بێنن و بەرنامەکەیان واز لێ بێنن و پەیڕەو لە ڕێوشوێنەکەی بکەن بەم پێیە موحەممەد لەلای هەمو پێغەمبەران باسکراوە، ئایەتەکەش ئەمەیە: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ﴾ آل عمران/٨١.

## نزای پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ:

عیرباضی کوڕی ساریە(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((إني عند الله مكتوب خاتم النبيين وإن آدم لمنجدل في طينته، وسأخبركم بـــأوّل أمريـــن دعوة إبراهيم، وبشارة عيسى، ورؤيا أمي التي رأت حين وضعتني، وقد خــــرج لها نور أضاء لها منه قصور الشام: هێشتا ئادەم لە نێو قوڕدا تەواو ڕەق نەببو من لە لای خوا نوسرابوم دواهەمینی پێغەمبەران، یەکەم باسوخواسی خۆمتان پێ دەڵێم: نزای ئیبراهیم و موژدەی عیساو خەونەکەی دایکم کە لەو کاتەی منی بو خەونێکی دیت، نورێکیش کە دەرچو قەسرەکانی شامی بۆ رونـاك کردەوە)) رواه في شـــرح الســـنة[178]. خوا لە قورئاندا پێی ڕاگەیاندوین ئەو کاتەی پێغەمبەر ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی کەعبەیان دروست دەکرد نزایان کردوەو فەرمویانە: ﴿وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ، رَبَّنَا وَابْعَثْ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ: کە ئیبراهیم و ئیسـماعیل بناغەکانی کەعبەیان بەرز دەکردەوە دەیانوت: خوایە! ئەم کردەوەیەمان لێ گیرا بکە بە ڕاستی هەر تۆی ژنەوای دانا، خوایە بمانکە بە فەرمانبەری خۆت، لەنەوەکانیشماندا گەلێك بکە بە ملکەچی خۆت، ڕێگاکانی خواپەرستیمان نیشان بدە، پەشیمانیمان لێ گیرا بکە تۆ گیراکەری پەشیمانی و میهرەبانی،

---

[178] مشكاه المصابيح للتبريزى ۱۲۷/۳شيخ ناصر الدين دەڵێ: حديث صحيح.

خوایە لەناو نەوەکانماندا پێغەمبەرێك بنێرە لە خۆیان، ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە، نامەو زانیاریان فێر بکات وپاکیان بکاتەوە لە هەمو ژەنگێك بێگومان هەر تۆ تەوانا و دانای﴾ البقرة/١٢٧-١٢٩.

خوا نزای پێغەمبەر ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی گیرا کرد و موحەممەدﷺیش بو بە وەڵام، تەورات لەگەڵ ئەم هەمو گۆڕین و دەستێوەردانەشدا هێشتا موژدەی لەم بابەتەی تێدا ماوە، بۆ نمونە لە بڕگەی (٢٠)ی ئیصحاحی (٢٧)ی سیفری تەکویندا هاتوە دەڵێ: (نزاکەت بۆ ئیسماعیل گیرا بو، ئەوەتانێ من پیرۆز و بەهرەمەندی دەکەم، نەوەکانی چەندی بڵێی زۆر دەکەم، دوازدە سەرکردەی دەبێ، دەیکەمە نەتەوەیەکی مەزن و ژمارە زۆر).

هەمان شت بە دەقێکی هاوشێوە لە تەوراتی سامریدا هاتوە کە وەرگێڕانەکەی وشە بە وشە لە تەوراتە عیبرییەکەوە بەم جۆرەیە: (هەرچی ئیسماعیلە نزاکەت بۆی گیرا بو، ئەوەتانێ زۆر و پیرۆزی دەکەم بە (مەئد مەئد)[١٧٩]، ئیبنولقەییمیش باسی ئەوەی کردوە کە هەندێ دانە تەوراتی کۆن هەمان ئەو دەقەیان تێدا تۆمار کراوە.

ئەم موژدەیە لە چەند روێکەوە بەڵگەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدی تێدایە:

یەکەم: نەتەوەی مەزن لە لای خوا هەر دەبێ موسڵمان بێ، لە نەژادی ئیسماعیل را تا هاتنی پێغەمبەرمان قەت نەتەوەی وەکو موسڵمانان نەهاتۆتە ئارا کە لە دوای بانگەوازی ئیسلامدا بە رۆژئاواو رۆژهەڵاتدا بڵاوبونەوە.

---

[١٧٩] نبوة محمد من الشك إلى اليقين ل ٢٥٠، محمد نبي الإسلام ل ٣.

دووەم: دەقە عیبرانیەکەی دەلێ: (مەئد مەئد) بە ئاشکاری ئاماژە بۆ ناوی پێغەمبەر دەکات، وەرگێڕەکان بە (زۆر و زەوەند) راڤەیان کردوە، بەلام راستیەکەی بریتیە لە موحەممەد چونکە بە عیبرانیەکەی (موئەد موئەد) دەردەبردرێ، وشەکانی عیبری‌و عەرەبیش لەیەك نزیکن.

سێیەم: کە دەڵێ دوازدە سەرکردەیان دەبێ، هاوسازە لەگەڵ فەرمودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێ: دوازدە خەلیفە دێن هەر هەمویان لە قورەیشیەکانن.

## موژدەی پێغەمبەر موسا ﷺ :

هەر لە دێرینەوە پێغەمبەر موسا ﷺ موژدەی پێغەمبەر موحەممەدی بە بەنی ئیسرائیل داوە، پێی گوتون کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری رەوشت و ئاکار بەم جۆرە دێت و رێوشوێنی پەیامەکەی بەم شێوەیە و تایبەتیەکانی نەتەوەکەی ئاوەهایەو فەرمانی چاك بە خەڵك دەکات و بەرهەڵستی خراپەیان لێ دەکات و شتی پاك و خاوێن و باشیان بۆ حەلاڵ دەکات و پیس و خراپیان لێ حەرام دەکات و ئەو کۆت و زنجیرو ریسواییەی بەنی ئیسرائیل بە سەبارەتی تاوانەکانیان توشیان بوە ئەگەر پەیڕەو لەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە بکەن و بڕوای پێ بێنن؛ خوا لە کۆڵیان دەکاتەوەو شوێنکەوتوانی ئەم پێغەمبەرە لە خوا دەترسن و زەکاتی ماڵەکانیان دەبەخشن و بڕوا بە نیشانەکانی خوا دێنن موژدەی هەواڵێکی بێگومانیان پێدراوە کە ئەوانەی شوێن رێبازی ئەم پێغەمبەرە دەکەون و یاریدەی دەدەن و خۆیانی لە پێناودا دەکەنە قوربانی و ئەژنەوای ئەو روناکیە دەبن کە خوا دایدەبەزێنێ، ئەوانە رزگار و سەرفرازن، خوا دەفەرموێ: ﴿عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا

لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالأَغْلالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ الأعراف/١٥٦-١٥٧.

## پاشماوەی ئەم موژدەیە:

**تەورات هەندێ لەو موژدانەی تێدا ماوە، لە بڕگەی (١٨-١٩)ی ئیصحاحی (١٨)ی سیفری تەثنیەدا هاتوە کە خوا بە موسای فەرموە: (لە نێوەڕاستی براکانیاندا (مەبەستی لە بەنی ئیسرائیل دێ) پێغەمبەرێکی وەکو تۆیان بۆ دادەنێم، وتەی خۆمی دەخەمە دەمی، هەرچی من فەرمانی پێ بکەم ئەوە دەڵێ، هەر مرۆڤێکیش گوێ بۆ وتەکانی من نەگرێ کە ئەو دەریاندەبڕێ خۆم لە هەقی دێم)، ئەم وتەیە ئاماژەکردنێکی ئاشکراو رونی بۆ پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ تێدایە، چونکە پێغەمبەرﷺ لە نەوەی ئیسماعیلی پێغەمبەرە‌عليه السلام کە نەوەی ئیسماعیلیش برای نەوەی ئیسرائیلن، چونکە باپیری نەوەی ئیسرائیل پێغەمبەر ئیسحاقە، ئیسماعیل و ئیسحاقیش بران، موحەممەدیش نێوەڕاستی نەژادی عەرەبانە، کە دەشڵێ وەکو تۆ مەبەستی لەوە دێت وەکو موسا خاوەن پەیامێك بێت، موحەممەدﷺ ئەو کەسەیە کە خوا وتەی خۆی خستۆتە دەمی کە سروشی بۆ ناردوەو ئەویش ئەزبەری دەکردو لەبەرەخۆی دەیگوتەوەو رەوانی دەکرد، هەر ئەو بۆ سەرجەم خەڵکی نێردراوەو بەنیئیسرائیلیش دەبێ وەدوای بەرنامەکەی بکەون و واز لە بەرنامەکەی خۆیان بێنن، ئەو کەسەش بەرفەرمان نەبێ خوا سزای دەدات (هەر مرۆڤێکیش گوێ بۆ وتەکانی من نەگرێ کە ئەو**

دەریاندەبڕێ خۆم لە هەقی دێم)، لەوەدا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە ئەو بەشە موژدەیە پاشماوەی تەواوی ئەو موژدە مەزن و تەواوەیە کە خوا بە سروش بە موسای ڕاگەیاندوە و قورئانیش بە ئێمەی ڕاگەیاندوە، ئەم موژدەیە لەو کاتەدا بوە کە پێغەمبەر موسا‌ عليه السلام حەفتا پیاوی بۆ میقاتێ هەڵبژاردو پاشان بەهۆی داوای بینینی خوا توشی بومەلەرزەیەك بون و مردن، پاشان پێغەمبەر موسا لەبەر خوا پاڕایەوەو خوا زندوی کردنەوە، خوا لە دوای پاڕانەوەکەی موسادا فەرموی: ﴿عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ﴾ تا ئایەتەکانی تر، الأعراف/١٥٦.

ئەگەر بگەڕێیەوە سەر تەوڕات، لە سیفری خروجدا دەبینی، ئەم موژدەیەی کە خوا بە موسای داوە لە دوای ئەوە بوە کە بۆ میقاتی خوا چوە، تەوڕاتیش شتێکی وەکو بومەلەرزەی باس کردوە؛ (گەل هەموی گوێیان لە دەنگەکان بو، دەنگی شەیپور، کلپەی ئاگریان دیت، چیاکان ببونە دوکەڵ، گەل هەمو پەرتەوازە بون، پاشان گێرسانەوە ) سیفری خروج ئیصحاحی (٢٠)ی تەوراتی سامری.

## موژدەی پێغەمبەر عیسا عليه السلام :

خوای تاك و تەنیا لە قورئاندا پێی ڕاگەیاندوین کە پێغەمبەر عیسا موژدەی پێغەمبەر موحەممەدمانی داوە ﷺ: ﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنْ بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾: عیسای کوڕی مەریەم گوتی: بەنو ئیسرائیل! من پێغەمبەری ئێوەم و بەڕاستخەرەوەی تەوڕاتم، موژدەتان دەدەمێ پێغەمبەرێك لە دوای منەوە دێت ناوی ئەحمەدە، بەڵام کە پێغەمبەرەکەیان بۆ

هات و نیشانەی بۆ هێنان گوتیان جادوی ئاشكرایه﴾ الصف/٦، ئەحمەدیش وەكو لە فەرمودەدا هاتوە یەكێكە لە ناوەكانی پێغەمبەر موحەممەدﷺ، لە صەحیحی بوخاریدایە كە جوبەیری كوڕی موطعیم(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: گوێم لێبو پێغەمبەرﷺ دەیفەرمو: ((إن لي أسماء؛ أنا محمد، وأنا أحمد، وأنا الماحي الذي يمحو الله به الكفر، وأنا الحاشر الذي يحشر الناس على قدمي، وأنا العاقب: من چەند ناوێكم هەیە؛ من موحەممەدم ئەحمەدم، قەلاچۆكەرم؛ خوا بەهۆی منەوە بێبڕوایی قەلاچۆ دەكات، كۆكەرەوەم؛ خەڵك بە پێ‌وشوێنی من لە دەشتی كۆبونەوەدا كۆ دەبنەوە، پاشەبەرەم؛ كە دواهەمین پێغەمبەرم)) موسلیم گێڕاویەتیەوە[180].

## دو وێنە لە تەوڕات و ئینجیلدا:

خوا لە تەوڕاتدا دو وێنەی بۆ موحەممەدﷺو یاوەرانی هێناوەتەوە: ﴿مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنْ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمْ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا: موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ئەو كەسانەی لەگەڵی دان، لەگەڵ بێبڕواكان دڵڕەق و توندو تیژن، لە نێو خۆدا دڵنەرم و بە بەزەیین، دەیانبینی لە كڕنوش و سوژدە دان، مەبەست و نیازیان لە كردەوەكاندا خوایەو تەمای خۆشنودی خوایان هەیە،

---

[180] تەفسیری ئیبنو كەسیر (٦/٦٤٦).

ئەوانەی یادمان کردن ئاکاری بڕوادارانە کە لە تەوراتێ دایە، هەروەها وێنەو وێچونیان لە ئینجیلدا وەکو چنراوێ وایە کە چەکەرە و چرۆی دەرکردبێ ئەنجا بەهێزی کردبێ تا قایم و ئەستور بوبێ، ئەنجا بەرێکی لەسەر لاسکەکەی وەستابێ بە جۆرێکی وا کە کشتیاری پێ سەرسام بێ، بەڵکو بێبڕواکان لە داخ و خەفەتان دڵیان بتەقێ، خوا بەڵێنی لێبوردن و پاداشتی مەزنی بە بڕوادارانی چاکەکار داوە﴾ الفتح/٢٩.

## مژدەکانی تەورات:

ئەو تەوراتەی ئەمڕۆ لەبەردەستی خەڵکاندایە زۆری لێ گۆڕاوەو دەستی تێوەردراوە، بەڵگەش ئەو هەمو جیاوازیەیە کە لە تەورات بۆ تەورات و لە نۆرەچاپە بەرودواکانیدا دەبینرێ. سێ تەورات هەیە: عیبرانی، یۆنانی، سامری، هەر نەتەوەیەکیش دەڵێ هی ئێمە راستە، هەروەها جیاوازیەکی زۆریش لە نێوان نۆرەچاپ و وەرگێڕانەکانیاندا هەیە، ئەم هەمو دەستێوەردان و کەموزیادەی کردویانە، بۆتە مایەی فەوتانی زۆر لەو مژدانەو لەناوچونی ئەدگارەکانی، لەگەڵ ئەو هەمو پاشاگەردانیەشدا هێشتا چەندین مژدەی تێدا ماوە، کە هەر یەکێك رامێنێ‌و لەگەڵ ژیانی پێغەمبەرﷺدا بەراوردی بکات و خۆی لە هەوەست وەدور بگرێ، بۆی رون دەبێتەوە مژدەی تێدایەو موحەممەدیشیﷺ پێ مەبەستە.

### هاتنی ناوی پێغەمبەرﷺ لە تەوراتدا:

هەندێ لەو مژدانە بەراشکاوی ناوی موحەممەدﷺی یاد کردوە، هەندێ لە زانا موسڵمانەکانیش ئاگایان لەم دەقانە هەبوە، بەڵام دەستێوەردان و گۆڕینی بەردەوام ئەم دەقانەشی گرتۆتەوە، یەکێك لەم دەقانە ئەوەیە کە لە سیفری

ئەشعیا[181]دا هەیەو دەڵێ: (من کاری تۆم ستایشگوزار کردوە، ئەی موحەممەد ئەی پیرۆزی پەروەردگار ناوت لە رۆژی بنەوانەوەڕا هەیە)، کە دەڵێ ناوت لە رۆژی بنەوانەوە هەیە لەگەڵ ئەم فەرمودەیە تێك دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ((كنت نبيّاً وإن آدم لمنجدل في طينته: من پێغەمبەر بوم و هێشتا ئادەم لەناو لیتەکەیدا دەتلایەوە ))[182].

لە تەوراتی عیبرانیش لە سیفری حیبقوق[183]دا دەڵێ: (سەدای ستایشکردنی ئەحمەد زەوی پڕ کرد، بەهۆی دەسەڵات و هێزی گەردنی نەتەوەکانی کەچ کرد).

لە چاپێکی کۆنی لەندەنی ساڵی ١٨٤٨ و چاپێکی تری بەیروتی ساڵی ١٨٨٤ و لە زۆر لە دانە کۆنەکان لە سیفری تەکویندا زۆر بە رون و ئاشکرایی دەڵێ: (ئاسمان بە جوانی موحەممەد روناك بۆوە، زەوی بۆی پڕ لە ستایشگوزاری بو، هەڕەشەکانت لە نێو روبارەکانە، بلێسەو گڕی دەنگت لە دەریاکانە، ئەی موحەممەد زو وەرە، چیاکان تۆیان دیت و راجفرین).

## یادکردنی پێغەمبەرﷺ لەو بابەتانەی پێی پەیوەستە:

هەندێ جار تەورات باسی ئەو جێگەیە دەکات کە موحەممەدی لێ بۆتە پێغەمبەر، لە سیفری تەثنیەدا لە ئیصحاحی (٣٣)دا هاتوە: (خوا لە سەینائدا پێشوازی کرد، لە ساعیردا بۆیان هەڵهات، لە چیای فارانیشدا درەوشایەوە)، سەیناء ئەو شوێنەیە کە خوا لەگەڵ پێغەمبەر موسادا ئاخاوت، ساعیر ئەو

---

[181] الجواب الصحيح ٣/٣٢٦.

[182] محمد نبي الإسلام ل ١٨.

[183] الجواب الصحيح ٣/٣١٣.

شوێنەیە کە خوا سروشی بۆ پێغەمبەر عیسا نارد، فاران چیاکانی مەککەیە، ئەو شوێنانەی تەورات ئامـاژەی بۆ کردون، لـە قورئانیشدا یـاد کـراون: ﴿وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ، وَطُورِ سِينِينَ، وَهَذَا الْبَلَدِ الأَمِينِ: سوێند بە هەنجیر و زەیتون (مەبەستی لە قودسی پرۆزە)، سوێند بە طوری سینین، سوێند بەو شارە ئارامە (کە مەککەیە)﴾التين/١-٣.

تەورات شوێنی سروش دابەزینی پێغەمبەریشی باس کردوە، لە ئیصحاحی (٢١)ی سیفری ئەشعیادا دەڵێ: (سروش لە لای مەملەکەتی عەرەبەکاندا لە شوێنێکی دژوارو ئەستەمدا)، ئاشکراشە کە دابەزینی سروش بۆ پێغەمبەرﷺ لە مەملەکەتی عەرەباندا و لە ئەشکەوتی (حیراء)دا بو کە شوێنێکی سەختە، هەر لەجێگەی تەوراتدا وتەیەکی دەربارەی کۆچکردنی پێغەمبەرﷺی تێدایەو، ئاماژەی ئەو شوێنەش دەکات کە کۆچی بۆ کردوە: (هۆ دانیشتوانی شاری تەیماء ئاو بێنن بیدەن بە تێنوان، نان بدەن بە هەڵاتوەکان، چونکە ئەوان لەبەردەمی شمشێران هەڵاتون، لەبەر شمشێری بڕندە، لەبەر کەوانی ڕەپ، لەبەر شەڕێکی سەخت و گەرم هەڵاتون)، تەیماء شاری مەدینەی پێ مەبەستە، ئەگەر لە دەقەکە رامێنی بەهاسانی وەدەردەکەوێ باسی کۆچکردنەکەی پێغەمبەرﷺ دەکات، تەواوکەری دەقەکەی پێشو دەڵێت: (( (مەزن) وای بە من گوتوە کە لە ماوەی ساڵێکی وەکو ساڵی ئەجیردا تەواوی شکۆی قیدار لەناو دەچێ، پاشماوەی زەبرو زەنگی نەوەی قیدار کەمتر دەبێتەوە، چونکە پەروەردگاری خوای ئیسرائیل وای وتوە))، ئەم دەقەی سەرەوە قسە لە شەڕی بەدر دەکات دوای ساڵێك وەکو ساڵی ئەجیر- دوای کۆچکردن، شەری بەدر رویدا، شکۆی قیدار لەناوچو، قیدار یەکێکە لە کوڕەکانی پێغەمبەر ئیسماعیل کە نەوەکانی خەڵکی مەککە دەگرێتەوە، هەروەها لەدوای جەنگی بەدردا زەبرو زەنگی قیدار کەم بۆوە.

## ئاماژەی تەورات بۆ یەك لە ئەدگارەکانی کۆچگەی پێغەمبەرﷺ:

لە هەندێ لە دەقەکانی تەوراتدا ئاماژە بۆ کۆچگەی پێغەمبەرﷺ کراوە، لە ئیصحاحی (٤٢)ی سیفری ئەشعیادا دەڵێ: (خەڵکان و شارەکانیان دەنگیان بەرز دەکەنەوە، ئەو نیشتمانەی قیدار تێیدا نیشتەجێبو، تا دانیشتوانی سالْع لە ترۆپکی شاخ و چیاکانیدا وتەی ئاوازدار بڵێن و دروشم هەڵبڕن، خوای پێ شکۆمەند بکەن ).

قیدار هەروەکو لە ژمارە (١٣)ی ئیصحاحی (٢٥)ی سیفری تەکویندا هاتوە یەکێکە لە کوڕەکانی پێغەمبەر ئیسماعیلؑ .

سالْع شاخێکی شاری مەدینەیە.

وتەی ئاوازدار ئەو بانگەیە تاکو ئێستاش رۆژێ پێنج جاران سەداکەی ئاسمان تەی دەکات، دروشم هەڵبرین، ئەو تەکبیرو تەحمیدانە دەگرێتەوە کە دەمی پاکی خەڵکی مەدینەی پاك و بەپێزی تەنیشت سەلع لە جەژنان و بەیانیان و ئێواران و ناخی شەوان هەڵیدەبرن.

## ئاماژە کردنی تەورات بۆ هەندێ لەو کارانەی لەسەر دەستی پێغەمبەرﷺ هاتۆتە ئارا:

هەندێ لە دەقەکانی تەورات بڵاوبونەوەی بانگەوازی پێغەمبەرﷺو هەندێك لەو کارانەش باس دەکات کە پێغەمبەرﷺ ئەنجامی داون لە ئیصحاحی سێیەمی سیفری حیبقوقدا دەڵێ: (خوا لە تەیمانەوە هات، قددوسیش لە چیای فاران، پێز و فەڕوفیتەکەی ئەرزو ئاسمانەکانی داگرت و بە پاکیکردنەکەی پڕبونەوە، تیشك و بریسکانەوەیەکی وەك روناکی لە دەستدا هەبو، لەوێدا

دەسەڵاتەکەی پڕشەنگی‌دا، پێ‌وقەدەمەکەی نەخۆشی پەتای لابرد، قاچەکانی تایان نەهێشت، راوەستاو بەزەویدا گەڕا، سەرنجی‌دا، نەتەوەکان ترسان، شاخە دێرینەکان داتەپین، گردەکۆنەکان رۆچون)، لەم دەقەدا ئەو موژدەیەی تێدایە کە پێغەمبەرﷺ و یاوەرانی سەرکەوتنێکی مەزن وەدەست دێنن، هەواڵی ئەوەشی تێدایە کە بانگەوازی پێغەمبەرﷺ لە هەرێمە جیاجیاکانی روی زەوی بڵاو دەبێتەوە، مەبەستی لە شاخی دێرین ئەو دەوڵەتە بەهێزو بە زەبروزەنگ و خاوەن شکۆ دێرینانەیە کە هەرەس دێنن، گردی کۆنیش مەبەستی لە دەوڵەتە کەمتر هێزەکان دێت، کە رۆدەچن، ئەمانەش هەر هەموی رویان دا، هەروەها ئەم موژدەیە ئاماژە بۆ دو شتی تر دەکات هەر یەکێك شارەزایی بە ژیانی پێغەمبەرﷺ هەبێ دەزانێ راستە:

یەکەمیان: دەستی بریسکەیەکی وەك روناکی دەبەخشی.

دوەمیان: پێ‌و قەدەمی خێری کە بوە مایەی قەلاچۆبونی نەخۆشی پەتاو نەمانی گەرمەتا.

## ئەو بریسکەو روناکیەی لە دەستەکانی دەرچو:

تەورات دەڵێ: (تیشك و بریسکەیەکی وەك روناکی لەدەستدا هەبو، لەوێدا دەسەڵاتەکەی پڕشەنگی‌دا)، پاشان دەڵێ: (راوەستاو بەزەویدا گەڕا، تەماشای کرد، نەتەوەکان ترسان )، من پێم وایە ئەم دەقە لەبارەی روداوێکی دیاریکراو دەدوێ کە لە غەزای خەندەق رویدا، یاوەران لە کاتی هەڵکۆڵینی خەندەقەکەدا گاشە بەردێکیان لێ عاسێ بو و نەیانتوانی بیشکێنن، پێغەمبەرﷺ هات زەبرێکی لێداو سێیەکی شکا، لەگەڵ لێدانەکەدا روناکیەکی لێ دەرچو، پێغەمبەرﷺ تەکبیرێکی لێدا، یاوەرانیش تەکبیریان لێدا، پاشان زەبری دوەم و

سـێیەمی لەبەردەکـە دا و شـکاندی، پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: لەگـەڵ رونـاکی یەکـەمدا بالاخانـەکانی شـامم دیـت رونـاك بونـەوە، لـە رونـاکی دوەمـدا بالاخانەکانی فارسم دیت، لە روناکی سێیەمدا دەروازەکانی سەنعام دیت.

نەسائی و ئەحمـەد–بە ئیسنادێکی حەسـەنەوە–لە بـەرائی کوڕی عازیبیـان گێڕاوەتـەوە گوتویـەتی: (کـە پێغەمبـەرﷺ فـەرمانی پێکردیـن خەندەقەکـە هەڵکـەنین، لـەکاتی هەڵکـەندندا گاشـە بـەردێکمان لێ بەدەرکـەوت و هـەندێ قازمەمان لێدا نەشکا، چوینە لای پێغەمبەرﷺ، ئەویش هـات و قازمەکەی گرتـە دەست و فەرموی: بەناوی خـوا، قازمەیەکی لێدا سێیەکی بەردەکەی شـکاند، ئەنجا فەرموی: ئەڵلاهوئەکبەر کلیلەکانی شامم درایـێ، بەو خوایە ئێستاکە وا بالاخانە سورەکانی دەبینـم، پاشـان قازمـەی دوەمـی لێـداو سێیەکی دوەمیشـی شکاند، فەرموی: ئەڵلاهوئەکبەر کلیلەکانی فارسانم پێدرا، بەو خوایە ئێستاکە وا بالاخانە سپیەکانی مەدائین دەبینم، پاشان قازمەی سێیەمی لێداو فـەرموی: بەناوی خوا، ئەو بەردەی مابو شکاندی، فەرموی: ئەڵلاهوئەکبەر، کلیلـەکانی یەمەنم پێدرا، بەو خوایە ئێستاکە وا لێرەوە دەروازەکانی سەنعا دەبینم)[١٨٤].

لـە گێڕانـەوەی طەبـەرانیدا دەڵـێ: (قازمەیـەکی لـە گاشـە بەردەکـەدا و بروسـکەیەکی گـەورەی لێ دەرچـو، گوتـی: ئەڵلاهوئەکبـەر، موسـڵمانەکانیش گوتیان ئەڵلاهوئەکبەر)، تیایدا دەڵێ (بروسکەی یەکەم بالاخانـەکانی شـامی بۆ روناك کردەوە، جبریل پێی گوتم: خوا نەتەوەکەت بەسەریاندا زاڵ دەکات )[١٨٥].

---

١٨٤ فتح الباري (٣٩٧/٧).

١٨٥ هەمان ژێدەر.

خوێنەری سەنگین!

بۆ ئەمجارەش دەقەکەی تەورات لەگەڵ ئەم فەرمودانە بەراورد بکە کە دەڵێ: (تیشك و بریسکانەوەیەکی وەك روناکی لەدەستدا هەبو، لەوێدا دەسەڵاتەکەی پرشەنگی‌دا، راوەستاو بەزەویدا گەڕا، تەماشای کرد )، لەو فەرمودانەش رامێنە، ئاخۆ موژدەکەی تەورات ئەم روداوەیان پێ مەبەست نیە؟.

## قەلاچۆبونی نەخۆشی پەتاو نەمانی تا:

ئەم موژدەیە دەڵێ: (پێ و قەدەمەکەی نەخۆشی پەتای لابرد، قاچەکانی تایان نەهێشت)، ئێ دە بەوخوایە، موژدەیەکی زۆر راشکاوی تێدایە کە هەرگیز واتاوێڵی هەڵناگرێ، شاری مەدینە بەر لە کۆچی پێغەمبەرﷺ لە گەرمەتادا ناو و دەنگی دابوەوە، ئیبنو عەبباس(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: کاتی خۆی کە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ یاوەرانی بۆ مەککە چون عومرە بێننەوە -عومرەی قەزا- موشریکەکان گوتیان: موحەممەد و یاوەرانی بۆ مەککە دێن، گەرمە تای یەثریب لاواز و سیسی کردون. بوخاری گێڕاویەتیەوە[١٨٦].

کە یاوەران بۆ مەدینە کۆچیان کرد توشی ئەم گەرمەتایە بون، پاشان پێغەمبەرﷺ لە خوا پاڕاوە گەرمە تاکە نەهێڵێ، خاتو عائیشە دەڵێ: کە پێغەمبەرﷺ کۆچی کردو گەیشتە مەدینە، لەوێدا ئەبوبەکرو بیلال توشی گەرمە تایەکی زۆر سەخت بون، دەڵێ: چومە لایان[١٨٧] و گوتم: بابەگیان دروستیت چونە؟ بیلال! ئەدی تۆ چۆنی؟ دەڵێ ئەگەر ئەبوبەکری باوکم تایەکەی لێ توندکردبا دەیگوت:

---

[١٨٦] تەماشای فتح الباری (٤٦٩/٣) بکە.

[١٨٧] کە چوەتە لای بیلال بەر لە دابەزینی ئایەتی پەردە دانان بوە.

كل امريءٍ مصبّح في أهله        و الموت ادنى من شراك نعله

واته: هەمو کەسێك پێی دەڵێن: سبەینێت بەخێر بێ، کەچی مردنیش لە ئاوزێنەی پێلاوەکەی لێی نزیکترە.

مەبەستی لەوەیە مردن جیاوازی لە نێوان نامۆ و دانیشتوان ناکات، نەخۆشیەکەش لە لای خواوەیە نەك لەبەر مەدینە بێ.

بیلالیش ئەگەر تایەکە بەری دابا سەری بەرز دەکردەوەو دەیگوت:

الا ليت شعري هل ابيتنَّ ليلة        بوادٍ وحولي اذخر وجليل

وهل اردن يوماً مياه مجنة        وهل يبدون لي شامة وطفيل

واته: هەیاران! دەبێ لەو دۆڵەدا شەو و رۆژ بکەمەوە کە لە دەوروپشتم زورناتك و گیای جەلیل بێ؟ ئەرێ دەبی جارێکیتر بچمە سەر ئاوی مەجنەنە کە نزیکی مەککەیە، ئایە شاخی شامەو طوفەیل دەبینمەوە؟

خاتو عائیشە دەڵێ: چومە لای پێغەمبەرﷺ و پێم راگەیاند، فەرموی: ((اللهم حبب إلينا المدينة كحبنا مكة أو أشدّ، وصححها، وبارك لنا في صاعها ومدّها، وانقل حمّاها فاجعلها في الجحفة: خوایە! وەك چۆن مەککەت لەلادا خۆش و شیرین کردوین ئاوەها و بەڵکو زیاتر مەدینەمان لەلادا خۆش و شیرین بکە، خوایە! لە تا رزگاری بکەو فەروفیت و پێز بخە نێو خواردنی، تا لە کوڵ مەدینە بکەوەو توشی جوحفەی بکە)) بوخاری گێڕایتیەوە[188].

---

[188] فتح الباري (٧/٢٦٢).

بوخاری لە کۆتایی (كتاب الحج: نامەی حەج)دا ئەوەندەی زیاد کردوە: (پاشان بیلال دەیگوت: خوایە نەفرەت لە عوتبەو شەیبەی کوڕی ڕەبیعەو ئومەییەی کوڕی خەلەف بکە، لەبەر ئەوەی ئێمەیان دەربەدەری خاکی نەخۆشی پەتا کردوە)[189].

کەواتە: یەثریب (شاری مەدینە) پەتای گەرمەتای تێدابو، هەر کەسێك چوبا ناوی توشی دەبو.

خوا نزاکەی پێغەمبەرﷺی گیرا کردو گەرمەتاکەی ڕاگواستەوە و لەکۆڵ مەدینەی کردەوە، هەروەها تاعونی لە مەدینە نەهێشت، ئیمام ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا لە ئەبو عوسەیبی ئازادکراوی پێغەمبەرﷺ گێڕایتیەوە و دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((أتاني جبريل عليه السلام بالحمّى والطاعون فأمسكت الحمّى بالمدينة وأرسلت الطاعون إلى الشام: جبریل گەرمەتا و تاعونی بۆ هێنام، ڕێم لە گەرمەتاکە گرت و تاعونەکەشم هەناردە شام))[190]، ڕێگرتنی گەرمە تاکە ڕەنگە لە یەکەم جاردا بوبێ پاشان فەرمانی کردبێ و چوبێتە جوحفە، یان ڕەنگە مەبەستی لەوە بوبێ کە تەنها ڕێی لێ گرتبێ لە مەدینەدا نەبێ، جوحفەش دەکەوێتە نزیکی مەدینە. هەر چۆن بێ، موژدەکە ئاشکراو ڕونەو وەك ئەوە وایە کە تەوڕات دەیبێژێ.

## چەند موژدەیەکی تری فرەبابەت:

ئەو موژدانەی کە هەن زۆر جاران چەندین بوار و فرە بابەتیان لەخۆ گرتوە، سیفەتەکانی پێغەمبەرﷺ، سروشتی خوا بۆی، باسی نەتەوەکەی،

---

[189] فتح الباري (٧/٢٦٣).

[190] موسنەدی ئیمام ئەحمەد (٥/٨١).

سەرکەوتنەکان، هاریکاری فریشتان، هەندێك لەو بەخششانەی خوا پێی بەخشیوە.. هەمو ئەمانە بەیەکەوە لە موژدەکانی (دانیال)دا هاتون.

دانیال[191] هەرەشە لە جولەکەکان دەکات و وەسفی نەتەوەی موحەممەدﷺ دەکات دەڵێ: ((خوا ئەوان بەسەر ئێوەدا زاڵ دەکات، پێغەمبەرێکیان لێ دەنێرێ، پەرتوکێکیان بەسەر دادەبەزێنێ، رێشمەتان دەگرێتە دەست، بە هەق زەبون و ریسواتان دەکەن، پیاوانی قیدار بۆ گەلان دەردەچن، فریشتەیان لەگەڵە کە لەسەر پشتی هەسپی سپین، سەرەنجامتان ئاگرە، پەنا بە خوا لە ئاگر)).

قیدار کورێکی پێغەمبەر ئیسماعیل‌عليه السلام بوە، کە نەوەکانی بە زەویدا بڵاوبونەوە و دەستیان بەسەر شام و جەزیرە و میسر و عێراق داگرت، چەندین فەرمودەش هەن -کە موتەواتیرن- لە بارەی دابەزینی فریشتان لەسەر پشتی ئەسپ دەدوێن، بە نمونە لە شەڕی بەدر و ئەحزابدا، هەروەها دانیال بە راشکاوی ناوی موحەممەدﷺ دێنێو دەڵێ: (ئەوانەی شەڕ و جنێوت پێ دەفرۆشن ریشەکێش دەبن، تیریش بە فەرمانی تۆ دەچێتە کەوان ئەی موحەممەد!)، هەروەها دەڵێ: (داوام لە خوا کردوەو لێی پاڕایمەوە کە باسی بەنی ئیسرائیلم بۆ رون بکاتەوە ئاخۆ ژیوانیان قبوڵەو دەسەڵاتیان بۆ دەگەڕێتەوەو پێغەمبەرانیان لێ دەنێردرێ، یاخۆ لە نەتەوەی دیکەدا دەبێ؟، فریشتەیەك لە شێوەی گەنجێکی رەنگ و رو جوان هاتە لام و گوتی: دانیال! سلاوت پێشکەش، خوا دەفەرموێ: نەوەی ئیسرائیل تورەیان کردوم و لێم یاخی بون و خواوەندی تریان پەرست و زانستیان لە کۆڵ خۆ کردەوە و رویان لە نەفامێتی کردو راستگۆییان نەما و رویان لە درۆ کرد، بۆیە بەخت نەسر پەلاماری دان و پیاوەکانی کوشتن و منداڵەکانی بە تالان بردن و نوێژگەکانی

[191] تماشای الجواب الصحيح (٣/٣٣١، ٣/٣) بکە.

روخاندن و پەرتوکەکانی سوتاندن، دوای ئەویش ئەستەم و تەنگانەیان لە کۆڵ ناکەمەوەو هەر دەبێ لە ژێر تورەیی و خەشمی مندا بن تا مەسیحی کوری کچی داوێنپاك دەنێرم، مۆری نەفرەت و تورەییان لێ دەدەم، هەر نەفرەتدار و زەبون و ریسوا دەبن تا ئەو پێغەمبەرەی نەوەی ئیسرایل دەنێرم کە هاجەر مـوژدەی پێداوە، کە فریشتەم ناردە لای و موژدەی ئەو پێغەمبەرەیان پێدا، سروش بۆ ئەو پێغەمبەرە دەنێرم، ناوەکانی فێر دەکەم و بە پارێزکـاری دەیرازێنمـەوەو چاکـەخوازی بـۆ دەکـەم بـە دروشـم، پارێزکـاری ویژدانێتـیو راسـتگۆیی گوفتاریەتیو ئەمەکداری سروشتیەتیو مام ناوەندێتی ژیانیـەتیو فـامیدەیی ریبازیەتی، پەرتوکێکی پێ دەبەخشم کە پێشینەی خۆی بە راست دەخاتەوەو هەندێکیشیانی لێ نەسخ دەکاتەوە، شەورەوی پێدەکەم بۆ لای خۆم، ئاسمان بە ئاسمان بەرزی دەکەمەوە تا تەواو بەرز دەبێتەوە، پاشان لە خۆمی نزیـك دەخەمەوە و سلاوی لێ دەکـەم و سروشـی بـۆ دەنێرم، پاشـان بـە شـادمانیو خۆزگەمەندی دەینێرمەوە لای بەندەکانم، ئەوەی وەریدەگرێ دەیپارێزێو کەم و زۆری بۆ ناڵێ، راستگۆیە لەوەی هەواڵی پێ دەدرێ، بە نەرم و نیانی قسە و ئامۆژە چاکەکانی یەکتاناسی من رادەگەیـەنێ، روگـرژ و دلـرەق و جارکێشـی بازاران نیە، دڵنەوایە بۆ یارانی، میهرەبانە بۆ دژکارانی، بانگی گەلەکەی دەکات تـا مـن بـە تـاك بگـرن و بمپەرسـتن، نیشـانەکانی مـن بـە خـەڵك رادەگەیـەنێ، گەلەکەی بروای پێ ناکەن، ئازار و ئەشکەنجەی دەدەن).

ئیبنو تەیمیە دەڵێ: (پاشان دانیال سەربردەی پێغەمبەرﷺ ئەوەندەی خوا پێی راگەیاندوە، دەگێرێتەوە، تا دەگاتە فوی شەیپور و برانەوەی دنیا)، پاشان دەڵێ: (ئێستاکە ئەم موژدەیە لەلای جولەکە و دیانەکانە و دەیخوێننەوە، دەڵێن هێشتا ئەو کەسە پەیدا نەبوە).

## چەند موژدەیەك لە ئینجیلدا:

لـە ژمـارە (١٤)ی ئیصحـاحی (١١)ی ئینجیلـی مـەتتێ، دەڵـێ: (ئەگـەر دەتانەوێ وەریگرن، ئەمە ئەو (ئیلیا)یەیە کە بێگومان هەر دێت، کێ گوێی هەیە با گوێی لێبێ).

پێغەمبەرﷺ پێی راگەیاندوین کە لە نێوان ئەم و عیسادا هیچ پێغەمبەری تر نیە، کەواتە ئەو ئیلیایەی پێغەمبەر عیسا‌ﷺ مژدەی پێداوە موحەممەدەﷺ - بە پێی ژمێرکاری ئەلف و بێتکەش -کە جولەکەکان پێی خەڵەتاون- ئیلیـا، موحەممەدی پێ مەبەستە.

لە ژمارە (١٥)ی ئیصحاحی (١٤)ی ئینجیلی یۆحەننادا دەڵێ: (ئەگەر منتان خۆش دەوێت، ئامۆژەکانم لە گوێ بگرن، منیش لەبەر خوا دەپارێمەوە زاڵێکتان بۆ بنێرێ کە بۆ هەمیشە لەگەڵتاندا بمێنێتەوە)، لە زمانە بێگانەکاندا دەڵێ: (پارکلێتۆستان پێدەدات تا بۆ هەمیشە لە گەڵتاندا بمێنێتەوە)، واتای وشەیی (پـارکلیتۆس)ی یۆنـانی بریتیـە لـە (ستایشـکراو: ئەحمـەد)، کـە یەکێکـە لـە ناوەکانی پێغەمبەرﷺ[١٩٢]

لە ژمارە (٢٦)ی ئیصحاحی (١٥)ی یۆحەننا دەڵێ: (هەر کاتێك ئەو زاڵەی کە من لە لای باوك دەینێرم، ئەو روحە هەقەی کە لەلای بـاوك دێتە ئـارا، ئەو گەواهیم بۆ دەدات)، دەڵێ گەواهیم بۆ دەدات چونکە موحەممەدﷺ گەواهی‌دا کە عیسا پێغەمبەری خوا بوە، روحی هەقیش موحەممەدەﷺ، ئەو واتایانەی لە وەرگێڕاوە نوێکاندا هاتوە نەپپێکاوە، چونکە لە زمانە بنەڕەتیەکەدا کە زمانی یۆنانیەو ئینجیلەکان لەو زماندا وەرگێڕدراون، (بیرکلیتوس) بەکار هـاتوە لـە

---

[١٩٢] محمد نبي الإسلام- لاپەڕە (٣٦).

وەرگێڕاوە عەرەبیەکانی چاپەکانی ١٨٢١ و ١٨٣١ و ١٨٤٤ی لەندەن وشەی (فارقلیط)یان داناوە، کە ئەو زێتر لە وشەی (بیرکلیتۆس) نزیکترە[١٩٣]، بەڵام کە لە چاپە تازەکاندا وشەی (زاڵ)یان داناوە ئەویش بە دەردی گۆڕین چوە کە خوا سەرزەنشتی نامەوەرانی پێکردوە: ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ: وشەکانی لە جێی خۆیدا دەگۆڕن﴾ النساء/٤٦.

تێبینی دەکرێ لە پێش ئەم دەقەدا رستەیەك هەیە لە چاپە تازەکاندا پەڕێنراوە، بەڵام لە چاپە کۆنەکاندا زۆر بە رونی تێیدایە کە دەڵێ: (ئەگەر مونحەنەمنا هات کە خوا بۆتانی دەنێرێ)، واتای وشەیی وشەی (مونحەنەمنا)ی سریانی بریتیە لە موحەممەد[١٩٤].

## هەر لە ئینجیلدا.. چەند موژدەیەکی تر:

لە ئیصحاحی یازدەی ئینجیلی مەتتێدا هاتوە و دەڵێ:

((٤٢ یەسوع پێیانی گوت: ئەرێ قەت لە پەڕتوکدا نەتانخوێندۆتەوە کە ئەو بەردەی بیناکاران هەڵیانبواردوە و نەیانخستۆتە جێ وا بۆتە سەری سەرانسوێ، خوا وای کردوە، لەبەر چاوی ئێمەشدا سەیروسەمەر بێ.

٤٣ بۆیە پێتان دەڵێم: دەسەڵاتتان لێ دادەماڵدرێ و بە نەتەوەیەك دەدرێ بەروبومان بیەخشێ.

---

[١٩٣] محمد نبي الإسلام (٣٨).

[١٩٤] هەمان ژێدەر (٣٩)، شیخ الإسلام سەرجەم ئەو ریوایەتانەی سۆراغ کردوە و هەمویانی هێناوەتەوە کە پێغەمبەر عیسا ﷺ موژدەی بە پێغەمبەر ﷺ داوە، هەموشی لەگەڵ ئایەت و فەرمودان بەندکردوە، تەماشای الجواب الصحیح (٤/٦) بکە.

٤٤ ئەوەی بەسەر ئەم بەردەدا بەربێتەوە وردوخاش دەبێ، ئەو کەسەش بەردەکەی بەسەردا بەربێتەوە پارچەپارچە دەبێت)).

ئەم بەردە موحەممەدی پێ مەبەستە ﷺ، لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتوە کە ئەبوهورەیرە و جابری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خوایان لێبێ) دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إن مثلي ومثل الأنبياء من قبلي كمثل رجل بنى بيتاً فأحسنه وأجمله إلاّ موضع لبنة من زاوية فجعل الناس يطوفون به ويعجبون له ويقولون: هلاّ وضعت هذه اللّبنة؟ قال: فأنا اللّبنة وأنا خاتم النبيين: نمونەی من و پێغەمبەران وەکو ئەو پیاوەیە کە خانوێکی زۆر جوان و ڕازاوە دروست دەکات کە هیچ کەم و کورتی نیە تەنها شوێن خشتێکی سوچێك نەبێ، خەڵك بە دەوریدا دەسوڕێن و تەماشای دەکەن، سەیر دەمێنن و دەڵێن: خۆزگە ئەم جێ خشتەشیان دادەنا، دە بزانن ئەم خشتە منم و من دواهەمین پێغەمبەرم)).

ئیبنولقەییم[١٩٥] دەڵێ: "لە وتەی (مەسیح) ڕامێنە کە لە موژدەیەکیدا دەڵێ: (ئەدی سەرنجت نەداوەتە ئەو بەردەی کە وەستایەکان وەدوایان خست، ئێستا بۆتە سەری سوچێك، ئەم وتەیە چۆنە لەگەڵ ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: ((وێنەی من و سەرجەم پێغەمبەران وەك پیاوێك وایە کە خانوێك دروست بکات، تەواوی بکات و هیچ کەمایەسیەکی نەبێت تەنها شوێنی یەك خشت نەبێ کە لێی بەجێماوە، خەڵك بەدەوریدا بسوڕێن و تەماشای بکەن و بڵێن: حەیف! بریا ئەم خشتەشیان لەو شوێنە دابنایە، با بزانن ئەم خشتە منم)).

---

[١٩٥] هداية الحيارى ٣٨١-٣٨٢.

لەم موژدەیەی وتەی مەسیح رامێنە: (لەبەر چاوی ئێمەدا سەیرو سەمەر بێ) هەروەها لەوەش رامێنە کە دەڵێ: (ئەو دەسەڵاتەی خوا بە ئێوەی بەخشیوە لێتانی وەردەگرێتەوە و بە کەسانی تری دەدات) رامێنە.. بزانە چۆن لەگەڵ ئەم وتانەی خوا تێك دەکاتەوە: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ الأنبياء/١٠٥، ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرْضِ﴾ النور/٥٥.

دەقێکی تری لەم بابەتە لە ئیصحاحی هەشتەمی (ئینجیلی مەتتێ)دا هاتوە کە دەڵێ:

(١١ هەروەها پێتان دەڵێم کە زۆر کەس و کۆمەڵ لە رۆژئاوا و لە رۆژهەڵاتان دێن لە مەلەکوتی[١٩٦] ئاسمانەکاندا لەگەڵ ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبدا پاڵ دەدەنەوە، بەڵام هەرچی نەوەی مەلەکوتەکەیە بۆ شەوەزەنگی دەرەوە فڕێ دەدرێن، لەوێدا گریەو ناڵەو زایەڵەی مرۆڤان دەبیسرێ).

ئەم موژدەیەی سەرەوە ئاماژە بۆ سەرهەڵدانی نەتەوەی ئیسلام دەکات کە لە رۆژئاوا و رۆژهەڵاتان دێن و خواش لێیان رازیە و لەگەڵ ئەوانەدا دەبن کە خوا بەهرەمەندی کردون کە پێغەمبەران و بڕواپاست و شەهیدان و چاکەکارانن.

لە (الفارق)دا هاتوە کە دەڵێ: ((ئەی مەسیحی! ئەگەر گەردەنکەچی رەوا بیت پێت وادەبێ کە ئەوانەی لە رۆژئاوا و رۆژهەڵاتان دێن نەتەوەی

---

[١٩٦] مەبەستی لە مەلەکوتی ئاسمانی: شوێنی مرۆڤە پیرۆزەکانی ئاسمان دێ (وەرگێڕ).

موحەممەدن، چونکە ئێوە لەو کاتەدا قسەکەتان پیٚ گوتراوە و لە ئاراشدان[197]، مەسیح ﷺ هەواڵی گەلێك رادەگەیەنیٚ کە لە ئایندەدا دێنە ئارا، بەم وتەیەش کە دەڵیٚ: (بەڵام هەرچی نەوەی مەلەکوتە) ئێوەی هەڵبواردوە)).[198]

وتەیەکی لەم بابەتە لە ئیصحاحی چوارەمی ئینجیلی یۆحەننادا هاتوە کە دەڵیٚ: (٢٠-٢٤ یەسوع پێی گوت: ئافرەت! بڕوام پیٚ بکە رۆژێك دادیٚ نە لەم چیایە و نە لە ئۆرشەلیمدا سوژدە بۆ خوا نابەن).

ئەم دەقە ئاماژە بۆ پەیدا بونی دینێکی نویٚ دەکات کە ناوەندەکەی لە ئۆرشەلیم نیە، هەروەها ئاماژە بۆ گۆڕینی روگە دەکات کە لە بەیتولمەقدیسەوە بۆ کەعبە دەگۆڕێت، دەبێتە روگەی دینی نویٚ، ئەم ئایەتەش بەراستی دەخاتەوە کە دەفەرمویٚ: ﴿قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ: بەڕاستی ئێمە روکردنە ئاسمانت دەبینین، وا روت دەکەینە روگەیەك کە پەسندی بکەی، ئیتر روبکە بۆ لای مزگەوتی حەرام، ئێوەش ئەی موسڵمانینە لەهەر لایەك بون لە نوێژدا روبکەنە لای ئەو روگەیە، نامەوەران دەزانن ئەمە شتێکی راستەو لە لای پەروەردگارەوەیە، خواش بیٚئاگا نیە لەوەی کە دەیکەن﴾ البقرة/١٤٤.

---

[197] مەبەستی لەوەدیٚ کە ئەو نەتەوەیەی لە ئایندەدا دێت مەسیحیەکان نین لەبەر ئەو چونکەیەی لە دەقەکەدا باس کراوە (وەرگێڕ).

[198] الفارق ٥٤.

موسڵمانان سەرەتا لەنوێژدا رویان لە بەیتولمەقدیس دەکرد پاشان ئەم ئایەتە دابەزی و فەرمانی کرد روبکەنە کەعبەی پیرۆز کە لە مەککەی بەرێزدایە.

## مژدەکانی ئینجیلی لۆقا:[199]

نوسەری پەرتوکی (ئینجیل و خاچ) دەڵێ: لە (ئینجیلی لۆقا ٢:١٤)دا دەڵێ: (لە بڵندایدا سوپاس بۆ خوا، لەسەر زەویدا ئیسلام و بۆ خەڵکیش ئەحمەد هەبێ)، بەڵام وەرگێڕەکان لە ئینجیلدا ئاوا وەریانگێڕاوە: لە بڵندایدا سوپاس بۆ خوا، لەسەر زەویدا (سەلام: ئاشتی) و لەبۆ خەڵکیش شادمانی هەبێ)، بەڵام نوسەر پێی وایە وەرگێڕانی راست و دروست ئەوەیە کە خۆی گوتویە.

نوسەر پێی وایە لە زمانە بنەڕەتیەکەدا کە سریانیە دو وشە هەن کەس بەتەواوی درکی بە مانا ناوەکیەکانی نەکردوەو لەوەرگێڕانە کۆنەکاندا وەکو پێویست وەریان نەگێڕاوە، کە ئەمانەن:

ئیرینی کە ئاشتیان بۆ داناوە.

ئیودکیا کە خۆشنودیان بۆ داناوە.

وشەی یەکەم (ئیرینی) بەم وشانە وەرگێڕدراوە (سلامة: ساغی)، (مسالمة: ئاشتەوایی)، (سلام: ئاشتی)، بەڵام نوسەر پێی وایە وەرگێڕانی راست و دروست دانانی وشەی (ئیسلام)ە، لە لاپەرە (٤٠)دا دەڵێ: ((ئاشکرایە کە وشەی (ئیسلام) چەندین واتای فرەوان لەخۆ دەگرێ، سەرجەم ئەم واتایانەش دەگەیەنێ کە ئەم وشانە دەیگەیەنن: (ئاشتی، ئاشتایەتی)، (ئاشتبونەوە، ئاشتەوایی)، (ئاسایش، ئارامی)... هەروەها جگە لەمانە واتای دیکەی زیاتر و

---

[199] نبوة محمد من الشك الى اليقين ل ٣٠٠.

فرەوانتر و سەرتاپاگیرتر و بەهێزتر دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر بگوترێ فریشتەکان وتویانە: (لەسەر زەویدا ئاشتی هەبێ) راست نیە، چونکە قەت ناکرێ ئاشتی‌و ئاشتەواییەکی سەرانسەری هەبێ، لەبەر ئەوەی هەمو بونەوەر بە تایبەتی زندوان و تایبەتی‌تر مرۆڤ کە لەسەر روی زەوی دان، بەپێی داخوازی ئەو رێساو یاسا سروشتی‌و کۆمەڵگەییانەی هەن توشی جۆرەها مەرگەسات و کارەسات و تاڵگەردی دەبن، وەکو دوبەرەکی و شەڕو رکەبەرایەتی...، لەبەر ئەوە ئەستەمە مرۆڤ لەسەر زەویدا بتوانێ بە ئاشتی‌و ئاشتەوایی بژێت)).

نوسەر پاشان وتەیەکی مەسیح بە بەڵگە دێنێتەوە کە دەڵێ: (بۆ ئەوە نەهاتوم لەسەر زەویدا ئاشتی بەرپا بکەم، بۆ ئەوە نەهاتوم ئاشتی بەرپا بکەم بەڵکو هاتوم شمشێر دەکار خەم) (مەتتێ ١٠: ٤٠).

هەروەها وتەیەکی تریش دەکاتە بەڵگە: (هاتوم ئاگر بخەمە زەوی، چم بوێ گەر سوتێنرام؟ وا دەزانن هاتوم لەسەر زەویدا ئاشتی بەرپا بکەم؟ نەخێر بەڵکو هاتوم پەرتەوازە بکەم) (لۆقا ١٢: ٤٩-٥٣).

بەم پێیە وەرگێڕانەکە لەگەڵ پەیامی مەسیح و وتەکانی تێك ناکاتەوە، راستیەکەی ئەوەیە بگوترێ: (لەسەر زەویدا ئیسلام) (سەرنج بدە تۆژینەوەکەی لاپەڕە ٣٨-٤٤).

هەروەها نوسەر پێی وایە (ئەیادۆکیا) بە واتای (ستایشکراو: ئەحمەد) دێت نەك (شادمانی و خۆشنودی) کە قەشەکان وایان وەرگێڕاوە، لەبەر ئەوەی لە زمانی یۆنانیدا بە پێخۆشنودبون دەڵێن (ثلیما) نەك (ئەیودوکیا).

دەڵێ: وشەی (دوکوتە) بەواتای (ستایش و ئارەزو و پەرۆشی و حەز و روناکبیری) دێت، ئەوانەش داتاشراوی فرمانی (دۆکسا)ن: (ستایش، ستایشکراو، بەهادار، خوازراو، پەسندکراو، شکۆمەند).

بۆ ئەم مەبەستە زۆر نمونەی تری زمانی یۆنانی هێناوەتەوە، دەڵێ (موحەممەدیتۆ) کە لە (ئەشعیا ٦٤: ١١)دا هاتوە بە (ئەندۆکساهیمۆن) وەریانگێڕاوە، سیفەتەکانیشی بە (ئیندکسۆس) وەردەگێڕن کە ئەمانەن: (ستایشکراو: محمد، ستایشتر: ئەحمەد، شکۆمەندتر، پەسندکراو، داوێن پاك، دەست رۆیشتو).

نوسەر لەم تۆژینەوە بە نرخەدا گەیشتۆتە ئەوەی کە وەرگێڕانی راست و دروستی دەستەواژەکەی ئینجیلی لۆقا دەبێ (ئەحمەد، موحەممەد) بێ نەك (شادمان)، کەواتە وەرگێڕانی راستی دەستەواژەکەی ئینجیل بەم جۆرەیە:

(لە بڵندابیان سوپاس بۆ خوا، لەسەر زەویدا ئیسلام و بۆ خەڵکیش ئەحمەد هەبێ[٢٠٠]).

## موژدەکانی ئینجیلی بەرنابا:

ئەم ئینجیلە گەلێك موژدەی تێدایە، لە لاپەڕە ١٦١دا دەڵێ: (خوا فەرموی: ئەی موحەممەد ئارام بگرە )، لە لاپەڕە ١٦٢دا دەڵێ: (ناوە بە پیرۆزەکەی موحەممەدە )، هەر لە لاپەڕە ١٦٢دا دەڵێ: (خوایە پەیامبەرەکەتمان بۆ رەوان بکە، ئەی موحەممەد زو وەرە جیهان رزگار بکە).

[٢٠٠] تەماشای پەرتوكی (الإنجيل والصليب)ی الأب: عبد الأحد داود بكە ٣٤-٥٣.

## بۆچونێك له بارەی ئینجیلی بەرنابا:

هەڵبەت بەرنابا یەکێکە لەو ئینجیلانەی کە لە دێرینەوە ناسراون، لە پەڕتوکەکانی سەدەی دوەم و سێیەمی زایینیدا باسکراوە، پاشان بۆتە بەردی بن گۆمێ، تا لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمی زایینیدا دانەیەکیان دۆزیەوە، ئەم دانەیە ئێستاکەش لە پەڕتوکخانەی ڤیەننا هەڵگیراوە، چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم پەڕتوکە -ئەوکات- هەراو هەنگامەیەکی زۆری لە مەکۆکانی دین و زانستی ئەوروپادا پەیدا کرد، دو جارانیش بە زمانی عەرەبی چاپکراوە، دوەم چاپ دارولقەلەمی کوێتی پێی هەڵسا.

خۆم دانەیەکم لەم ئینجیلە هێناو تەواو تەواو لێی وردبومەوە، گەیشتمە بۆچونێك کە کەسانی پێش من نەمزانیوە باسیان لێوە کردبێ، بۆم رون بۆوە ئەم پەڕتوکە ئەگەر چی تان و پۆیەکی هەیە، بەڵام دەستی موسڵمانانی تێکەوتوە، شتی وایان تێخستوە کە خۆی لە بنەڕەتدا تێیدا نەبوبێ، ئەم بۆچونەم لەبەر ئەو پەراوێزانە نیە کە لە دانە بنەڕەتیەکەی ڤیەننادا نوسراوە، بەڵکو لەبەر ئەو وەسفانەیە کە تێپەڕیەکی زۆری لە وەسفی پێغەمبەرﷺ تێدایە. ئێمە بڕوامان بە ئینجیل هەیە موژدەی هاتنی پێغەمبەرﷺی دابێ، بەڵام ئەو هەمو ئەفسانانەی کە لە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ لە نێو موسڵماناندا بڵاو بۆتەوە و بۆ پێغەمبەرﷺ هەڵبەستراوە، بە دوری دەزانین لە ئینجیلدا هەبوبێ، لە لاپەڕە (٩١ و ٩٣ و ١١٠)دا دەڵێ: خوا هەمو شتێکی بە موحەممەد بەخشیوە، هەمو شتێکی لە پێناودا ئەفراندوە، لە پێش هەمو شتێکدا ئەوی ئەفراندوە، لە لاپەڕە (١١١)دا گوایە وتەی پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە: (پەروەردگار! لە بیرمە کە منت ئافەریدە کرد گوتم خوایە تۆ لەبەر خۆشەویستی من ویستت جیهان و جنۆکە و فریشتان ئافەریدە بکەی تا خەڵك لە ڕێی منەوە شکۆمەندت بکەن، منی بەندەت).

**لە لاپەڕە (٦١) دا دەڵێ: (موحەممەد! ئارام بگرە دەمەوێ لە پێناو تۆدا جنۆکەو جیهان و ئاپۆرەیەك بونەوەر ئافەریدە بکەم کە بە تۆیان دەبەخشم )، لە لاپەڕە (٢٦٦)دا دەڵێ: (بەڵێ، ئەمە ئەو کەسەیە کە خوا هەمو شتێکی لە پێناودا ئافەریدە کردوە)، لە لاپەڕە (١٥٢)دا دەڵێ: (بۆیە کاتێك خوا پێغەمبەرەکەی بەر لە هەمو شتێك ئافەریدە کرد).**

**هەڵبەت هیچکام لەم وتانە ڕاست و دروست نین، لەگەڵ ئەو هەقەی لەبەر دەستماندایە ناسازو هاودژە چونکە خوا مرۆڤ و فریشتە و جنۆکەی لە پێناو پەرستنیدا ئافەریدە کردوە: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات/٥٦، یەکەم ئەفراویش خوا پەیدای کردبێ پێنوس بوە وەکو لە فەرمودەدا دەفەرموێ: ((أول ما خلق الله القلم: یەکەمین شت خوا ئافەریدەی کردبێ پێنوس بوە)).**

**ئەم وتە نابەجێیانە بەناوی فەرمودە لە نێو موسڵمانان بڵاو بۆتەوە، یەکێك لەم بەناو فەرمودانە ئەوەیە کە دەڵێ: ((لولاك لما خلقت الأفلاك: ئەگەر تۆنەبای گەردونم ئافەریدە نەدەکرد))** (سلسلة الأحاديث الضعيفة الموضوعة ژمارە ٢٨٢)، **یان دەڵێ: ((كنت نبياً وآدم بين الماء والطين: من پێغەمبەر بوم ئادەمیش هێشتا لە نێوان ئاو و قوڕدا دەتلایەوە))[٢٠١]** (بەناو فەرمودەی ژمارە ٣٠٢، ٣٠٣)، **یاخۆ دەڵێ: ((كنت أول النبيين في الخلق وآخرهم في البعث: لە ئافەریدەبوندا یەکەمین پێغەمبەر بوم و لە ناردنیشدا دواهەمین پێغەمبەر بوم))** (الفوائد المجموعةی

---

[٢٠١] هەر لەم بەندەدا لەژێر سەرناوی (نزای ئیبراهیم)دا فەرمودەیەکی هێناوەتەوە کە تێیدا دەفەرموێ: (اني عندالله مكتوب خاتم النبيين وان آدم لمنجدل في طينته) فەرمودەکەشی بەگوێرەی تەحقیقی ئەلبانی بە صەحیح داناوە، کەچی لێرەدا دەڵێ ئەم فەرمودەیە مەوضوعە (وەرگێڕ)

شەوكانى لاپەڕە ٣٢٦)، وە یاخۆ دەڵێ: ((لقد خلقت الدنیا وأهلـــها لأعرفـــهم كرامتك علي ومترلتك عندي، ولولاك یا محمد ما خلقت الدنیا: دنیاو خەڵكانم ئافەریدە كردوە تا رێزو پایەت لەلای مندا بناسن، ئەی موحەممەد تۆ نەبای دنیام ئافەریدە نەدەكرد)) (تنـــزيه الشريعة المرفوعة عن الأحاديث الضعيفـــة والموضوعـــة لاپەڕە ٣٢٥)، هەر هەمان سەرچاوە لاپەڕە (٣٣٧) بەناو فەرمودەیەكی تێدایە دەڵێ: ((خلقني الله من نوره وخلق أبا بكر مـــن نـــوري: خوا منی لە روناكی خۆی ئافەریدە كردوە، ئەبوبەكریشی لە روناكی من)).

ئەگەر بەراوردێكی نێوان وتەكانی ئینجیلی بەرنابا لەگەڵ ئەم بەناو فەرمودانە بكەیت، بۆت رون دەبێتەوە كەسێك ئەم وتانەی خستۆتە ناو ئینجیل كە ئەم ئەفسانەو هەڵبەستۆكانەی لە مێشكدا بێ.

شتی دیكەشی تێدایە بە پێغەمبەری هەڵبەستابێ، چونكە هاودژی ئەو هەقەیە كە لەبەردەستمان دایە، لە لاپەڕە (٢٠٩)دا دەڵێ: (دۆزەخ لە ئامادەبونی پێغەمبەرداﷺ رادەچەنێو دەلەرزێ، تا پێغەمبەر لەوێدا بێ و تەماشای بكات، سزاو ئەشكەنجەكەی خۆی رادەگرێ)، هەڵبەت ئەم وتەیە پێچەوانەی ئەم ئایەتەیە: ﴿لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ: سزاكانیان پشو نادەن و ئەوانیش لەناویدا بێ هومێدن﴾ الزخرف/٧٥.

لە لاپەڕە (٩٢) وتەیەكی عیسای پێغەمبەر دێنێتەوە: (من ئەو كەسە نیم كە كالەی پێغەمبەر یان قەیتانی پێلاوی بكەمەوە)، هەروەها لە لاپەڕە (٩٦) و (١٦٠)دا وتەی تری لەم بابەتەی هێناوە، هەڵبەت ئەستەمە پێغەمبەرێكی ئولولعەزم وتەی وا بوێژێ.

لەگەڵ ئەوانەشدا ئەم پەڕتوکە لە زۆر جێگادا سوکایەتی بە پێغەمبەرﷺ کردوە، لە لاپەڕە (١٠٨)دا وەسفی پێغەمبەرﷺ دەکات و دەڵێ: پاشان وەك سەرشێتانی لێ دێت، هەروەها لە لاپەڕە (١٠٥)دا دەڵێ:خوا لە رۆژی ژیانەوەدا یادگەی پێغەمبەر رەش دەکاتەوە.

## موژدەیتر لە سیفرە جیهانیەکانی تردا:[٢٠٢]

(مەولانا عەبدولحەق قەدیاریتی) پەڕتوکێکی بە زمانی ئینگلیزی و بەناوی (موحەممەد لە سیفرە جیهانیەکاندا) نوسیوە، خۆی لەبەر ئەوەی زمانی فارسی و هیندی و عەرەبی و عیبری و هەندێ زمانی ئەوروپاییشی زانیوە، بۆیە سودێکی زۆری بەراوردکارانەی لەم زمانانە وەرگرتوە، دڵی تەنها بە ئینجیل و تەورات ئاوی نەخواردۆتەوە، بەڵکو تۆژینەوەکەی فرەوانتر کردوەو چەندین پەڕتوکی فارسی و هیندی و بابلی کۆنیشی گرتۆتەوە، لەم پەڕتوکەیدا دەرەنجام و تۆژینەوەی وای پێشکەش کردوە بڕوا ناکەم هیچ نوسراوێکیتر شانی لە شان بدات.

مامۆستا عەبدولحەق دەڵێ: ناوی پێغەمبەری عەرەب کە ئەحمەدە لە پەڕتوکی ساماڤیدا(Samavida)ی بەرەهمیەکان بە بێژەی عەرەبی نوسراوە، لە بڕگەی شەشەم و هەشتەمی بەندی دوەمدا دەڵێ: (ئەحمەد بەرنامەو پێڕەوێك لە پەروەردگاری وەردەگرێ کە پڕیەتی لە دانایی، وەکو چۆن روناکی لە خۆر وەردەگیرێ)... نوسەر پێی وایە لە زۆر جێگەی تری پەڕتوکەکانی بەرەهمیەکاندا بە وەسفی ستایشی فرە و ناودەنگی فرەوان ناوی پێغەمبەر

---

[٢٠٢] نبوة محمد من الشك الى اليقين لاپەڕە ٢٠٤.

هاتوه، یەکێك لەوانە بریتیە لە (سەشراڤا Sushrava) کە لە پەڕتوکی (ئاثارفا ڤیدا Atharpha Vida) هاتوه.

هەروەها دەڵێ لە پەڕتوکە زەردەشتیەکانیش کە بە پەڕتوکی ئاگر پەرستەکان ناودەنگی وەرگرتوه باسی پێغەمبەرمانی کردوە، لە پەڕتوکی (زەند ئاڤێستا Zend Avesta)پێشبینی هاتنی پێغەمبەرێکی کردوە کە بۆ جیهانیان میهرەبانە (سوشیانت Soeshyant)، دوژمنێکی بەرەنگار دەبێتەوە کە بە فارسی کۆن پێی دەڵێن (Angra Mainyu: ئەبولەهەب)، ئەو پێغەمبەرە بانگەشەی یەك خوایي دەکات؛ هاوشێوەی نیە (هیچ چیز باونمار)، سەرەتا و کۆتایی نیە، زەبون و کەساس نابێ، هاوەڵ و باوك و دایك و ژن و منداڵ و خانو و جەستە و ڕەنگ و بۆنی نیە (جز آخاز و أنباز و دشمن و مانند و یار و پدر و مادر و زن و فرزند و جای سوی و تن أسا و تناني و رنگ و بوی آست).

ئەمەش سەرپاکی ئەو وەسفانەیە کە ئیسلام بۆ خوا دەیکات، بێ نیازیو بێ هاوشێوەیە، لە کەس نەبوەو کەسی لێ نابێ و هاو کوفی نیە، ژن و منداڵی نیە.

هەروەها نوسەر چەندین کۆپلەی دیکەی پەڕتوکە زەردەشتیەکان دێنێتەوە کە ئاماژە بە پێغەمبەرێك دەکات کە پەیامێکی هەق رادەگەیەنێ، هەروەها ئامـاژە بۆ بیابانی عەرەبستان دەکات، هەندێ برگەی لێ دێنێتەوە و بەبێ دەستکاری بۆ زمانی ئینگلیزی وەری دەگێڕێ: (نەتەوەی زەردەشت کاتێ دینی خۆیان فرێ دەدەن زەبون و ریسوا دەبن، لە عەرەبستاندا پیاوێك پەیدا دەبێ شوێنکەوتوانی فارسەکان دەبەزێنن و بەسەر فارسە فیزبەرزەکان زاڵ دەبن، دوای ئەوەی ئاگریان دەپەرست ئەوجار رودەکەنە کەعبەی ئیبراهیمی کە لە بت

پاك بۆتەوە، لەو کاتیوە ئیتر دەبنە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرەو دەبنە گەورەی فارس و مدیان و طوس و بەلخ کە شوێنی پیرۆزی زەردەشتیەکان و دەوروبەرەکانیانە، پێغەمبەرەکەیان رەوانبێژەو بە موعجیزان قسە دەکات[٢٠٣]).

## بەربلاوێتی ئەم موژدانە لە پێش پێغەمبەرایەتیدا:

ئەم موژدانە بەر لە پێغەمبەرایەتی موحەممەد لە نێو خەلکدا بەربلاو و بەناوبانگ بوە، چونکە ئەوکات نامەوەرەکان نەیاندەشاردەوە، بەلکو بلاویشیان دەکردەوە و دەیانگوت ئەگەر ئەم پێغەمبەرە دەرکەوێ ئێمە وەدوای دەکەوین، موسلمانانیش کە ئەم وتەو باس و موژدانەیان بیستوە زۆریان ئەزبەر کردوەو گێرایتیانەوە، پشتیوانەکانی مەدینە زۆریان لەم موژدانە بۆ گێراونەتەوە، تەنانەت هەندێ لە نامەوەران هەر لە مندالیەوە پێغەمبەریان ناسیوە، زۆریشیان بەسای ئەم موژدانەوە موسلمان بون.

## ئاکاری پێغەمبەرﷺ لە تەوراتدا:

بوخاری پێشەوا(بەر میهری خوا بێت) لە عەطای کوری یەسار دەگێرێتەوە کە دەلێ: عەبدوللای کوری عەمری کوری عاصم دیت پێم گوت: ئاکارەکانی پێغەمبەرم پێ بلێ کە لە تەوراتدا باس کراوە، گوتی: بەسەر چاو، سوێند بەخوا بە هەندێ لەو ئاکارانە وەسف کراوە کە قورئان یادی کردون: ﴿يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا: ئەی پێغەمبەر تۆمان بە گەواهیکارو موژدەگار و هەرەشەگار ناردوە﴾ الأحزاب/٤٥. پارێزەرو پەنای ئومیەکانی، ئەتۆ

---

[٢٠٣] لاپەرە (٤٧)ی Mohammed in world Scriptures بە وەرگرتن لە پەرتوکی (مطلع النــور) ی مامۆستا عباس محمود العقاد (١٤-١٧).

بەندەو پەیامبەری منی، ناوم نای موتەوەککیل، روگرژو دڵرەق نیە، بازاڕیی نیە تا جاڕ بدات، خراپە بە خراپە لانـادات، بـەڵکو دەبـوریٚ و دەبەخشـیٚ، خـودا نایمریٚنیٚ تا ریٚبازی خواروخیٚچی پیٚ راست دەکاتەوە و دەڵیٚن لا إلـه إلا الله، تـا چاوی کویٚرو گویٚی کەڕ و دڵانی پەردەدار والاّ دەکات[204].

دارمیش فەرمودەیەکی نزیك لەمەی وترا لـە ئیبنـو سـەلام گیٚڕاوەتـەوە[205]، هەروەها لە کەعبیش دەگیٚڕیٚتەوە کە یەکیٚك بو لە زاناکانی جولەکان و بڕوای بە پیٚغەمبەرﷺ هیٚنا، دەڵیٚ: (لە تـەوراتدا نوسـراوە موحەممەد پەیامبـەری خوایـە، دڵرەق روتاڵ نیە، جاڕدەری بازاڕان نیە، وەڵامی خراپە بەخراپە ناداتەوە، بەڵکو دەبوریٚ و چاوپۆشی دەکات، لە مەککە لە دایك دەبیٚ بۆ طیبە[206] کۆچ دەکات، دەسەلاّت و دەوڵەتمەندیەکەی لە شامە، ئەتەوەکەی ستایشگوزارن، لە نهیٚنی و ئاشکرادا سوپاسی خوا دەکەن، لـە هـەمو نشـیٚویٚکدا ستایشـی خـوا دەکـەن، لـە هەمو هەوراٚزیٚکدا ئەڵلاّهوئەکبەر دەکەن، شوانی خۆرن، نویٚژی خۆیـان لـە کـاتی خۆیدا دەکەن، کراسیان تا نیٚوەڕاستی پیٚیان گورج دەکەن، لە دەستنویٚژدا پـەل و پیٚیان دەشۆن، بانگدەریٚ بە ئاسماندا هاوار دەکات ریزی شـەڕیٚیان ریکخـەن، ریـزی نویٚژییـان ریکخـەن، شـەوانیش دەنگـەدەنگی وەکـو گیزەگـیزی میٚشـەنگوینیان لیٚ دەبیستریٚ)—تـەبریزی دەڵـیٚ ئەمـە بیٚژەی (المصـابیح) وایـە، دارمیـش بـە جیاوازیەکی کەم گیٚڕاویەتیەوە[207].

---

[204] بوخاری گیٚڕایتیەوە (مشکاة المصابیح ٣/١٢٥).

[205] مشکاة المصابیح (٣/١٢٥).

[206] مەبەست لە شاری مەدینەیە، کە ئەم ناوەشیان پیٚ وتوە—وەرگیٚڕ—

[207] مشکاة المصابیح (٣/١٢٩).

## ئەم موژدەیە لە کوێندەرێی تەوڕات دایە؟:

ئەم موژدەیە لە نێومرۆکی ئەو تەوڕاتانەدا هەیە کە ئەمڕۆ لەبەردەستی جولەکەو دیانان دایە، رەنگە ئەو تەوڕاتەشیان هەبێ کە ئەم موژدانەی تێدایە، بەلاّم شاردبیانەوە و تەنها ئەحبارەکانیان پێی بزانن[٢٠٨]، ئێمە کە دەڵێین تەوڕات مەبەستمان لە تەوڕاتەکەی پێغەمبەر موسا نییە، بەڵکو مەبەستمان لەو پەرتوکانەیە کە خوا دایبەزاندون جار هەیە ئەو پەرتوکە ئاسمانیانەش کە خوا دایبەزاندوە پێی وتراوە قورئان، هەروەکو لە فەرمودەیەکی صەحیحدا هاتوە: ((خفف علي داود القرآن فكان ما بين أن يسرج دابته الى أن يركبها يقرأ

---

[٢٠٨] دیارە تا سەردەمی پێغەمبەرﷺ دانە ئینجیل و تەوڕاتی ساغ و راستەقینە هەبون، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الإِنْجِيلِ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ: با ئینجیلیەکان بەوانە حوکم بکەن کە خوا لە ئینجیلدا ناردویتی﴾ المائدة/٤٧، ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِنْدَهُمُ التَّوْرَاةُ فِيهَا حُكْمُ اللَّهِ: ئەوان چۆن دەیانەوێ تۆ بکەنە دادوەر لە کاتێکدا تەوڕاتیان لەلایەو حوکمی خوای تێدایە؟﴾ المائدة/٤٣، ﴿لَسْتُمْ عَلَى شَيْءٍ حَتَّى تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ: نامەوەران! ئێوە لەسەر هیچ ئاینێکی دروست نین تا تەوڕات و ئینجیل و هەناردراوی خوا پەیرەو نەکەن﴾ المائدة/٦٨.

تا ئەو کات دانەی وا هەبوە وەبەر گۆڕین و دەستکاری نەکەوتبێ، بەلاّم جولەکەکان دەیانشاردەوە، رەنگە تا ئێستاش دانەی نەگۆڕاو مابێ، بەلاّم زاناکانی جولەکەو دیانان شاردبیانەوە.. نوسەری (محمد نبي الإسلام) لە لاپەڕە (٤٦)دا لە گۆڤاری (ئیکۆنۆمیست)ی بەریتانیدا ئەم وتەیە دێنێتەوە کە دەڵێ: ئەو کەسەی بۆ ئەرکی (کوڕیا) واتە بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوەندی کەنیسەی کاتۆلیکی هەڵدەبژێردرێت، یەکەم ئیشی ئەوەیە کە دەبێ سوێندی پیرۆز بخوات لەسەر ئەوەی هەرچی زانیاریەو بەبەرچاوێ دەکەوێت و پێی دەزانێ بیپارێزێ، بە تایبەتی کەلەپورو سامانی کلێسا، ئەوە جگە لەو هەمو کەلوپەلە ناوازەو سامانە هونەریانەی کە ڤاتیکان هەیەتی، کە لە بەنرخترین کەلەپور و سامانەکانی دنیا هەژمار دەکرێ، کە دەڵێین سامانی هونەری هەڵبەت مەبەستمان ئەو کتێبخانە قەبارە گەورەیە کە چەندەها پەرتوکی لەبارەی دینی مەسیحی تێدایە، خۆ ئەگەر رێگە بدرێ بە ئازادی توێژینەوەی زانستی تێدا ئەنجام بدرێ ئەوا زانیاریەکی گەلاّ زۆری لەبارەی چەرخە تاریکە سەرەتاییەکانی مێژوی مەسیحیتی لێ وەدەست دەهات.

القــوآن: داود خوێندنـەوەی قورئانی بۆ ئاسان کرابو، تەنها لەو ماوەیـەی کە چارەوێیەکەی زین دەکرد و تا سواری دەبـو هـەموی دەخوێنـدەوە)) لـێرەدا مەبەستی لە قورئاندا زەبورە-، لە هەندێ لەو موژدانـەی لـە بـارەی نەتـەوەی ئیسلامی دواوە دەڵێ: (ئینجیلیان لە سینە دایە)، قورئانی بە ئینجیل ناوبردوە، بەم پێوشوێنە ئەم موژدەیەیان لە پێغەمبەرایەتی ئەشعیادا لەلا دایە کە تێیدا دەڵێ: (ئەو بەندەیەی نەفسم پێی شاد بـو سروشـی خۆمـی بـۆ دادەبـەزێنم، دادگەری من لەنێو نەتـەواندا بـڵاو دەکاتـەوە، ئامۆژگارییـان دەکـات، بـە قاقـا پێناکەنێ، لە بازاڕان جاڕی نابیستری، چاوی کوێر بینـا دەکات، گوێـی کـەڕ ژنەوا دەکات، دڵی داخراو زندو دەکاتەوە، ئەوەی بەوی دەبەخشم بە کەسی تری نابەخشم، بە ستایشی تازە و نوێ ستایشی خوا دەکـات، لـە ئەوپـەڕی زەویەوە دێت، ئافەریدان و خەڵکان شاد دەبن، لە هەمو بەرزاییەك لا إله إلا الله دەڵێن، لـە هـەمو هـەورازێك تـەکبیر دەکـەن، زەبـون نـابێ، ژێـر دەسـت نـابێ، هەوەستی پەست نایبزوێنێ، ئەو پیاوچاکانەی وەکو قامیشـی ناسـکۆڵە وان زەبون ناکات، بەڵکو راستان بەهێز دەکات، پەنای ناگزورانە، رونـاکی خوایـە و ناکوژێتەوە، شوێنەواری دەسەڵاتەکەی لەسەر شانە[٢٠٩].

## پێ ڕاگەیاندنی ئیبنولهیبان:

یـەکێك لـەو زانیاریانـەی دەربـارەی زانـا جولەکـەکانی پێـش ئیسـلام کـە پەڕتوکەکانی فەرمودە بۆمانی پاشەکەوت کردوە ئەوەیە کە: پیاوێکی جولەکە نـاوی ئیبنولهیبـان بـو، دو سـاڵ بـەر لـە ئیسـلام هاتـە نـاو جولەکـەکانی بەنیقورەیضـەو لـەناویاندا نیشـتەجێ بـو، بێـژەرەوەی روداوەکـە دەڵـێ:

---

[٢٠٩] الجواب الصحيح لابن تيمية (٣/٢٨١).

پیاوێکمان نەدیوە وەکو وی بە جوان و پوختەیی پێنج نوێژەی کردبێ، لەلای ئێمە نیشتەجێ بو، ئەگەر باران نەباریبا و ساڵ نەهات بوایە پێمان دەگوت: ئیبنولهیبان! وەرە دەرەوە نزابارانەمان بۆ بکە، ئەویش دەیگوت: نەخێر، بەو خوایە هەتا وەکو سەدەقەیەك نەبەخشن نایەمە دەرەوە، پێمان دەگوت: چەند ببەخشین، دەیگوت: یەك مەن خورما یان دو مشتە جۆ، دەڵێ ئێمەش دەمانبەخشی ئەنجا ئێمەی دەبردە نزیك زەوی و زارەکانمان و نزابارانەی دەکرد، بەو خوایە! هێشتا لە جێی خۆی هەڵنەستابو هەور دەهات و دەیباراند، ئەمەی نەك جارێك بەڵکو چەندین جار کردویەتی.

دەڵێ: پاشان هاتە سەرمردن، کەزانی دەمرێ بە جولەکەکانی گوت: هەیاران! دەزانن بۆچی خاکی گوزەرانی گوشاد و پڕ لە بادەو خواردنی جۆراوجۆرم بەجێ هێشتوەو هاتومەتە ئێرەی برسی؟ دەڵێ: گوتمان: خوا دەزانێ.

گوتی: هاتومەتە ئێرە چونکە خەریکە پێغەمبەرێك پەیدا ببێ، ئەم خاکە دەبێتە کۆچگەی، خۆزگەم وابو خوا بینێرێ و وەدوای کەوم، تاوی هاتنی ئەم پێغەمبەرە گزنگی داوەو هەر پەیدا دەبێ، هەیاران! رکەبەری لەگەڵدا مەکەن، هەر کەس و کۆمەڵێك دوژمنایەتی بکات خوێنیان دەرێژێ و منداڵانیان بە دەسکەوت دەگرێ، ئەوە نەبێتە مایەی بەرهەڵستی کردنتان.

کۆمەڵە گەنجێکی جولەکەکانی قورەیضە لەم ئامۆژەی ئیبنولهیبان بەهرەمەند بون و بەسای قسەکانی بونە موسڵمان، گەنجەکان ئەوانە بون: ثەعلبەی کوڕی سەعی، ئوسەیدی کوڕی سەعی، ئەسەدی کوڕی عوبێد.

کاتی خۆی کە پێغەمبەرﷺ گەمارۆی بەنی قورەیضەی دا ئەم نەوجەوانانە گوتیان: هۆ بەنی قورەیضە! بەو خوایە ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئیبنولهیبان

بەڵێنی پێدان، گوتیان هەمو نیە، ئەوانیش گوتیان: بەڵێ هەوە ئاکارەکانی دیارە، ئیتر دابەزین و بونە موسڵمان، خوێن و دارایی‌و کەروباریان پارێزرا[210].

## دەیانزانی راستە بەڵام نەدەبونە موسڵمان:

ئەبو نوعەیم بە ئیسنادی خۆی لە موحەممەدی کوڕی سەلەمە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: لەناو بەنی عەبدولئەشهەلدا تەنها یەك کەسی جولەکە هەبو، پێیان دەگوت یوشەع -من ئەو کات منداڵێکی هەراش بوم- گوێم لێبو دەیگوت: وەختی هاتوە پێغەمبەرێك لە دەوروبەری ئەم خانوەدا پەیدا ببێ، پاشان پەنجەی بۆ کەعبە راداشت، ئەوەی پێی گەیشت با بڕوای پێ بێنێ، جا کاتێك پێغەمبەرﷺ هات هەمو بوینە موسڵمان، کەچی ئەو لەبەر رق و کینەو ئیرەیی نەبوە موسڵمان[211].

## عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بەهرە لە زانستەکەی وەردەگرێ:

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام دەمڕاست و خانزادەو فرمزانی جولەکان بو، دەڵێ: گوێم لێ ببو پێغەمبەرﷺ پەیدا بوە، سیفەت و ناو و شێوەو ئەو سەردەمەشم دەزانی کە چاوەڕێ بوین لەو کاتی پەیدا ببێ، بەڵام لە (قەبا)دا کڕ و بێدەنگ بوم لەم مەسەلەیە تا ئەو رۆژەی پێغەمبەرﷺ بەرەو شاری مەدینە کۆچی کرد، کە گەیشتە قەبا لە ماڵی بەنیعەمری کوڕی عەوف دابەزی، پاشان پیاوێك هات گوتی: پێغەمبەرﷺ گەیشت، ئەودەمی من لەسەر دارخورمایەك بوم ئیشم تێدا دەکرد، خالیدەی کچی حاریثی پلکم لە بن دارەکە دانیشتبو، کە گوێم لێبو گەیشتوە، دەنگم هەڵبڕی و گوتم: ئەڵڵاهوئەکبەر، پلکم کە تەکبیرەمی گوێ لێبو

---

[210] البداية والنهاية (١/ى١٥٤).

[211] البداية والنهاية (٥/٩ى٥).

گوتی: ئەگەر بیان گوتبا موسای کوڕی عیمران هاتوە هەر هێندەت دەکرد، دەڵێ پێم گوت: بەو خوایە پلکە گیان! ئەویش برای موسای کوڕی عیمرانە، بەدینێکی وەك دینی ئەو هاتوە، دەڵێ گوتی: ئەی کوڕی برام، ئایە ئەو کەسەیە کە دەمانگوت لەگەڵ ڕۆژی دواییدا دێتە ئارا؟ دەڵێ گوتم: بەڵێ، گوتی: کەواتە ئەوە[212].

بوخاری(بەر میهری خوا بێت) موسڵمانبونی عەبدوڵلای کوڕی سەلام دەگێڕێتەوە کە چۆتە لای و داوای لێ کردوە بە دوای جولەکەکاندا بنێری و پرسیاریان لێ بکات بێئەوەی بزانن عەبدوڵلای کوڕی سەلام بۆتە موسڵمان، جا کە هاتن پێغەمبەرﷺ پێیانی گوت: هۆ جولەکەینە! بەسە لە خوا بترسن، سوێند بە خوای تاك زۆر چاك دەزانن من پێغەمبەری خوام و بەڕەوا بۆ ئێوەی ڕەوان کردوم، وەرن موسڵمان بن، گوتیان: نەخێر نازانین، فەرموی: باشە عەبدوڵلای کوڕی سەلام لە ناوتاندا چۆن پیاوێکە؟ گوتیان: گەورەو کوڕی گەورەمانە، زاناو کوڕی زانامانە، فەرموی: ئەدی ئەگەر موسڵمان ببو؟ گوتیان: هەرگیز!، فەرموی: کوڕی سەلام وەرە، ئەویش هات و گوتی: هۆ جولەکەینە! لە خوای تاك و تەنیا بترسن، هەموتان دەزانن ئەوە پێغەمبەری خوایە، بەڕەوا هاتوە، گوتیان: درۆ دەکەی، پاشان پێغەمبەرﷺ هەموانی دەرکرد[213].

## گەواهیدانی نەوجەوانێکی جولەکە:

ئەنەسی کوڕی مالیك(ڕەزای خوای لێبێ) دەگێڕێتەوەو دەڵێ: نەوجەوانێك هەبو راژەی پێغەمبەرﷺی دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەرﷺ سەردانی کرد، دیتی وا باوکی لەلای سەری دانیشتوەو تەوراتی لەسەر دەخوێنێ، پێغەمبەرﷺ بە

---

[212] ابن اسحاق في السيرة (البداية ٣/٢١١).

[213] البداية (ه/ ٥١١).

باوکەکەی فەرمو: ئەی جولەکە! ئەتۆ و ئەو خوایەی تەوراتی بۆ موسا دابەزاندوە لە تەوراتدا ئاکارو باسی هاتنی منی تێدایە؟ گوتی: نەخێر، نەوجەوانەکە گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بەو خوایە ئاکارو باسی هاتنی تۆی تێدایە، منیش گەواهی دەدەم کە جگە لە الله هیچ خوایەك نیەو تۆش پێغەمبەری خوای. بەیهەقی بە ئیسنادێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە.[٢١٤]

## زیرەکی رەبەنێك:

پێغەمبەرﷺ بە منداڵی لەگەڵ ئەبوتاڵیبی مامیدا دەبێ کە بە مەبەستی بازرگانی بۆ شام دەچێت، لە رێدا رەبەنێك دەیبینێ و دەزانێ دەبێتە پێغەمبەر، سەربردەکەش بەم جۆرەیە کە ئەبو موسا دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەبو تاڵیب پێغەمبەرﷺ لەگەڵ خۆی دەباو لەگەڵ چەند کەسێك لە پیرانی قورەیش دەچن بۆ سەفەری شام، کە دەگەنە لای رەبەنەکە لەوێ دادەبەزن و بارگە دەخەن، جارانی پێشو کە لەو شوێنە لایان دەدا رەبەنەکە نەدەهاتە لایان و فەرامۆشی دەکردن، بەڵام ئەمجارەیان هات، کە دەگاتە لایان کاروانەکە هێشتا هەر خەریکی بارخستن بون، بەناویاندا دەسوڕێتەوە تا دەگاتە لای پێغەمبەرﷺ دەستی دەگرێ‌و دەڵێ: ئەمە گەورەی جیهانە، ئەمە پەیامبەری جیهانە، ئەمە خوا دەیکاتە پێغەمبەرێکی میهربەخشی جیهان.

پیرانی قورەیش پێیان گوت: چۆنت زانی؟ گوتی: کە ئێوە لە گردەکە بەسەر کەوتن دارو بەرد نەما سوژدە بۆ ئەم کوڕە نەبەن، دارو بەردیش تەنها بۆ پێغەمبەران سوژدە دەبەن، هەروەها بە مۆری پێغەمبەرایەتیش دەیناسم کەوا لە بن قوڵنجی هاتوە، هەندی سێوێك دەبێ، سەیری مۆرەکەی کردو بەتەواوی دڵنیا بو، ئەنجا رەبەنەکە گەڕایەوە جێگەکەی خۆی نانی بۆ دروست کردن، کە

---

[٢١٤] الجواب الصحيح (٣/٢٨٧).

نانەکەی بۆ هێنان، ئەو کاتی پێغەمبەرﷺ لەلای وشترەکان دەبێ دەیانلەوەڕێنێ، دەڵێ: بڕۆن بانگی بکەن ئەویش بێت، کە پێغەمبەر هات پەڵە هەورێك لە ژوور سەریەوە بو سێبەری لێ دەکرد، کەنزیك بۆوە بینی پیاوەکان لە سێبەری درەختەکە دانیشتون و جێگەی ئەو نابێتەوە، بۆیە لەملاوە دانیشت، بەڵام هەرکە پێغەمبەرﷺ دانیشت سێبەری درەختەکە بایداوە بۆ سەر ئەویش، رەبەنەکە گوتی: تەماشا کەن سێبەری درەختەکە چۆن بۆ سەر ئەویش بایداوە[215].

## زانایانی جولەکە کاتی هاتنی پێغەمبەریان زانیوە:

نامەوەرەکان بەسای ئەو نیشانانەی کە لە لایاندا بو دەیانزانی کاتی هاتنی پێغەمبەرﷺ نزیك بۆتەوە، ئەبوزورعە بە ئیسنادێکی صەحیحەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە، ئەویش لە زەیدی کوڕی حاریثەی باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە لە پێش پێغەمبەرایەتیدا، پێغەمبەرﷺ زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلی بینی، زەید پێی گوتوە من بۆ سۆراخی دینی هەق هاتوم، دینی یەکخواپەرستی، نامەوەرێکی فرەزان لەشام پێی گوتوم: تۆ لە دینێك دەپرسی پێمان وانیە کەس هەبێ پەیڕەوی لێ بکات تەنها پیرێك نەبێ کە لە جەزیرەدایە.

دەڵێ منیش سەرم هەڵگرت و هاتمە لای و رازی دڵی خۆم پێ گوت، پێی گوتم: من هەر کێم دیتوە لە گومڕاییدا بوە، تۆ لە کێی؟ گوتم: من لە خەڵکی لای کەعبەم، خەڵکی مەککەم.

---

[215] ئەم فەرمودەیە ترمزی گێڕاویەتیەوە و دەڵێ: فەرمودەیەکی حەسەنی غەریبە (مشكاة المصابيح ١٨٧/٣)، شێخ ناصری ئەلبانیش هەر لە مشکاتدا لە تەعلیقەکەیدا دەڵێ: رجالة ثقات، فەرمودەکە صەحیحە، لە وتارێکمدا رونم کردۆتەوە کە لە گۆڤاری (التمدن الإسلامي) بڵاوم کردۆتەوە.

گوتی: ئێستاکە لە هەرێمەکەی ئێوەدا یا ئەوەتە پێغەمبەرێك پەیدابوە یان خەریکە پەیدا ببێ، چونکە نیشانەکانی وەدەرکەوتون، بگەڕێوە ئەوێندەر و بڕوای پێ بێنە و وەدوای بکەوە.

منیش وا گەڕایمەوە و تا ئێستا چم نەدیوە[216].

زەید بەر لە پێغەمبەرایەتی قسەی لەگەڵ پێغەمبەرﷺدا کردوەو نەیزانیوە وا قسە لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە دەکات و نیشانەکان لەو هاتونەتە دی، بەڵام زەید بە چەند ساڵێك بەر لە پێغەمبەرایەتی مرد.

پێشتریش باسی ئیبنو لهیبانمان کرد کە لە شامەوە هاتبوە مەدینەو لەسەرمەرگدا بە جولەکەکانی گوت: هەیاران! من لەبەر ئەوە هاتومەتە ئێرە چونکە خەریکە پێغەمبەرێك دەرکەوێت، کە ئێرە (مەدینە) دەبێتە کۆچگەی.

لە صەحیحی بوخاریشدا هاتوە کە هیرەقل مەزندەزان بوە تەماشای ئەستێرانی دەکردو دەیگوت: ئەوا پاشای خەتەنەکار وەدەرکەوت.

# سێیەم: سەرنجدان لە ژین و ژیواری پێغەمبەران

ئەگەر بتەوێ بە ناخی مرۆڤێك شۆڕ ببیەوە و لە تانوپۆی چۆنایەتیەکەی بگەی، دەبێ سەرجەم گوفتارو کردەوەکانی تاووتوێ بکەی‌و هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی شی بکەیەوە، بەڵام هەرگیز ناتوانی بە چۆنایەتی کەسێتی یەکێك

[216] الجواب الصحيح (٣/٢٨٥).

ئاشنا بیت کە هەروا سەرپێیی دەیبینی، هەروەها ئەوانەش ناناسی کە ڕاستەقینەی خۆیان دەشارنەوەو گوفتار و وێنەی شانۆیی دەنوێنن، چونکە سروشتی خۆیان پەردەپۆش کردوە، بەڵام پێغەمبەران وانین، چونکە ئەوان لەگەڵ نەتەوەکانیان تێکەڵ بونەو هاموشۆیان کردون، لەبۆنەو ڕۆژانەی ژیاندا ڕەفتاری لەگەڵدا کردون، بۆیە خەڵك بۆیان ڕەخساوە لە نزیکەوە بیناسن و بەخەستی تێی بڕوانن، قورەیشیەکان بەر لە پێغەمبەرایەتیدا بە دەسپاك ناوی پێغەمبەریان دەهێنا چونکە ڕەوشت و دەست و دەم و داوێنی پاك بو، لە سەرەتای ڕاگەیاندنی پێغەمبەرایەتیەکەیدا بە خەڵکی گوت: ئێستا پێتان ئەگەر بڵێم وا لە پشت ئەو دۆڵە حەشاماتێك ئەسپ سوار بەتەمان بەسەرتان دابدەن، پێم باوەڕ دەکەن؟ گوتیان: بەڵێ چونکە قەت درۆمان لێ نەبیستوی[217]، خواش ئەوەی بە بەڵگە هێناوەتەوە: ﴿قُل لَّوْ شَاءَ اللَّهُ مَا تَلَوْتُهُ عَلَيْكُمْ وَلَا أَدْرَاكُم بِهِ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ: بڵێ: ئەگەر خوا بیویستبا ئەم قورئانەم بەسەردا نەدەخوێندنەوەو لەسەر زاری من پێی ڕانەدەگەیاندن، تەمەنێکی دورو درێژم لە ناوتاندا بەسەر بردوەو باش دەمناسن کە هەرگیز درۆم نەکردوە، هێشتا نافامن؟!﴾ یونس/١٦.

پێغەمبەرﷺ پێیان دەڵێ: بەر لە پێغەمبەرایەتیمدا ماوەیەکی دورو درێژی چل ساڵیم لە نێوتاندا بەسەر بردوە، دە فەرمون بزانن ژین و ژیوارم چۆن بوە؟ ڕاستگۆییم چۆن بوە؟ باشە قەت درۆم لەگەڵ خەڵك کردوە تا لەگەڵ خوای خەڵك بیکەم؟ بۆ تێناگەن؟ بۆچی ئاوەز و ژیریتان ناخەنە کار تا بەڵکو ڕێنوێن بن؟!

---

[217] بوخاری گێڕایتیەوە.

مانگی چوارده حەوجێی بە ئامـاژە نیـە و چـرای پرشـەنگیش خـەڵك بـە ڕۆشناییەکەی ڕێنوێن دەبن: ﴿يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ﴾ النور/٣٥.

خەڵکانێك هەبون یەکسەر دەبونە موسڵمان و داوای بەڵگەشیان نـەدەکرد، چونکە دەیانزانی پێغەمبەرﷺ درۆی نەکردوەو نایکات، ئەبو بەکر(ڕەزای خـوای لێبێ) یەکێك بو لەوانە، کە پێغەمبەرﷺ بانگی کرد و داوای کرد ببێتە موسڵمان دەستبەجێ شادەی هێنا، عەبدوڵڵای کوڕی سەلام(ڕەزای خوای لێبـێ) یەك جار تەماشای ڕوی پێغەمبەرﷺی کرد، ئەو یەك جارە بەس بو بۆ ئەوەی بزانـێ ڕاستگۆیە، پێغەمبەرﷺ کە چوە مەدینە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامیش کە زانایەکی جولەکە بو لەگەڵ خەڵك چوبوە پێشوازی و تەماشای ڕوی پیرۆزی پێغەمبەرﷺی دەکرد، خۆی دەڵێ: کە ڕوی پیرۆزیم دیت یەکسەر زانیم ڕوی درۆزن نیە[٢١٨].

خەدیجەی خێزانی کە لە نزیکەوە بەر لە پێغەمبەرایەتی شارەزای پێغەمبەرﷺ بو، زۆر چاك پێغەمبەری ئازیزی دەناسی، بۆیە کە پێغەمبەرﷺ یەکەم سروشی بۆ دابەزی و لە ئەشکەوتی حیرادا گەڕایەوەو ترسی لێ نیشتبو، پێی گوت: نا بەو خوایە خوا هەرگیز زەبونت ناکات، چونکە تۆ خزمایەتیت بەجێ گەیاندوە، یارمەتی کۆسکەوتوانت داوە، ماڵ و پارەت بەنەداران بەخشیوە، ڕێزی میوانەکانت گرتوە، لایەنگیری هەقت کردوەو یارمەتی ئەوانەشت داوە کە لە پێناو هەقدا توشی تەنگانە هاتون[٢١٩].

---

[٢١٨] رواه أحمد في مسنده والترمذي في سننه وقال حديث صحيح وابن ماجه في سننه (البداية والنهاية ٢١٠/٣).

[٢١٩] صحيح البخاري (فتح الباري ٢٢/١).

## هیرەقل و ئەبو سوفیان:

هیرەقلی پادشای رۆمەکان ناوەزو ژێری خۆی خستبوە کار و زانستێکی فرەی لە بارەی ژین و ژیواری پێغەمبەرانەوە پەیدا کردبو، لە ئەنجامدا گەیشتە ئەوەی کە موحەممەد پەیامبەری خوایە، بەلام لەبەر پادشایەتیەکەی نەبوە موسلمان و بڕوای پێ نەهێنا.

پێغەمبەرﷺ نامەی بۆ هەمو پادشاکانی سەردەمی خۆی ناردو داوای لێکردن ببنە موسلمان، هیرەقلیش یەکێك بو لەوانە و داوای لەویش کرد، جا کاتێك نامەکەی بەدەست گەیشت بانگی ئەو عەرەبانەی کرد کە ئەوکاتی لەوێدا بون، ئەبو سوفیانیش لەگەڵ کاروانێکی قورەیشیان بە مەبەستی بازرگانی چوبوە ئەوێ، بانگی کردن و لە بارەی ژین و ژیواری پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە ئەبو سوفیان دەکردو بە ئەوانی تریشی گوت ئەگەر درۆی کرد لێی سپی بکەنەوە، ئەوانیش سەریان بۆ لەقاند و رازی بون، فەرمو ئەمەش گفتوگۆیەکەی نێوان هیرەقل و ئەبو سوفیانە، کە ئەبو سوفیان بەخۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

یەکەمین پرسیار ئەوەبو گوتی: رەچەلەك و نەژادی چۆنە؟

گوتم: خانەدانە.

گوتی: پێشی ئەو کەسی ترتان داوای پێغەمبەرایەتی کردوە؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: لە باب وباپیرانی کەسێك هەبوە پادشا بوبێ؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: خەڵکی رەمەکی و بێدەسەڵات وەدوای دەکەون یان دەسەڵاتدار و پایەدار؟

گوتم: بێدەسەڵاتان.

گوتی: ژمارەیان لە زۆر بونە یان لە کەمبون؟

گوتم: لە زۆر بونە.

گوتی: کەس هەیە لەبەر جاڕس و بێزاربون هەڵگەڕابێتەوە؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: پێش ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات بە درۆزنتان زانیوە؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: پەیمان دەشکێنێ؟

گوتم: نەخێر، بەڵام ئێمە پەیمانێکمان لەگەڵیدا هەیە، نازانین چی لە گەڵدا دەکات.

ئەبو سوفیان دەڵێ: جگە لەمە نەمتوانی یەك وشەی تری تێ بخەم.

گوتی: شەڕتان لەگەڵیدا بەرپاکردوە؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: شەڕەکان چۆن بون؟

گوتم: بەنۆرە بو، جار هەبو دەیبردەوە، جار هەبو دەمانبردەوە.

گوتی: فەرمانی چیتان پێ دەکات؟

گوتم: دەڵێ: تەنیا خوا بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن، واز لە قسەی پڕوپوچی باوانتان بێنن، نوێژ بکەن، راستگۆبن، داوێنپاك بن، خزمایەتی بەجێ بێنن.

ئەنجا بە وەرگێڕەکەی گوت: پێی بڵێ: لەبارەی نەژادو رەچەڵەکیەوە پرسیارم لێ کردی، گوتت خانەدانە، پێغەمبەرانیش لە نەژادی پاکی گەلەکانیان دێنە ئارا.

لێتم پرسی کەسی ترتان پێشی ئەو داوای پێغەمبەرایەتی کردوە؟ گوتت: نەخێر، ئەگەر وابوایە دەمگوت لاسای ئەو دەکاتەوە.

لێتم پرسی باب وباپیرانی پاشابون؟ گوتت نەخێر، چونکە ئەگەر وابوایە دەمگوت داوای پاشایەتی باوانی دەکاتەوە.

لێتم پرسی پێش ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات بە درۆزنتان زانیوە؟ گوتت نەخێر، بۆیە دەزانم ئەگەر درۆ لەگەڵ خەڵك نەکات درۆ لەگەڵ خواش ناکات.

لێتم پرسی خەڵکی پایەدارو دەسەڵاتدار وەدوای دەکەون یان زەبون و ناگزوران؟ گوتت بێدەسەڵات و کەساسەکان، کە هەر ئەوان شوێنکەوتوانی پێغەمبەرانن.

لێتم پرسی شوێنکەوتوەکانی رو لە زۆر بونن یان لە کەمبون؟ گوتت رو لە زۆر بونن، دیارە بڕواش هەتا تەواو دەبێت و بە کامی خۆی دەگات وایە.

لێتم پرسی کەس لەبەر بێزاری و جاڕسی هەڵگەڕاوەتەوە؟ گوتت نەخێر، ئاخر ئەگەر روناکی بڕوا بچێتە ناو دڵ بەم جۆرەیە کەس جاڕس نابێ.

لێتم پرسی پەیمان دەشکێنێ؟ گوتت نەخێر، پێغەمبەرانیش پەیمان ناشکێنن.

لێتم پرسی فەرمانی چیتان پێ دەکات؟ گوتت یەکخواپەرستی و هاوەڵ بڕیارنەدان و نەپەرستنی بت و نوێژکردن و راستگۆیی و دەست و دەم و داوێن پاکی.

بەخوای ئەگەر راستت گوتبێ ئەوا پێگەی منیش دەگرێ، هەڵبەت دەمزانی پەیدا دەبێ، بەڵام پێم وانەبو لە ئێوە بێ، ئەگەر بمزانیبا دەیگەمێ دیداری ئەوم بەدیداری کەس نەدەگۆڕییەوە، ئەگەر لە لاشی دەبوم پێیەکانیم دەشوشت"[220].

## دنیا بە کەمگرتنیان:

هەر کەسێك لە ژیان و گوزەران و سەرگوزەشتەی پێغەمبەران رامێنێ و وردبێتەوە دەزانێ بەڵگەیەکی تری پێغەمبەرایەتیان ئەوەیە کە خۆشی دنیایان بە کەم و بێبایەخ گرتوە، تەفرەیان بەکاڵاوباڵای دنیا نەخواردوە، باق و بریق و رازاوەییەکەی کاری تێ نەکردون، هەرگیز داوای پاداشت و کرێیان لەو خەڵکە نەکردوە بەڵکو تەنها چاکە و قازانج و بەرژەوەندی خەڵکیان بەبێ بەرامبەر ویستوە، ئەوەتانێ یەکەمین پێغەمبەر بە گەلەکەی دەڵێ: ﴿وَيَاقَوْمِ لاَ أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مَالاً إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى اللهِ: ئەی هۆزی خۆم من کە بۆ ئیسلام بانگتان دەکەم کرێو پارەو پولتان لێ ناخوازم چونکە پاداشتی من لەلای خوایە﴾ هود/۲۹.

دواهەمین پێغەمبەریش هەمان دروشم بەرز دەکاتەوە و دەفەرموێ: ﴿قُلْ مَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِلاَّ مَنْ شَاءَ أَنْ يَتَّخِذَ إِلَى رَبِّهِ سَبِيلاً: پێیان بڵێ لە بری ئەم

[220] بوخاری گێڕایتیەوە-كتاب بدء الوحي (فتح الباري ۱/۳۱).

بانگەوازە پاداشت و کرێتان لێ ناخوازم پاداشتی من تەنها ئەوەیە کە ئێوە ڕێبازی خواپەرستی بگرنە بەر﴾ الفرقان/٥٧.

هەروەها خوا لە سورەتی (شعراء)دا یادی بەشێکی باسوخواسی نوح و هود و صالح و لوط و شوعەیب دەکاتەوە کە هەریەك لەوانە بە گەلەکەی گوتوە: ﴿وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلاَّ عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ: داوای کرێوپاداشتتان لێ ناکەم، پاداشتی من لەلای پەروەردگاری جیهانیانە﴾ الشعراء/١٠٩.

# چوارەم: بانگەوازی پێغەمبەران

سەرنجدان لە بانگەوازی پێغەمبەران بوارێکی پیرۆزدارەو ئەندازەی راستێتی پێغەمبەرانمان بۆ رون دەکاتەوە. پێغەمبەران بەرنامەو پێڕەوێکی تەواو و بێ کەموکوڕییان بۆ چاکسازی مرۆڤ و کۆمەڵگە هێناوە، ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانەش(سلاوی خوایان لەسەر بێت) بانگەشەی ئەوەیان کردوە ئایینەکەیان لەلای خواوە بۆ دابەزیوە، کەواتە دەبێ لەوپەڕی تەواوی و بێخەوشیدا بێ و لەگەڵ رێختی مرۆڤ و رێساکانی گەردون ناساز نەبێ، خوا لە قورئاندا سەرنجمان بەلای ئەو بەڵگەخوازیە دەبات و دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا: ئەگەر لەلای خوا دانەبەزیبا ناسازیو ناکۆکیەکی زۆریان تێدا بەدی دەکرد﴾ النساء/٨٢.

جا لەبەر ئەوەی هەر ئاینێکیان هێنابێ یەکەیەکی تەواوکەری یەکترین و بڕگەکانی یەکتر پەسند دەکەن، هەروەها ناسازی و ناکۆکی تێدا نیە، کەواتە راستە لەلای خوا دابەزیوەو بانگەشەکانیان خەوشی تێدا نیە.

هەروەها سەرنجدان لە مەبەست و ئامانجی بانگەوازی پێغەمبەران و بانگەشە کردنیان بۆ رەوشتی بەرزو کاری چاك هەمدیسان گەورەترین بەڵگەیە بۆ راستێتیان، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ: ئەم قورئانە مرۆڤ بۆ راستترین رێباز رێنوێنی دەکات﴾ الإسراء/٩.

زانایان نوسراو و پەرتوکی زۆریان لەبارەی تەواوێتی و هەموگرێتی ئەم ئاینە نوسیوە و ئامانج و مەبەستەکانی بەرنامەرێژیەکەیان رونکردۆتەوە،

هەروەها ئەو بنچینەو بناغانەشیان رونکردۆتەوە کە ئەم دینەیان کردۆتە بالآخانەیەکی پتەو و پوختە، کە خەڵك هەرچەندی بەدەوریدا دەگەڕێن تەنانەت یەك خەوش و کەم و کورتی چیە لێی نادۆزنەوە.

خوا ئاوەزی بە مرۆڤ بەخشیوەو بەهۆیەوە چاك و خراپان دەناسیٚ و هەستیان پیٚ دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوا بە سای رەحمی خۆی هەر بەوەندە سزای مرۆڤ نادات بەڵکو پەیامبەریشی بۆ دەنێریٚ و تا بیانوشیان نەبڕیٚ سزایان نادات.

لە رەشماڵنشینێکیان پرسی: چۆنت زانی موحەممەد پێغەمبەری خوایە؟ گوتی: چونکە هەرگیز فەرمانی بە شتێك نەکردوە ئاوەز بڵیٚ خۆزگە بەرهەڵستی لیٚدەکرد، هەروەها قەت بەرهەڵستی (نەهی) لە شتێك نەکردوە ئاوەز بڵیٚ خۆزگە فەرمانی پیٚ دەکرد[٢٢١].

## بانگەوازی پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ:

هەر یەکێك لە بانگەوازی پەیامبەری ئازیزمان رامێنیٚ و بڕوانیٚ، ستەمێکی زل لەخۆی دەکات ئەگەر بڕوای پیٚ نەهێنیٚ، چونکە پێغەمبەرﷺ قورئانێکی وای هێناوە تا ئێستا مرۆڤ و جنۆکە لە ئاستیدا دەسەوسانن و نەیانتوانیوە و ناتوانن قورئانێکی وەکو ئەو بێنن، هەروەها چەندین هەواڵ و سەرگوزەشتەی پێشان و ئایندەو چەندین چەشنە زانستی جۆراو جۆری لە ئامێز گرتوە کە ئەگەر هەر یەکێك ئەگەر بە چاوێکی دادپەروەرانەوە سەرنجیان بدات یەکڕاست گەواهی دەدات و بڕوا دێنیٚ.

---

[٢٢١] مفتاح دار السعادة (٢/٦-٧).

ئەم قورئانە.. ئەم هەمو زانستە سەیرو سەمەرەیە، کێ هێناویەتی؟.. پیاوێکی نەخوێندەوار! کە ڕۆژێك لە ڕۆژان پێنوسی لە دەست نەگرتوە، یەك دێڕ چیە نەیخوێندۆتەوە: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ: ئەی موحەممەد! پێشتر نە پەرتوکانت خوێندۆتەوە و نە نوسیوتە، گەر وا بوای دەکەوتنە گومان و دەیانگوت ڕەنگە نوسراو و پەرتوکی پێشینانمان بۆ بخوێنێتەوە﴾ العنكبوت/٤٨، شتێکی ئاسایی نیە پیاوێکی نەخوێندەوار لە ناکاوی شەو و ڕۆژێکدا ببێتە مامۆستای سەرجەم مرۆڤایەتی و زانست و زانیاری بەخەڵك ببەخشێ و زانستی پێشینان ڕاست بکاتەوە و گۆڕان و دەستێوەردانەکانی وەدیار بخات!.

خەڵکی مەککە چاك چاك ئەم ڕاستیەیان دەزانیو دەیانزانی موحەممەدێکی نەخوێندەوار ئەگەر پێغەمبەر نەبێ ناتوانێ ئەم بانگەشەیە بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی ئامادە نەبون بیکەن بە پێشەنگ و سەرمەشقی خۆیان بۆیە سەرکێشیان دەکردو بڕوایان نەدەهێنا: ﴿فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ﴾ الأنعام/٣٣.

هەرزەیيو بێئاوەزی بێبڕوایان گەیشتە ئەندازەیەك بڵێن ئاسنگەرێکی ڕۆمی مەککەنشین هەیە ئەم زانستانە بۆ موحەممەد دێنێ! بەراستی تۆمانجێکی سەیرە!: ﴿لِّسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُّبِينٌ: زمانی ئەو کەسەی فێرکردنی ئەم شتانەی دەدەنە پاڵ عەجەمیەو کەچی زمانی ئەم قورئانەش عەرەبیەکی ڕون و ڕەوانە﴾ النحل/١٠٣.

## پێنجەم: کۆمەك و پشتیوانی خوا بۆیان

یەکێکی‌تر لەوانەی راستێتی پێغەمبەران وەدەر دەخات یارمەتی و کۆمەکی خوایە کە خوا پشتیوانی لێ کردون و پاراستونی، مەحاڵە یەکێك درۆ بەدەم خواوە بکات و پاشان بە درۆ بڵێ من رەوانەکراوی خوام، خواش یارمەتی بدات و سەری بخات!، یان فریشتەی لە پێناودا دابەزێنێ، خۆ ئەگەر یەکێك بەناوی پەیامنێری پادشایەکی سەر زەوی خۆی هەڵداتەوە و بەناوی ئەمەوە قسە بکات و شتان ئەنجام بدات، ئەوا هەر کاتێك پادشاکە پێی بزانێ، هەر چۆن بێ هەوڵ دەدات ئەو ساختەچیە بگرێ و بەتوندترین شێوە سزای بدات، ئەوە پادشایەکی سەر روی زەوی ئەدی ئافەریدگاری تەواوی بونەوەر و گەردون، ئەو ئافەریدگارەی کە بە هەمو شتێك ئاگادارە، چۆن رێگە بە یەکێك دەدات یان چۆن یارمەتی کەسێك دەدات ئەگەر بە ناوی پێغەمبەرایەتیەوە قسە بکات و بە ناوی خواوە حەرام و حەلاڵ دارێژێ و پێرەو و بەرنامە بۆ خەڵك رەنگرێژ بکات و شەڕو کوشتار بەرپا بکات، بانگەشەی ئەوەش بکات کە بە فەرمانی خواوە ئەم کارانە دەکات، نەك هەر مەحاڵە یاریدەی بدات بەڵکو سزاشی دەدات.

هەڵبەت شتی وا قەت نابێ، خۆ ئەگەر رۆژێك لە رۆژان درۆزنێکی ناقۆلاو فێڵزانیش پەیدابو و هەندێك دەسەلاتیشی پەیدا کرد، ئەوا درێژ ناخایەنێ خوا ریسوای دەکات و ریسی لێ دەکاتەوە خوری، کارەساتێکی وای بەسەر دێنێ ببێتە پەندی زەمانە، موسەیلەمە و سەجاح و ئەسوەدی عینسی ئاشکرایە خوا چی بەسەر هێنان[٢٢٢].

---

[٢٢٢] بگەرێوە بۆ شرح العقيدة الطحاوية (ل ١٦٥-١٦٧)، ئیبنولقەییم لە پەرتوکی (هدایە الحیاری) بەڵگەی لەم بابەتەی هێناوەتەوە (تەماشای الجامع بکە ل ٥٦٢).

قورئانی پیرۆز ئەم جۆرە بەڵگەیەی هێناوەتەوە: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لاَ يُفْلِحُونَ: ئەوانەی بەناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن رزگاربونیان بۆ نیە﴾ النحل/١١٦، لەم ئایەتەدا هەڕەشەی رزگار نەبونی کردوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ، لأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ، ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ: مەبەستی ئەوەیە ئەگەر پێغەمبەرﷺ قسەیەکی وای بەناوی خوا بکردبا و خواش نەیفەرموبا ئەوا لەناوی دەبرد﴾ الحاقة/٤٤-٤٦.

ئەم بەڵگەیە تاو و کاریگەریەکی بە جۆش دەخاتە دڵی خەڵکان، عارەبەکان کە دیتیان ئیسلام سەرکەوت، بڕوایان هێناو بە ئاپۆرە هاتنە ناو ئیسلام: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ، وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا: کە کۆمەکی خوا هات و دەرگای سەرکەوتن والا بو، مەردومت دیت پۆل پۆل دەهاتنە ناو ئاینی خواوە﴾ النصر/١-٢.

## گومانێك:

هەندێ لە بێبڕوایان دەڵێن: ئەمە نابێتە بەڵگە، چونکە فیرعەون و نەمرود و پادشایانی تریش لە کۆن و نوێش سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، لە وەڵامدا دەڵێین راستە ئەوانە سەرکەوتنیان هێناوە بەڵام خۆ ئەوانە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان نەکردوە، ئەگەر بانگەشەیان بکردایە ئەوا بە مەرەدی موسەیلەمەی درۆزن و ئەسوەدی عینسی و سەجاح دەچون و خوا ئاسەواری دەبڕینەوە، هەروەها جەجالیش کە بانگەشەی خوایەتی دەکات، خوا مۆرکی درۆزنێتی لەنێوچەوان داوە و لێی نوسراوە ئەمە کافرە، هەمو بڕوادارێك ئەم

مۆره دەبینی مەگەر ئەوانەی لە روناکی بڕوا بێبەشن، کەواتە درۆزنان سەرەنجامیان ریسوابون و درۆ لێ سپی بونەوەیە.

بەڵام پێغەمبەرﷺ خوا فەرمانی پێکردوە خەڵك بەرەو خواپەرستی بانگ بکات و پێیان رابگەیەنێ کە باوەڕداران بەهەشتین و بێبڕوایانیش دۆزەخین، هەروەها خوا سەری خست و یارمەتی و کۆمەکی پێدا، خۆ ئەگەر درۆی بکردبا -دور لە روی پێغەمبەرﷺ- ئەوا خوا سزای دەدا و لەناوی دەبرد.

# بەندی هەشتەم

# پایەی پێغەمبەران و بەرز و بەرزتریتی نێوانیان

خوا ئافەریدانی ئەفراندوە و بەرز و نزمێتی لەنێواندا داناون: ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ: پەروەردگارت هەرچی بیەوێ ئافەریدەی دەکات و هەڵیدەبژێری﴾ القصص/٦٨، خوا لە زەویدا مەککەی هەڵبژاردوەو کردوٚتیە خانوی دێرین، هەر کەسێك بچێتە ناوی ئارام دەبێ، وای کردوە خەڵك لە هەمو لایەکەوە روی تێ بکەن، لەسەر خەڵکی بە توانای واجب کردوە سەردانی بکەن، راوکردن و هەڵقەلاندنی درەختی تێدا حەرام کردوە، پاداشتی کردەوەی چاکی تێدا چەند چەندانە کردوە، ئەوەی لەوێدا نیازی ستەمکاری هەبێ خوا شایەنی سزایەکی سەختی دەکات: ﴿وَمَنْ يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ الحج/٢٥.

خوا لەناو مانگەکاندا مانگی رەمەزان و لە نێو شەواندا شەوی قەدر و لەنێو رۆژەکاندا رۆژی عەرەفە و لەنێو هەفتەدا هەینی هەڵبژاردوە، هەروەها لەنێو فریشتەکانیشدا بەرز و نزمێتی هەیە، فریشتە هەیە پەیامنێری پێغەمبەرانە، لەناو مرۆڤانیشدا پێغەمبەرانی هەڵبژاردوە و پێغەمبەران چاترینی مرۆڤن، لە

ناو پێغەمبەرانیش پەیامبەران باشترینن: ﴿اللهُ يَصْطَفِي مِنَ الْمَلائِكَةِ رُسُلا وَمِنَ النَّاسِ إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ: خوا لەناو فریشتەو مەردومدا نێردراوان هەڵدەبژێرێ، خوا ژنەوا و بینایە﴾ الحج/٧٥.

تێکڕای نەتەوەی ئیسلامی لەوە یەکدەنگن کە پێغەمبەران لە بەڕاستزان و شەهید و پیاوچاکان باشترن[٢٢٣]، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە: ﴿وَتِلْكَ حُجَّتُنَا آتَيْنَاهَا إِبْرَاهِيمَ عَلَى قَوْمِهِ نَرْفَعُ دَرَجَاتٍ مَنْ نَشَاءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ، وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ كُلاً هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِنْ قَبْلُ وَمِنْ ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ، وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِنَ الصَّالِحِينَ، وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاً فَضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ﴾ الأنعام/٨٣-٨٦.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ ((لەدوای پێغەمبەراندا ڕۆژئاوابون و ڕۆژهەڵاتن بەسەر پیاوێکی لە ئەبو بەکر چاکتر دانەهاتوە))، لەم فەرموودەیە دەردەکەوێت کە پێغەمبەران چاترینی خەڵکن، لەدوای وانیش ئەبو بەکر، فەرموودەیەکی تریش لەم بارەوە هەیە واتای ئەمە بگەیەنێ کە لەبارەی ئەبو بەکر و عومەرەوەیە(ڕەزای خوایان لێبێ) دەفەرموێ: ((هذان سيدا كهول أهل الجنة من الأولين والآخرين، إلاّ النبيين والمرسلين: ئەم دوانە چاترینی پیرەکانی بەهەشتن هەر لە سەرەتاوە تا دواهەمین مرۆڤ تەنها پێغەمبەران و پەیامبەران نەبێ)).

---

[٢٢٣] مجموع فتاوى شيخ الإسلام (١١/٣٢١).

خوای پەروەردگار لە ئایەتێکدا بەندە چاکەکار و ئاسودەکانی بەم چوارە ڕیزکردوە: ﴿وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُوْلَٰئِكَ رَفِيقًا: ئەوانەی گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرن لە بەهەشتدا هاودەمی پێغەمبەران و بڕواڕاست و شەهیدان و چاکەکارانن کە باشترین هاوڕێ و هاودەمن﴾ النساء/٦٩.

کەواتە یەکەمین پلە پێغەمبەرانن پاشان بڕواڕاست پاشان شەهیدان ئەنجا پیاوچاکان.

## ڕێکەوت ڕێی پێ نابات:

ڕەنگە گومانبارێك بڵێ لەوانەیە هی وا هەبێ بە ڕێکەوت و بێ ئەوەی شایستە بێ پێغەمبەرایەتی وەرگرتبێ! پەنا بە خوا قەت شتی وا نەبوە چونکە خوای زاناو لێزان و کاربەجێ بەخۆی لە بەندەکانی ڕوانیوە و تەواوترین و چاترینیانی هەڵبژاردوە، خوا ڕاستی فەرموە: ﴿اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ: خوا زاناترە بەوەی پەیامی خۆی بەکێ دەبەخشێ﴾ الأنعام/١٢٤.

لێزانی و زانستی خوا وا دەخوازێ تەنها شایەن و لێوەشاوان بۆ هەڵگرتنی ئەم ئەرکە هەڵبژێردرێن[٢٢٤]، ئەگەر لە ژین و ژیواری پێغەمبەران ڕامێنی بۆت

[٢٢٤] ڕێنوێنان و پەیڕەوکارانی قورئان و فەرموده پێیان وایە پێغەمبەران تەواوترین و چاترین بەندەن، خوا بۆ ئەوە هەڵیبژاردون تا ببنە پەیامبەر بۆ بەندەکان، دەبێ جیاوازی لە نێوان سروش و سروشی پێغەمبەران بکەین خوا هەر سروشێکی بۆ ناردبن زانیاریان دەربارەی نەبوەو بۆ زیرەکی ئەوان ناگەڕێتەوە، بۆیە خوا دەفەرموێتە پێغەمبەرەکەی: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ: ئێمە سروشمان بۆ ناردوی کە پێشتر نەتدەزانی قورئان و بڕوا چیە﴾ الشــــوری/٥٢، هەڵبەت ئەوەی وتمان

دەردەکەوێت ئەو بەڕێزانە دڵیان لە هەمو کەس چاتر بوە، لە هەمو کەس زاناتر و ئارامگرتر و ڕەفتار شیرنتر و زیرەکتر بون، بۆیە جێی سەرسوڕمان نیە کە خوا ئەوانی هەڵبژاردبێ بۆ ئەوەی ببنە دەسپاکی سروش و کارمەندی چەسپاندنی دین پێغەمبەران ئەو تروٚپە بەرزانەن کە خەڵك قەت نایانگەنێ.

## بە باشتر دانانی پێشەوایان:[225]

بێگومان سەرجەم نەتەوەی ئیسلامی لەوە یەکدەنگن کە پێغەمبەران بەرزترین و چاکترین و باشترین مرۆڤن، بەڵام هەندێك چینی بەناو موسڵمان بۆچونی تریان لەم بارەوە هەیە کە لەگەڵ یەکدەنگی جەماوەری زانایان پێچەوانەیە، بە وێنە شیعەی دوازدەئیمامی، زانایەکی ناودار و هاوچەرخیان لەم بارەوە دەڵێ: یەکێك لە زەروراتی ڕاڕەوی ئێمە ئەوەیە کە پێشەواکانمان شوێنپایەکی ئەوتۆیان هەیە نە فریشتەی نزیك، نە پێغەمبەری ناردراویش تۆزی ڕێگایان ناشکێنن، هەروەها دەڵێ: لێیان دەگێڕنەوە -مەبەستی لە پێشەواکان دێت- کە گوتویانە: ئێمە حاڵەتی واممان لەگەڵ خوادا هەیە فریشتەی نزیك و پێغەمبەری ناردراویش نیانە، شوێنپایەی لەم جۆرە فاتیمەی زەهراش هەیبوە.

---

بەربەرچدانەوەی ئەوانەشی تێدایە کە پێیان وایە پێغەمبەر بە گەورە دادەنێن ئەگەر بە عەبقەری وەسفی بکەن، پاشان هەمو شتێك تەنانەت ئەو زانستانەی هێناویەتیشی، بۆ عەبقەریاتەکەی دەگەڕێتەوە، بێگومان ئەوە نەخشەکێشانێکی ساختەکارانەیە و بەهۆیەوە دەیانەوێ سەرسەختی لە سروش بکەن و ئەو زانستە خوایی و پەروەردگاریانە بۆ عەبقەریەتی موحەممەد بگەڕێننەوە، ئێمە لێرەدا سنور نابەزێنین و پلەوپایەو ڕێزو ڕوەتی پێغەمبەرﷺ ناشکێنین بەڵام نارەوایان پوکەڵ دەکەینەوەو ڕوی ڕاستەقینە وەدەر دەخەین، بۆیە موحەممەد بەتەنها عەبقەری نەبوە بەڵکو پێغەمبەری خواش بوە.

[225] دانەر لەژێر ئەم ناونیشانەدا چوار پەراوێزی لەسەر نوسیوە، هەرکەسێك مەبەستی بێ دەتوانێ لە عەرەبیەکە بیانخوێنێتەوە. وەرگێڕ.

ئالوسی(بەر میهری خوا بێت) لە (مختصر التحفة ل ١٠٠) بۆچونی شیعان رون دەکاتەوەو دەڵێ: شیعەی دوازدە ئیمامی کۆدەنگن لەوەی کە پێشەوا (الامام) لە پێغەمبەرانی ئائولولعەزم باشترە، لە پێغەمبەری کۆتایی باشتر نیە، بەڵام لە ئائولولعەزمەکان هەندێکیان وەکو ئیبنوموطەههەری حللی هەڵوەستەیان کردوە، هەندێکی‌تر پێیان وایە وەکو وانن، ئەم وتەیە پێچەوانەی ئەو وتانەیە کە لە پێشەواکان هاتوە، (کلینی) لە هیشامی ئەحوەل ئەویش لە زەیدی کوڕی عەلی دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەران لە پێشەوایان چاترن، هەر کەسێکیش بە پێچەوانەی ئەمە بڵێ گومڕایە، هەروەها ئیبنو بابەوێ لە صادق دەگێڕێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەران لەلای خوا لە عەلی خۆشەویستترن.

ئالوسی(بەر میهری خوا بێت) بە دەقی قورئان و بەڵگەی ئاوەزیانە بەرپەرچی وتەکانی داوەتەوە، هەروەها لاوازی ئەو دەقانەی وەدەرخستوە کە ئەوان متمانەیان کردۆتە سەر، جا یا ئەوەتە پیاوانی سەنەدەکەی لاوازە یا ئەوەتە لەگەڵ دەقی تری نێو پەرتوکەکانیان ناسازو ناکۆکە، بەرپەرچدانەوەکانی پڕ بە پڕێتی، ئەوەی مەبەستی بێ دەتوانێ لەوێدا پتر لێی بەهرەمەند بێت.

لە پەرتوکەکانی شیعاندا وتەی زۆر لەبارەی بەباشتر دانانی پێشەوایانی تێدایە، عەلی موسای بەهبەهانی لە پەرتوکەکەیدا بەناوی (مصباح الهدایة: چرای ڕێنوێنی) لە (إثبات الولایة: سەلماندنی وەلایەت) لە لاپەڕە (٦١-٦٢)دا دەڵێ: پێشەوایەتی پلەیەکە لە سەروی پلەی پێغەمبەرایەتیەوەیە، بۆیە ئەگەر یەکێك نکۆڵی لە پێشەوایەتی پێشەواکانیان تەنانەت لە یەکێکیشیان بکات ئەوا بەبێبڕوای هەژمار دەکەن، ئیبنو بابەوێی قوممی ناسراو بە صەدوق دەڵێ: بیروباوەڕمان وایە هەر یەکێك نکۆڵی بکات لە پێشەوایەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیبی فەرماندەی بڕواداران و پێشەواکانی تری دوای ئەو، وەکو ئەوە وایە نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی سەرجەم پێغەمبەران کردبێ، هەروەها بیروباوەڕمان

وایە کە هەر یەکێك بڕوای بە عەلی فەرماندەی بڕواداران هەبیو نکۆڵی لە هەر پێشەوایەکی تری دوای ئەو بکات وەك ئەوە وایە بڕوای بە سەرجەم پێغەمبەران هێنابێ و نکۆڵی لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر موحەممەدمان هەبێ[226]، موفید دەڵێ: شیعە ئیمامیەکان لەوە یەکدەنگن کە هەر یەکێك نکۆڵی لە پێشەوایەتی هەر یەکێکیان بکات و نکۆڵی لەو ملکەچبونە بکات کە خوا واجبی کردوە ئەوا بێبڕوایەکی گومڕایە و شایستەی ئەوەیە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا بمێنێتەوە[227]، تەنانەت هەندێکیان پێیان وایە ئینکارکردنی پێشەوایان لە ئینکاری کردنی پێغەمبەران خراپترە، ئەلحللی کە لە لەلای جەعفەریەکان بە (العلامة: فەرەزان) ناسراوە دەڵێ: پێشەوایەتی میهرێکی گشتیە بەڵام پێغەمبەرایەتی میهرێکی تایبەتە، چونکە رۆژگار هەیە پێغەمبەری زندوی تێدا نەبێ بەڵام پێشەوا وانیە، لەبەر ئەوە ئینکارکردنی میهری گشتی لە ئینکارکردنی میهری تایبەتی خراپترە[228].

یەك لە زانایانی شیعە لەدوای ئەم وتەیە دەڵێ: بەراستی جوانی فەرموە!، پاشان دەڵێ: صەدوقیش ئامارەی بۆ ئەمە کردوە کە ئەو کەسەی پێشەوایەتی ناسەلمێنێ شەڕی سێ جەمسەرە، لێی دەگێڕنەوە گوتویەتی: ناصبی لە جولەکە خراپترە، گوتیان چۆن ئەی نەوەی پێغەمبەری خوا؟ گوتی: جولەکە لە میهری پێغەمبەرایەتی بێ بەشن کە تایبەتیە، بەڵام ناصبی لە میهری پێشەوایەتی بێبەشن کە گشتیە[229].

---

[226] رسالة في الإعتقادات/ل ١٠٣.

[227] بحار الأنوار-المجلسي (٣٩٠/٢٣)، مەجلیسی ئەم وتەیەی موفیدی بۆ پەسندی رای خۆی هێناوە.

[228] كتاب الألفين في امامة أمير المؤمنين للحسن بن يوسف المطهر الحلي ٣/١.

[229] تەماشای پەراوێزی ل ٤٣ بکە لە پەرتوکی (النافع يوم الحشر)ی جمال الدين المقداد بن عبدالله السيوري.

## دواهەمین دۆست و دواهەمین پێغەمبەر:[230]

هەندێ سۆفی پێیان وایە دۆستایەتی لە پێغەمبەرایەتی باشترە، هەروەها پێیان وایە دواهەمین دۆست لە دواهەمین پێغەمبەر باشترە، ئیبنو عەرەبی کە بێژەری (ئێکاتی بون- وحدة الوجود)ە، ئەلحەکیمی ترمذیش لەو کەسانەن کە بیروبۆچونیان وایە، بێگومان ئەم بۆچون و پێ‌وابونە ناڕاست و درۆیە، چونکە هیچ ئایەت و فەرمودەیەك نیە بڵێ (دواهەمین دۆست) بونی هەیە، هەروەها نەیانفەرموە فلانیان لە فیسار باشترە چ جای دیاریکردنی یەکێکیان کە لە هەمویان باشتر بێ، هەروەها هیچ خاوەن عیلمێکی جێ‌باوەڕیش نەبوە قسەیەکی لەم بابەتەی هەبوبێ.

بنەڕەتی هەڵەی ئەوانە لەوەدا بوە کە پێیان وابوە مادەم موحەممەد دواهەمین پێغەمبەرە بۆیە باشترینیانە، بێگومان ئەم لێکدانەوەیە ناتەواو ناڕاستە، چونکە پێشتر و پاشترێتی نابێتە مایەی باشترێتی، ئەوەتانێ ئیبراهیمی پێغەمبەرمان لە پێغەمبەر موسا باشتر بوە، هەروەها ئیبراهیم و موسا(سلاوی خوایان لەسەر بێت) لە پێش پێغەمبەر عیساشدا بون کەچی هەردوکیان لەو باشترن.

پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکدا رایگەیاندوە کە چاترین و باشترینی ئەم نەتەوەیە یاوەرانن، تەنانەت ئەگەر موسڵمانێك بەقەد شاخی ئوحد زێڕ ببەخشێ ناگاتە مشتێك بەڵکو نیو مشتی یاوەرێك، هەروەها فەرمویەتی: ((خیر

---

[230] بۆ ئەم بابەتە بگەڕێوە بۆ لوامع الانوار البهية (٢/٣٠٠)، مجموع فتاوى شيخ الاسلام (٢/٢٢٢، ١١/٢٢١، ٣٦٣).

القرون قرني ثم الذين يلونــــهم ثم الذين يلونــــهم: باشترين سەدە ئەو سەدەیە کە من تێیدا دەژیم پاشان سەدەی دواتر ئەنجا سەدەکەی لەو دواتر)).

لە روی زانستیشدا رەنگە پێشینان بلیمەتی وایان لێ هەڵکەوێ پاشینان هەر رێی پێ نەبەن، بەوێنە لە زانستی رێزماندا (سیبەوێ) چتۆ هەڵکەوتو بو کە لەدوای ئەودا دوبارەی نەبۆتەوە.

لەو زانستانەی کە دەکرێ مرۆڤ لێی بەهرەمەند بێ رەنگە پاشین لە پێشین بـالاَتر بـێ، بـەلاَم پێغەمبەرایـەتی شـتێکی تـرە، چونکـە پێغەمبەرایـــەتی و زانستەکەی بەخششێکی خوایی و میهرێکی پەروەردگاریەو بە هۆی کۆشش و ماندوبونەوە وەدەست نایێت.

ئەم جۆرە قسە ناڕاست و نەشیاوانە دەرگای بەدیو بەدکاری و نەگبـەتی خستۆتە سەر گازی پشتێ، هەریەکێك هـەندێك خۆی پێ باش بێ یـان بیـەوێ خـەڵك چەواشە بکات قیت دەبێتـەوەو خۆی دەکاتـە دواهـەمین دۆسـت (خـاتم الأولیاء)! دەڵێ من بەبێ پێناو (واسطة) زانست و زانیاری لە خوا وەردەگرم! بە راستی گومڕاییەکی ناقۆڵاو کارێکی وێرانە، هیچ کەسێك بـۆی نیـە و راسـت ناکات ئەگەر بڵێ من یـان فلاَنەکەس لە پێغەمبـەران باشـترین، هیـچ کەسێکیش راست ناکات و بۆی نیە بڵێ چاکە خوازم و بە رێگایەکی دیکەی جگە لە رێگای پێغەمبەرﷺدا بڕوات.

بەرزو بەرزتریتی لە نێو پێغەمبەراندا:

خوا لە قورئاندا پێی راگەیاندوین کە هەندێ پێغەمبەری لـە هـەندێکی تـر بە بەرزتر و بە باشتر داناوە: ﴿وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾

الإسراء/٥٥، سەرجەم زانایان کۆدەنگن کە پەیامبەران لە پێغەمبەران باشتر و پلە بەرزترن، پاشان پەیامبەرانیش لە نێو خۆدا بەرزو بەرزتریان هەیە، خوا دەفەرموێ: ﴿تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ وَآتَيْنَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ الْبَيِّنَاتِ وَأَيَّدْنَاهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ: ئەو پەیامبەرانەی باسمان کردن هەندێکیانمان بەسەر هەندێکیان بەرز کردۆتەوە هەیانبوە خوا قسەی لەگەڵدا کردوە و هەندێکیانی بە چەند پلەیەك بەرز کردۆتەوە، چەندین نیشانەی ئاشکرامان بە عیسای کوڕی مەریەم دابو و بە جبریلی گیانی پیرۆزیش پشتیوانیمان لێ کرد﴾ البقرة/٢٥٣.

## پەیامبەرانی ئولولعەزم باشتر و پلە بەرزترن:

باشترینی پەیامبەرو پێغەمبەران پێنجن: موحەممەدﷺ، نوح، إبراهیم، موسا، عیسا(سلاوی خوایان لەسەر بێت) ، ئەو پێنجانە خاوەن عەزمن: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ: ئەی پێغەمبەر وەکو پەیامبەرانی ئولولعەزم ئارام بگرە﴾ الأحقاف/٣٥، خوا لە شوێنێکی تردا زیاتر باسی فەرمون: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ: خوا ئەوەی لە دین بۆ ئێوە بە پەیڕەو داناوە کە فەرمانی بە نوح کردبو هەروەها ئەوەی کە لە قورئاندا بۆ پێغەمبەرﷺ دابەزیوە و ئەو فەرمانانەش کە بە ئیبراهیم و موساو عیسامان کردوە ئەوەیە کە دەبێ پەیڕەوی لە دین بکەن و پەرتەوازە نەبن ﴾ الشوری/١٣.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ: بەڵێنمان لە پێغەمبەران وەرگرتوە خەڵکی بۆ خواپەرستی بانگ بکەن هەروەها لە تۆو نوح و ئیبراهیم و موساو عیسای کوڕی مەریەمیش ﴾ الأحزاب/٧.

## پێغەمبەران بە چ بەرزو بەرزترن؟:

هەر یەکێك لەم دو ئایەتە رامێنیٚ کە باسی بەرز و بەرتزێتی پایەی پێغەمبەران دەکات، دەبینیٚ خوا بە سای هەندیٚ بەخشش هەندیٚ پێغەمبەری بەرز کردۆتەوە بەوانی تری نەبەخشیوە، یاخۆ پلەی هەندێکیانی بەسەر ئەوانی تر بەرزتر کردۆتەوە، یان کردوکۆش و بانگەوازێکی گەرمتر و درێژتری ئەنجام داوە و پابەندی زێتری هەبوە بە فەرمانەکان.

داود ﷺ خوا بە زەبور بەهرەمەندی کردوە: ﴿وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا﴾ الإسراء/٥٥، تەوراتی داوەتە موسا ﷺ : ﴿وَإِذْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ وَالْفُرْقَانَ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ البقرة/٥٣، مەبەست لە (الكتاب) تەوراتە، ﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾ المائدة/٤٤، ئینجیلی بە عیسا (سڵاوی خوایان لەسەر بێت) داوە : ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾ المائدة/٤٦.

هەروەها خوا ئادەمی بەوە تایبەتمەند کردوە کە باوکی مرۆڤە و بە دەستەکانی خۆی ئەفراندویەتیو لە روحی خۆی فوی پێدا کردوەو فەرمانی بە فریشتان کردوە سوژدەی بۆ ببەن.

نوحی بەوە پایەدار کردوە کە یەکەمین پەیامبەری سەر روی زەوی بوەو خوا بە بەندەی سوپاسوێژ ناودێری کردوە.

ئیبراهیمی بەوە پایەدار کردوە کە کردوێتی بە ئازیزی خۆی: ﴿وَاتَّخَذَ اللَّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً﴾ النساء/١٢٥، کردیتیە پێشەوای خەڵکان: ﴿إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا﴾ البقرة/١٢٤.

خوا موسای بە پەیام و وتەکانی خۆی پایەدار کردوە: ﴿إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالاَتِي وَبِكَلاَمِي﴾ الأعراف/١٤٤، بۆ خۆی هەڵیبژاردوە: ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾ طه/٤١.

عیسای بەوە پایەدار کردوە کە پێغەمبەری خوایە و بە وتەی (ببە) بوە و جبریلی ناردوە فوی لە یەخەی خاتو مەریەم کردوەو عیسای بەزگ بوە، هەروەها لە منداڵیەوە قسەی لەگەڵ خەڵکدا کردوە: ﴿إِنَّمَا الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ﴾ النساء/١٧١[٢٣١]

---

[٢٣١] وەکو روغمان کردەوە پێغەمبەران بەسای ئەو بەخشش و رێزانەی خوا پێی داون بەرزو بەرزترێتیان هەیە، خەڵك هەیە وەسفی وا دەداتە هەندێ پێغەمبەر پێیان وایە بە گەورەیان گرتوە و رێزیان لێناوە، کەچی لە بازنەی هەق و داد دەردەچن، بۆ غونە زۆر لە موسڵمانە سادەکان هاواری پێغەمبەرمان دەکەن و بۆ غونە دەڵێن: (ئەی یەکەمین خەلقی خوا) هاوار! (ئەی نوری عەرشی خوا) هاوار!، هەڵبەت ئەم جۆرە وتانە چەندین جۆرە گومرایی تێدایە، وەکو هاوارکردنی جگە لە خواو لێ پارانەوەی کە تەنها مافی خوایە، هەروەها بانگەشەی ئەوەی تێدایە کە پێغەمبەرﷺ لە روناکی ئافەریدە کراوە و یەکەمین ئەفراوی خوایە، کەچی ئەم وتانە هیچ بەڵگە و پاساوێکیان نیە ئەوە نەبێ کە چەند بەناو فەرمودەیەکی ناڕاست و

لایەنی تریش هەیە باشترێتی پێغەمبەران دیار بکات، رەنگە پێغەمبەر هەبێ تەنها پێغەمبەر بێ، رەنگە پاشاش بێ، رەنگە تەنها پەیامبەرێکی بەندە بێ، ئەو پێغەمبەرەی بڕوایان پێ نەکردوەو فەرمانبەری و ئەژنەوایی بۆ نەکراوە تەنها پێغەمبەر بوە، بەڵام ئەوەی باوەڕیان پێکردوەو فەرمانبەری و ئەژنەوایی بۆ کراوە، جا ئەگەر تەنها بە فەرمانی خوا فەرمان بکات و هیچ فەرمان لە خۆیەوە دەرنەکات ئەوا پێغەمبەرێکی بەندەیە، بەڵام ئەگەر خۆی فەرمان دەربکات و ودمی درابێ ئەوا پێغەمبەرێکی پاشایە، هەروەکو خوا دەفەرموێتە پێغەمبەر سلێمان: ﴿هَٰذَا عَطَاؤُنَا فَامْنُنْ أَوْ أَمْسِكْ بِغَيْرِ حِسَابٍ: ئەوە بەخششی ئێمە جا ببەخشە یان مەبەخشە بەبێ هەژمار﴾ ص/٣٩.

پێغەمبەری پاشا بەشەمافی پێغەمبەری بەندە بوە هەروەکو بە پێغەمبەرﷺیان فەرمو: (هەڵبژێرە دەبیە بەندەیەکی پەیامبەر یاخۆ پێغەمبەرێکی پاشا).

حاڵەتی پەیامبەرێکی بەندە لە حاڵەتی پێغەمبەرێکی پاشا کاملترە، هەروەکو پێغەمبەرمان کە پەیامبەرێکی بەندە بوە، پشتیوانی لێکراوە و ئەژنەوایی بۆکراوە و خەڵك شوێنی کەوتون، بەسای ئەمەوە پاداشتی وەکو

---

ناتەواوی بۆ وتراوە، چونکە یەکەمین ئەفراوی خوا ئەو پێنوسەیە کە قەدەری هەمو شتێکی پێ نوسراوە، پێغەمبەریش سای خەڵك ئەفرێنراوەو لەوە بوە کە خەڵك لێی دەبن، کە درەنگیش خولقاوە ئەوە ناگەیەنێ پلەی نزم بێ، یاخۆ کە سای خەڵك ئەفراوە ئەوە ناگەیەنێ شان و شکۆی نزم بێ، چونکە ئافەریدان بە پێودانگی لە دایکبونیان بە بەرزو نزم هەڵنانرخێن، چونکە زۆر بڕواداری چاکەکار لە بێبڕوای خراپەکار ئەفراوە بەپێچەوانەوەش.

کوڕەکەی نوح کە بێبڕوا بو و کوڕی پێغەمبەر نوحیش بو، ئیبراهیم کوڕی نازەر بو، ئادەم لە قوڕ ئەفراوە کەچی کە خوا فەراهەمی هێنا فەرمانی بە فریشتان کرد سوژدەی بۆ ببەن، هەرهەمویان سوژدەیان بۆ برد و خوا ناوی هەمو شتێکی فێرکرد، هەروەها بە دەستی خۆی ئەفراندی.

پاداشتی شوێنکەوتوانی بۆ دەنوسرێ، خەڵك لێی بەهرەمەند و میهرەوەر دەبن، ئەویش بەهۆی خەڵك میهرەوەر دەبێ، پێغەمبەرﷺ پاشایەتی هەڵنەبژارد نەبادا پاداشتی کەمتر ببێ، چونکە سەرکردایەتی و پارەیەکی زۆری بەبەر دەستدا دەبو کە لەبەشی پاداشتی ژیانەوەی کەم دەکردەوە.

- لەلای خوادا پەیامبەری بەندە لە پێغەمبەری پاشا باشتر و پلە بەرزترە، لەبەر ئەوەیە کە نوح و موساو عیسا(سلاوی خوایان لەسەر بێت) لە داود و سلێمان و یوسف باشتربون.[٢٣٢]

## پایە و پلەی موحەممەدی دواهەمین پێغەمبەرﷺ:

کە خوا لە رۆژی ژیانەوەدا هەمو مرۆڤایەتی زندو دەکاتەوە، لەو رۆژەدا پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ سەروەری ئادەمیزادانەو بەیداخی ستایش لەدەست ئەو دایەو پێغەمبەرو پەیامبەران لە ژێر بەیداخی ئەودان، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((أنا سيد ولد آدم يوم القيامة ولا فخر، وبيدي لــواء الحمــد ولا فخر، وما من نبي يومئذٍ آدم فمن سواه إلاّ تحت لوائي، وأنا أول شــافع، وأول مشفّع ولا فخر: لە رۆژی ژیانەوەدا من گەورەی هەمو ئادەمیزادانم بێشانازی، ئاڵای ستایش لە دەستی من دایەو پێشین و پاشین ستایشم دەکەن، بێ شانازی، لەم رۆژەدا سەرجەم پێغەمبەران لە ئادەمەوە تا ئەوانیتر لە ژێر ئاڵای منن، من یەکەم تکاخوازم و یەکەم کەسم کە تکام گیرا دەبێ، بەبێ شانازی بەخۆ کردن))[٢٣٣] رواه أحمد و الترمذی وابن ماجة.

---

[٢٣٢] مجموع فتاوی شیخ الإسلام.

[٢٣٣] صحیح الجامع الصغیر (٢/٢١).

لەو ڕۆژەدا کە ئەستەم و ناخۆشی زۆری بۆ خەڵك دەهێنێ و خەڵك ئێجگار هەراسان دەبن، پەنا دەبەنە بەر پێغەمبەرە مەزنەکان، دەچنە لای هەریەکێکیان ڕەوانەیان دەکاتە لای ئەوەیتر، تا دەگەنە لای پێغەمبەر عیسا ﷺ دەڵێ: بڕۆنە لای موحەممەد کە بەندەیەکە خوا لە گوناهی پێش و پاشی خۆشبوە.

بەڵێ، لەم ڕۆژەدا ئەمەیە پایەو پلەی ئەم پێغەمبەرە، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەوپەڕی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو شیرینی هەبوە، ئەوپەڕی کۆشش و تەقەلای لە پێناو خوا داوە و فەرمانبەری کردوە، خوا چەندین پلەو پایەی بەوی و بە بانگەواز و بە نەتەوەکەی بەخشیوە، یەکێك لەوانە وەك چۆن ئیبراهیمی کردۆتە ئازیزی خۆی ئەویشی ئاوەها کردۆتە ئازیز، لە فەرمودەیەکدا کە موسلیم و ئەبوعوانە دەگێڕنەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إن الله اتخذني خليلاً كما اتخذ الله إبراهيم خليلاً))[234].

هەروەها ئەم قورئانە مەزنەی پێ بەخشیوە کە بە هیچ پێغەمبەرێکی تری نەبەخشیوە: ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَاكَ سَبْعًا مِنَ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنَ الْعَظِيمَ: حەفت ئایەتی سورەتی فاتیحەمان بەتۆ داوە کە لە هەمو نوێژێك دوبارە دەبێتەوە، هەروەها قورئانی مەزنمان پێ داوی﴾ الحجر/٨٧.

هەروەها شەش ئاکاری تری پێ بەخشیوە کە بە هیچ پێغەمبەرێکی تری نەبەخشیوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((فضلت على الأنبياء بست: أعطيت جوامع الكلم، ونصرت بالرعب، وأحلّت لي الغنائم، وجعلت لي الأرض طهوراً ومسجداً، وأرسلت الى الخلق كافة، وختم بي النبيون: بە شەش ئاکاران لە

---

[234] تحقيق الطحاوية، تەماشای شرح الطحاوية ل (١٧٥) بکە.

**پێغەمبەران پلە بەرزترم: قسەی نەستەقم پێ بەخشراوە کە وتەیەکی کورت و واتایەکی گەورەو فرە هەڵدەگرێ، بە ترس سەرکەوتوم، کە خوا ترس و لەرزی خستۆتە دڵی دوژمنان و لە پێغەمبەرﷺو شوێنکەوتوانی دەترسن، غەنیمەم بۆ حەڵاڵ بوە، کە بۆ پێغەمبەرانی پێشو حەڵاڵ نەبوە و ئاگرێك لە ئاسمانەوە دەهات سەرجەم غەنیمە کۆکراوەکانی دەسوتاند، زەویم بۆ بوەتە پاك و جێ‌نوێژ کە هەر یەکێك لەم نەتەوەیە لە کوێندەر کاتی نوێژی بەسەرداهات دەتوانێ دەستنوێژ هەڵگرێ ئەگەر ئاو نەبو بە خۆڵ تەیەمموم دەکات و لە مزگەوتێك یاخۆ لە ماڵ یان لە ئاقارێك نوێژی خۆی دەکات، بۆ سەرجەم خەڵکی ناردراوم، عارەب و ناعەرەب و سپی و رەش و هەر رەنگ و رەگەزێك بێ))**[235] رواه مسلم والترمذي [236].

**پێغەمبەرﷺ بۆ هەمو مرۆڤێك چ هی سەردەمی خۆی چ هی پاشتر تا رۆژی دوایی ناردراوە: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا: خەڵکینە! من پێغەمبەری خوام بۆ هەر هەموتان ناردراوم﴾** الأعراف/١٥٨.

---

[235] صحيح الجامع (٢/٢١).

[236] (نەهرۆ) لە پەرتوکەکەی بە ناوی (چەند تیشکێك لە مێژوی جیهاندا) دەڵێ: موحەممەد تەنها بۆ عارەبان ناردراوە. ئەم بۆچونە ناڕاستە، دیانەکان هەر لە کۆنەوەڕا وایان گوتوە، شیخ ئیبنو تەیمیە(بەر میهری خوا بێت) لە پەرتوکەکەیدا بە ناوی (الجواب الصحيح) کۆمەڵە وەڵامێکی گومانەکانی گاورێکی داوەتەوە، یەك لەو گومانانەی کە گاورەکە دەیگوت موحەممەد تەنها بۆ عارەبان هاتوە، وەڵامێکی دورو درێژو تێرو تەسەلی داوەتەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا هەر هێندە دەڵێین کە ئەو تۆمانجە لەگەڵ خۆیدا ناسازە، چونکە ئەگەر یەکێك بڕوای بە پێغەمبەرﷺ هەبێ دەبێ بڕوا بە فەرمودەکانیشی بکات، ئێ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: من بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی هاتوم، کەواتە ئەگەر بڕوادار بن ئەوا دەبێ بڕوا بەم فەرمودەیە بێنن، بەڵام دیارە کە ئەم قسەیە دەکەن هەر بۆ ئەوەیە پاساو بۆ بێبڕوایەکەیان بێننەوە.

**هەروەها خوا وەك چۆن بۆ مرۆڤی ناردوە، بۆ جنۆکەشی ناردوە، شاندێك لە جنۆکان دوای ئەوەی گوێبیستی قورئان بون بڕوایان هێنا و بونە موسڵمان، پاشان گەڕانەوە لای گەلەکەیان و داوای موسڵمانێتیان لێ کردن: ﴿يَاقَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُمْ مِنْ ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُمْ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ، وَمَنْ لَا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءُ أُولَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ: هۆزی خۆمان! وەڵامی بانگبەری خوا بدەنەوە و بڕوای پێ بێنن خوا لە گوناهتان دەبورێ و لە سزای بە ئێش پەناتان دەدات، ئەوەی وەڵامی بانگبەری خوا نەداتەوە قەت لە دەسەڵاتی خوا رزگاری نابێ، جگە لە خواش کەس پشتیوانی لێناکات، ئەو جۆرە کەسانە لە گومراییەکی رون و ئاشکرا دان﴾ الأحقـــاف/٣١-٣٢، جا ئەگەر پێغەمبەرمان دواهەمینی سەرجەم پێغەمبەران بێت، دواهەمینی پەیامبەرانیشە چونکە هەمو پێغەمبەران پەیامبەریش بون.**

**واتای دواهەمین ئەوەیە کە لە دوای ئەودا هیچ پێغەمبەرو پەیامبەرێکی تر نانێردرێن بەرنامەو پێڕەوەکەی بگۆرێ یان فەرمانێك رەش کاتەوە،[٢٣٧] هەرچی**

[٢٣٧] لە دوای پێغەمبەرﷺدا کۆمەڵ ێك بەناو پێغەمبەر پەیدا بون، داوای پێغەمبەرایەتیان دەکردن، وەکو موسەیلەمەی درۆزن، ئەسوەدی عەنەسی و سەجاح، لە هەنگیوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ ناوەناوە ئەگریسێك پەیدابوەو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردوە، سەدەی رابردو عەلی موحەممەدی شیرازی پەیدابو کە لە ساڵی (١٨١٩) لە دایك بو، بەنازناوی (باب) ناوی دەرکردو شوێنکەوتوانیشی بە نازناوی بابیەکان ناودەنگیان دەرکردبو، ئەم ئەگریسە دەمێك دەیوت پێغەمبەرم دەمێکیتر دەیگوت خوام!، هەروەها لە دوای ئەودا یەکێك لە قوتابیەکانی بە نازناوی (بەهائوڵلا) و شوێنکەوتوانیشی بە نازناوی (بەهائیەکان) ناوبانگیان دەرکردبو، هەمان رێچکەی مامۆستاکەی گرتە بەر، هەروەها یەکێکیتر بە ناوی میرزا غولام ئەحمەدی قادیانی پەیدابو و بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، ئێستاش لە هیندستان و ئەمەریکا و ئەڵمانیا و ئینگلتەرا شوێنکەوتوانی ماوە، چەندین بەناو مزگەوتیان کردۆتەوەو موسڵمانانی

دابەزینی پێغەمبەر عیساشە وەکو ئەوەی پێغەمبەرﷺ یادی کردوە بڕوامان پێی هەیە، بەڵام ئەو کە دادەبەزێ فەرمانڕەوایی بە تەورات و ئینجیل ناکات بەڵکو فەرمانڕەوایی بە قورئان دەکات، خاچ دەشکێنێ، بەراز دەکوژێ، بانگ بۆ نوێژ بڕیار دەدات.

## ئەو دەقانەی بەرهەڵستی لە بەرزو بەرزترێتی خستنە نێو پێغەمبەران دەکات:

زۆر فەرمودە لەم بارەوە هاتون، لەوانە: ئەبو سەعیدی خودری(ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((لا تخيروا بين الأنبياء: هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرێکیتر بە باشتر باس مەکەن))[238].

هەروەها ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لا تفضلوا بين الأنبياء: بەرزو بەرتزێتی مەخەنە نێو پێغەمبەران))[239]، مەبەستی ئەم فەرمودانە ئەوەیە کە نەڵێین فلان پێغەمبەر لە فلان باشترە.

---

پێ چەواشە دەکەن، پێشتر خۆیان بە قادیانی ناساندبو، بەڵام ئەمرۆکە بە خۆیان دەڵێن ئەحمەدی، تاوەکو خەڵکی پێ تەفرە بدەن، ئەخیر جاریش لە سودان ئەگریسێکیتر پەیدابو و خۆی کردبوە پێغەمبەر، بەڵام خوا ئەو و ئەوانی تریشی هەر هەمو بە سەرەنجامی سەخت و دژوار گەیاندو لە ناوی بردن: ﴿قُلْ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ﴾: بلێ ئەوانەی خەڵك بە ناوی خواوە تەفرە دەدەن رزگاریان نابێ﴾ یونس٦٩.

[238] متفق عليه (مشكاة المصابيح ٣/١١٤).

[239] أخرجه البخاري (مشكاة المصابيح ٣/١١٤).

ئەم فەرمودانە لەگەڵ ئەو دەقە قورئانیانە ناکۆك و ناساز نین کە باس لە بەرزو بەرتزێتی نێوان پێغەمبەران دەکەن، کەواتە ئەم فەرمودانە لە سونگەی ئەوەدا بەرهەڵستیان کردوە نەخۆ لەبەر دەمارگیری و بەکەمگرتنەوە بێت یان ئەگەر بە باشتر باسکردنەکە ببێتە هۆی بەرپابونی دوبەرەکی و شەڕو ناکۆکی[٢٤٠]، ئەم لێکدانەوەیە لەو فەرمودەیە دەفامرێتەوە کە بوخاری دەگێڕێتەوە: ئەبوهورەیرە(رەزای خوای لێبێ) دەڵێ: (موسڵمان و جولەکەیەك بوە شەڕەقسەیان، موسڵمانەکە سوێندی خوارد و گوتی: بەو خوایەی موحەممەدی بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردوە جولەکەکەش گوتی: بەو خوایەی موسای بەسەر جیهانیاندا هەڵبژاردوە، لەبەر ئەم قسەیە موسڵمانەکە دەستی بەرز کردەوەو شەقازللەیەکی لە جولەکەکە دا، جولەکەکە چوە لای پێغەمبەرﷺو روداوەکەی گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ((لا تخيروني على موسا، فإن الناس يصعقون، فأكون أول من يفيق، فإذا أنا بموسى باطش بجانب العرش، فلا أدري أكان فيمن صعق فأفاق قبلي، أو كان ممن استثنى الله: لە موسا بە باشترم دامەنێن، چونکە لە رۆژی دواییدا کە خەڵك هەر هەمویان لە هۆش خۆ دەچن، من یەکەمین کەسم واگا دێمەوە، موسا دەبینم پەلاماری دامێنی بارەگای داوە و بە توندی گرتویەتی، جا نازانم پێشی من واگا هاتۆتەوە یاخۆ هەر لە هۆش خۆی نەچوە))[٢٤١].

لە بێژانەوەیەکی تری بوخاریدا هاتوە کە فەرمویەتی: ((لا تفضلوني على الأنبياء: بە بەرزترم دامەنێن لە سەر پێغەمبەران))، لە بێژانەوەیەکیتر: ((لا تخيروا بين الأنبياء: پێغەمبەران لەگەڵ یەکتریدا بە باشتر مەگرن)).

---

[٢٤٠] شرح العقيدة الطحاوية ل ١٧٠.

[٢٤١] صحيح البخاري-كتاب الأنبياء-باب وفاة موسى وذكره بعده (فتح الباري ٦/٤٤١).

ئیبنو حەجەر لەم بارەوە دەڵێ: زانایان دەڵێن مەبەست لەو بەرهەڵستیەی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوانەیە کە بە بۆچونی خۆیان بێئەوەی بەڵگەیان هەبێ قسە دەکەن، یان بە شێوەیەکی وا باس دەکەن دەبێتە مایەی بەکەم و بێڕێزگرتنی پێغەمبەرە کەمتر باشەکان، یان دەبێتە هۆی بەرپابونی دوبەرەکی و رکەبەرایەتی، رەنگە مەبەستی ئەوەش بێ کە لە هەمو شتێکدا بە باشتری مەگرن هیچ باشترێتی بۆ ئەوەی تر نەمێنی"[242].

هەروەها هەندێ زاناو خاوەن زانست گوتویانە: ئەو فەرمودانەی لەبارەی بەرهەڵستیکردنی باشترێتی هاتون لەوەدایە کە لەگەڵ نامەوەران مشتومڕ و گفتوگۆ بکرێ، چونکە ئەگەر لە نێوان دو خاوەن دینی جیاواز ئەم باشترێتیە بکرێ ئەوا ئەستەمە لەوە دەرچن کە پێغەمبەری یەکتر بشکێنەوەو لە ئەنجامدا توشی بێبڕوایی ببن، بەڵام ئەگەر باشترێتیەکە بۆ بەراوردی نێوان دو پێغەمبەر بکرێ تا باشترەکەیان دیار بکرێ ئەوا بەرهەڵستیەکە نایگرێتەوە.[243]

---

[242] فتح الباري (٦/٤٤٦).

[243] هەمان سەرچاوەی پێشتر، بۆ زیاتر شارەزابون بگەرێوە بۆ تەفسیری ئیبنو کەثیرو تەفسیری قورتوبی لە ئایەتی ٢٥٣ ی سورەتی بقرة.

## کۆڵەکەی سێیەم

# پەیامە ئاسمانیەکان

# بەندی یەکەم

# بڕواهێنان بە پەیامەکان

## واجبێتی بە راستزانینی پەیامەکان:

یەکێك لە بنەڕەتەکانی بڕواهێنان ئەوەیە کە بەبێ گومان ئەو پەیامانە بەراست بزانێ کە خوا بۆ پێغەمبەرانی دابەزاندوە، هەروەها بڕوای بەوە هەبێ کە پێغەمبەران بەبێ کەم وکورتی بە خەڵکیان راگەیاندوە، خوا بە موسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿يَامُوسَى إِنِّي اصْطَفَيْتُكَ عَلَى النَّاسِ بِرِسَالاَتِي وَبِكَلاَمِي: ئەی موسا تۆم بە پەیام و قسەی خۆم لەسەر خەڵك هەڵبژارد﴾ الأعراف/١٤٤.

هەروەها خوا ستایش و پەسندی پێغەمبەرەکانی کردوە کە بێباکانە بێئەوەی لە سەرکۆنەی خەڵك بترسن پەیامەکانی خوایان راگەیاندوە: ﴿الَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَالاَتِ اللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُ وَلاَ يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلاَّ اللَّهَ: ئەوانەی پەیامەکانی خوا رادەگەیەنن و لە خوا نەبێ لەکەس ناترسن ﴾ الأحزاب/٣٩.

نەتەوەکانی پێشو بە هۆی بێبڕوابونیان بە پەیامەکانی خواوە لەناو چون، سەرنجدە هەڵوێستی پێغەمبەر صالح ﷺ دوای ئەوەی کە گەلەکەی توشی سزا بو چی فەرمو: ﴿فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَاقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَكِنْ لاَ تُحِبُّونَ النَّاصِحِينَ: پشتی تێکردن و وتی ئەی گەلی خۆم من پەیامەکانی خوام بە

ئێوه راگەیاند و ئامۆژگاریم کردن بەڵام ئێوه ئامۆژگارانتان خۆش ناوێت ﴾ الأعراف/٧٩، هەروەها سەرنجدە پێغەمبەر شوعەیبﷺ چی فەرموە: ﴿فَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَاقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالاَتِ رَبِّي وَنَصَحْتُ لَكُمْ فَكَيْفَ آسَى عَلَى قَوْمٍ كَافِرِينَ: روی لەوان وەرسوڕاندو گوتی: ئەی هۆزی خۆم من پەیامەکانی خوام پێ راگەیاندن و ئامۆژگاریم کردن، بەڵام بۆچی خەم بۆ هۆزی بێبڕوایان بخۆم؟﴾ الأعراف/٩٣.

## بڕوا بون بە سەرجەم پەیامەکان:

خوا کە سروشی بۆ پەیامبەران ناردوە رەنگە وەکو تەورات هەر لە ئاسمانێدا نوسرابێتەوە ئەنجا دابەزیبێ: ﴿وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الأَلْوَاحِ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُوا بِأَحْسَنِهَا﴾ الأعراف/١٤٥.

رەنگە وەکو قورئان پەڕتوك بوبێ بەڵام بە خوێندنەوە دابەزیبێ: ﴿وَقُرْآناً فَرَقْنَاهُ لِتَقْرَأَهُ عَلَى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنزِيلاً: قورئانمان بەش بەش و پەیتاپەیتا ناردۆتە خوارەوە تا بە شێنەیی بۆ خەڵکی بخوێنیەوە، بەڵێ هێدی هێدی دامان بەزاندوە﴾ الإسراء/١٠٦.

ئەو پەیامانەی دابەزیون رەنگە لە پەڕتوکێکدا کۆ بوبنەوە وەکو پەڕاوەکانی ئیبراهیم و ئەو پەڕتوکانەی موساو داود و عیسا و موحەممەد(درود و سڵاویان لەسەربێت) دابەزیوە، رەنگە تەنها سروش بوبێ و بۆ پێغەمبەرەکە دابەزی بێ و نەبوبێتە پەڕتوك وەکو ئەو سروشانەی بۆ ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و ئەسباط و ئەو سروشانەی جگە لە قورئان بۆ پێغەمبەرمان دابەزیوە.

**بڕوابون بە تەواوی سروشەکان واجبە:** ﴿قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ: **موسڵمانینە! بڵێن بڕوامان هێنا بە خواو بە قورئان و بەو نامانەی کە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و کوڕانی یەعقوب، هەروەها بەوەی کە دراوە بە موسا و عیسا، وە بەوەی کە دراوە بە هەمو پێغەمبەران لە لایەن پەروەردگاریانەوە، جیاوازی ناخەینە نێوانیان، ئێمە فەرمانبەری خواین** ﴾ البقرة/١٣٦.

**خوا بە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:** ﴿وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لأَعْدِلَ بَيْنَكُمْ: **بڵێ خوا هەر پەرتوکێکی دابەزاندبێ بڕوام پێ هێناوە و فەرمانم پێ کراوە دادگەریتان لە نێودا بکەم** ﴾ الشورى/١٥.

**دەفەرموێتە بڕواداران:** ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَى رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِنْ قَبْلُ: **بڕوادارینە! بڕوا بە خواو بە پێغەمبەر و ئەو قورئانە بێنن کە بۆ پێغەمبەرەکەی ناردوە، هەروەها بڕوا بەو نامانەش بێنن کە لە پێشودا دابەزیون** ﴾ النساء/١٣٦، **خوا چۆنی پێ ڕاگەیاندوین ئاوەها بڕوامان هەیە بە پەڕاوەکانی ئیبراهیم و تەوڕاتی موسا و زەبوری داود و قورئانی هەناردراوی موحەممەدﷺ و قسە لەگەڵدا کردنی موسا و سروشی خوا بۆ صالح و هود و شوعەیب و ئەو سروشانەی کە جگە لە قورئان خوا بۆ پێغەمبەرمان موحەممەدی ناردوە کە پەرتوکەکانی فەرمودەش دەگرێتەوە،**

هەروەها بڕوامان بەوەش هەیە کە چەندین سروش و پەڕتوکی دیکەش هەن بەڵام خوا پێیانی ئاشنا نەکردوین.

## بڕوامان بە پەیامەکان دەبێ چۆن بێ؟:

بڕوامان بە هەمو ئەوانە هەیە کە خوا لە پەڕتوکە ئاسمانیەکانی پێشودا دایبەزاندوە، هەروەها ئەو نەتەوانەی پەڕتوکەکانیان بۆ دابەزیوە ئەوا پەیڕەوی لێکردن و ئەژنەوا بونیان واجب بوە، بڕوامان بەوە هەیە کە پەیامە ئاسمانیەکان لەگەڵ یەکتردا ناساز نین، بەڵکو یەکتر بەراست دەخەنەوە، ئینجیل تەوراتی بە راست خستۆتەوە، خوا لە بارەی ئینجیلدا دەفەرموێ: ﴿مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ الْكِتَابِ﴾ المائدة/٤٨، هەر کەسێکیش بڕوای بە هەر هەناردراوێکی پێشو نەبێ بەبێبڕوا حسێب دەکرێ: ﴿وَمَنْ يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا: ئەو کەسەی بە خوا و فریشتەو پەڕتوکەکان و پەیامبەران و ژیانەوە بێبڕوا بێ ئەوا دوچاری گومڕاییەکی ئەوتۆ بوە ئەوسەری دیار نەبێ﴾ النساء/١٣٦، ﴿إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ: ئەوانەی بە نیشانەو ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوان و فیز بەرزن، دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو هەرگیز ناچنە نێو بەهەشت مەگەر وشتر بە کونی دەرزیەوە بچێت ﴾ الأعراف/٤٠، بڕوامان بەوە هەیە کە شەریعەتی پاشو تەواوی شەریعەتی پێشو یان بەشێکی لێ ڕەش دەکاتەوە، بۆ نمونە بۆ ئادەم ڕەوا بو کچەکانی لە کوڕەکانی مارە بکات، بەڵام دواتر ڕەش بۆوە، بۆ یەعقوب ڕەوا بو لەیەك کاتدا دو خوشك ببێتە ژنی یەك کەس، تەنانەت یەعقوبﷺ خۆی وای کردوە، بەڵام پاشان ڕەش بۆتەوە،

هەروەها ئینجیل زۆر شتی حەرامی تەوراتی حەڵاڵ کردوە: ﴿وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ آل عمران/٥٠.

هەروەها قورئان بەشێکی زۆری تەورات و ئینجیلی ڕەش کردۆتەوە: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ: ئەوانەی پەیڕەوی لەو پەیامبەرە پێغەمبەرو نەخوێندەوارە دەکەن کە لە ئینجیل و تەوراتی لای خۆیان نوسراوە، فەرمانیان بە چاکە پێ دەکات و بەرهەڵستیان لە خراپە لێ دەکات، پاکیان بۆ حەڵاڵ و پیسیان لێ حەرام دەکات، هەروەها ئەو کۆت و زنجیرەشیان لە کۆڵ دەکاتەوە کە دوچاریان بوە﴾ الأعراف/١٥٧.

## بڕوابون بە قورئان تەنها بەڕاست زانین نیە:

بۆ پەرتوکە ئاسمانیەکان تەنها بە ڕاستزانینێکی بێگومان و دڵنیای دەوێت بەڵام بۆ قورئان لەگەڵ ئەم بەڕاستزانینەدا دەبێ کردەوەشی پێ بکات و بەرفەرمانی فەرمان و دورە پەرێزی بەرهەڵستیەکانی بێت: ﴿المص، كِتَابٌ أُنْزِلَ إِلَيْكَ فَلَا يَكُنْ فِي صَدْرِكَ حَرَجٌ مِنْهُ لِتُنْذِرَ بِهِ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ، اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ: ئەلیف لام میم صاد، ئەو قورئانەی بۆتۆمان دابەزاندوە دڵت پێی توند نەبێ بە خەڵکی ڕاگەیەنی، بۆ ئەوەیە خەڵکی

پێ بترسێنی، هەروەها یادەوەریە بۆ بڕواداران، پەیڕەو لەو قورئانە بکەن کە لە لای خواوە بۆتان دابەزیوە و پەیڕەو لە ڕێبازی تر مەکەن و مەیانکەنە بەرنامەی خۆتان، بەڵام مرۆڤ کەمێکیان یادەوەر دەبن ﴾ الأعراف/١-٣.

قورئان تاکە پەڕتوکی ئاسمانیە کە لە دوای پێغەمبەرﷺدا بە خواوە پەیوەندمان بکات، پێغەمبەرﷺ بە یاوەران دەفەرموێ: ((أبشروا فإن هذا القرآن بيد الله وطرفه بأيديكم فتمسكوا به فإنكم لن تهلكوا ولن تضلوا بعده أبداً: موژدەتان بدەمێ، قورئان لە دەست خوایەو دامێنێ لە دەست ئێوەیە، جا دەستی پێوەبگرن، قەت نافەوتێن و قەت گومڕا نابن))[٢٤٤].

قورئان پارێزی بەخشە لە گومڕایی و فەوتان و پەشۆکاوی، پێغەمبەرﷺ زۆر هانی نەتەوەکەی داوە دەستی پێوە بگرن، لە یەکێك لە وتارەکانیدا دەفەرموێ: ((أما بعد، ألا أيها الناس! فإنما أنا بشر، يوشك أن يأتيني رسول ربي فأجيب، وأنا تارك فيكم ثقلين أولهما كتاب الله، فيه الهدى والنور، من استمسك به وأخذ به كان على الهدى، ومن أخطأه ضلَّ، فخذوا بكتاب الله تعالى، واستمسكوا به وأهل بيتي، أذكركم الله في أهل بيتي أذكركم الله في أهل بيتي: خەڵکینە! ئاگاداربن! منیش مرۆڤم، خەریکە نێردراوی خوا بێت و وەڵامی بدەمەوە، من دو سەنگتان بۆ جێ دێڵم-کە قورئان و سوننەتە- یەکەمیان پەڕتوکی خوایەو ڕێنوێنی و روناکی تێدایە، هەر کەسێك دەستی پێوە بگرێ و پەیڕەوی لێ بکات لەسەر ڕێنوێنیە، ئەو کەسەش خۆی لێ وەلا نێ گومڕایە، ئەوجا پەڕتوکی خوا پەیڕەو بکەن و دەستی پێوە بگرن، ئەدی خانەوادەم، ئێوە

---

[٢٤٤] رواه الطبراني، حديث صحيح، صحيح الجامع (١/٦٦).

و خوا لەگەڵ خانەوادەکەم چاك بن، ئێوە و خوا لەگەڵ خانەوادەکەم چاك بن))[٢٤٥] رواه مسلم وأحمد.

ئەو شڕوپەشۆکاوی و ناگزوریەی ئەمڕۆ نەتەوەی ئیسلام لەبەری دەناڵێنێ ئەستەمە لە کۆڵی بێتەوە، مەگەر رو بکەنەوە قورئانی پیرۆز و پەیڕەوی لێ بکەن. ئەم پێداهەڵگوتنە چەند جوان و شایستەیە بۆ قورئانی پیرۆز کە دەڵێ: پەرتوکی خوا؛ باس و خواسی پێشین و پاشینانی تێدایە، ناوبژیکارو دادوەرمانە، وتەکانی یەکلاکەرەوەیە گاڵتە نیە، ئەو کەسەی فەرامۆشی بکات خوا پشتی لە هەردی دەدات، ئەو کەسەی بیەوێ بە ڕێبازیتر ڕێنوێن ببێ گومرا دەبێ، ڕێسمانی سفتی خوایە، یادی فرەزانە، راستەرێیە، ئارەزوی پێ هەڵنافرێوێ، زمانی پێ تێکنائاڵێ، سەمەرەکانی بنی نایێت، زانایان لێی تێر نابن، ئەو کەسەی بە وتەکانی بدوێ راستگۆیە، کردەوەی پێ بکات خەڵات دەکرێ، فەرمانڕەوایی پێ بکات دادپەروەر دەبێ، ئەوەی بۆی بانگ بکرێ بۆ رێی راست ڕێنوێن دەبێ.[٢٤٦]

---

[٢٤٥] صحيح الجامع (١/٤٢٦).

[٢٤٦] ئەم فەرموودەیە ترمزی گێڕایتیەوە، شیخ ناصر الدین لە (شرح الطحاوية ل ٦٨)دا لە بارەیەوە دەڵێ: ئەم فەرمودەیە واتاکانی جوانە بەڵام نیسنادەکەی لاوازە، چونکە حاریثی ئەعوەری تێدایە کە پیاوێکی خاوە بەڵکو بە درۆزنیش تۆمەتبار کراوە، ڕەنگە لە بنەڕەتدا لەسەر عەلی مەوقوف بێ بەڵام حاریث بە ناوی پێغەمبەرﷺ گێڕایتیەوە.

## بەندی دووەم

# بەراوردێك لە نێوان پەیامەکاندا

### یەکەم: ژێدەر و مەبەستی دابەزینیان:

سەرجەم پەڕتوکە ئاسمانیەکان یەك تاکە ژێدەر و سەرچاوەیان هەیە: ﴿الم، اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ، نَزَّلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَأَنْزَلَ التَّوْرَاةَ وَالإِنْجِيلَ، مِنْ قَبْلُ هُدًى لِلنَّاسِ وَأَنْزَلَ الْفُرْقَانَ: ئەلیف لام میم، خوا ئەو خوایەیە کە زندو و راگری بونەوەرە، نامەی قورئانی بۆ ناردوی بە راست و دروستی، نامەکانی پێشو بە راست دەخاتەوە، تەورات و ئینجیلیشی لە پێش قورئاندا ناردە خوارەوە تا خەڵکی پێ رێنوێن بێ، هەروەها قورئانی جوداکەرەوەی رەواو نارەوای هەناردوە﴾ آل عمران/١-٤.

پەڕتوکە ئاسمانیەکان بۆ یەك مەبەست و یەك ئامانج دابەزیون، بۆ ئەوە دابەزیون تا ببنە بەرنامەو پێڕەوی خەڵکانی سەر زەوی، تا بە پێی ئامۆژ و ئاڕاستە و رێنوێنیەکانی خەڵك بەڕێوە ببات، بۆ ئەوە دابەزیوە تا ببێتە گیان و روناکی دڵ و دەرون و تاریکیەکانی بتارێنێ، خوای گەورە لە چەند ئایەتێکدا ئەو ئامانجە رون دەکاتەوە کە تەورات و ئینجیل و قورئانی لە پێناودا دابەزیوە، هەڵبەت ئەم پەڕتوکانە گەورەترین پەیامی ئاسمانین کە خوا دایبەزاندون، دەفەرموێ:

﴿إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِن كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ فَلاَ تَخْشَوُا النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ، وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالأَنفَ بِالأَنفِ وَالأُذُنَ بِالأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ، وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ، وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ الإِنجِيلِ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فِيهِ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ، وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنْكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِنْ لِيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ، وَأَنْ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَنْ يُصِيبَهُمْ بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ، أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾

المائدة/٤٤-٥٠.

سەید قوتب(بەر میهری خوا بێت) لە راڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا[٢٤٧] دەڵێ:

(هەمو ئاینێك كە خوا ناردویێتی بۆ ئەوە بوە ببێتە رێوشوێن و پەیڕەوی ژیان، پێڕەوی ژیانێكی واقیعی، دین بۆ ئەوە هاتوە تا سەركردایەتی ژیانی مرۆڤایەتی بگرێتە دەست و شیرازە و ئاراستەكاری و چاكسازی بۆ رەنگڕێژ بكات، خوای گەورە هیچ دینێكی بۆ ئەوە نەناردوە ببێتە بیروباوەڕێكی روت و لە نێو ویژدان مات بێ، بۆ ئەوە نەبوە ببێتە كۆمەڵە دروشمێكی روتی پەرستنكاری و لە پەیكەر و میحرابدا ئەنجام بدرێن، ئەمانە-لەگەڵ ئەوەی بایەخێكی ئەو پەری پێویستیان بۆ پەروەردەی ویژدانی مرۆڤ هەیە- بەڵام ئەم دوانە بەوە رانا پەرمون سەركردایەتی ژیان بكەن و شیرازە و ئاراستەگاری و چاكسازی رەنگڕێژ بكەن، مەگەر ئەو كاتەی بكرێنە بنچینەی رێوشوێن و پێڕەو و بەرنامەیەكی ئەوتۆ كە لە ژیانی خەڵكدا پیادە بكرێت و فەرمانڕەوایی یاسا و دەسەڵاتی لێ وەرگیرێ و سەرپێچیكارانی پێ سزا بدرێت، ژیانی مرۆڤایەتی هەرگیز راستەڕێ نابێ تا ئەو كاتەی بیروباوەڕ و دروشم و بەرنامەو پێڕەو لە تاقە سەرچاوەیەكی وا وەردەگرن كە وەك چۆن دەسەڵاتی بەسەر ویژدان و رازو نیازدا هەیە، ئاوەهاش دەسەڵاتی بەسەر رەفتار و هەڵسوكەوتدا هەبێ، هەروەها وەك چۆن لە ژیانەوەدا بە گوێرەی پێودانی خۆی سزاو پاداشتی خەڵك دەداتەوە، لە ژیانیشدا بەپێی بەرنامەكەی سزاو پاداشتمان بداتەوە، بەڵام ئەو كاتەی كە دەسەڵات دابەش دەكرێ و ژێدەری وەرگرتن فرەدار دەكرێت..ئەو كاتەی دەسەڵاتی خوا تەنها بۆ ویژدان و دروشمەكان دەبێت و دەسەڵاتی رژێم و بەرنامەو پێڕەویش بۆ كەسانیتر.. ئەو كاتەی دەسەڵاتی خوا تەنها بۆ سزاو پاداشتی ژیانەوە دەبێو دەسەڵاتی ژیانیش بۆ كەسانیتر.. ئەو كاتە ناخی مرۆڤ لە نێو دو دەسەڵاتی جیاواز و دو ئاراستەی جیاواز و دو رێوشوێنی

---

[٢٤٧] تەماشای (في ظلال القرآن) بكە بەشی شەشەم ل ٨٩٥.

جیاوازدا پەرتەوازە دەبیٚ.. ئەو کاتە ژیانی مرۆڤ توشی ئەو ویٚرانیە دەبیٚ کە خوا لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ دەکات: ﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا: ئەگەر خوای تری جگە لە خوا هەبوا ویٚران دەبون﴾ الأنبياء/٢٢، ﴿وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ: ئەگەر هەوساری ڕەوا لە دەست هەوەست و ئارەزوی بیٚبڕوایان بیٚت، ئەوا ئەرزو ئاسمان و هەرچی تیٚیاندا هەیە ویٚران دەبون﴾ المؤمنون/٧١، ﴿ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ: تۆمان بردۆتە سەر ڕیٚبازی شەریعەتیٚك، کەواتە پەیڕەوی لیٚ بکە، پەیڕەو لە هەوەست و ئارەزوی ئەوانە مەکە کە نازانن﴾ الجاثيه/١٨.

بەلیٚ، هەمو دینیٚك لەو پیٚناوەدا هاتۆتە خوارەوە تا ببیٚتە ڕیٚوشویٚن و پەیڕەوی ژیان، ئینجا ئەم دینە بۆ گوندیٚك دابەزیبیٚ یان بۆ نەتەوەیەك یان بۆ تەواوی مرۆڤایەتی و سەرجەم نەوەکانی، دین کە هاتوە لەگەڵ ئەوەی بیروباوەڕیٚکی بۆ بنیاتنانی تیٚڕوانینیٚکی ڕاست و دروست هیٚناوە، لەگەڵ ئەوەی دروشمەکانی پەرستنکاری هیٚناوە تا دڵ بە خوا بەند بکات.. لەگەڵ ئەوانەدا شەریعەتیٚکی دیاریکراویشی هیٚناوە تا فەرمانڕەوایەتی واقیعی ژیانی پیٚ بکات، خوا هەر دینیٚکی ناردبیٚ ئەم سیٚ لایەنە کۆڵەگەی بوە، چونکە ژیانی مرۆڤ چاك و ڕاستەڕیٚ نابیٚ تاوەکو دینی خوا دەبیٚتە ڕیٚوشویٚن و پەیڕەوی ژیان.

لە قورئانی پیرۆزدا گەلیٚ گەواهی و بەڵگە هەن کە باسی ئاینەکانی پیٚشو دەکات کە ڕەنگە بۆ گوندیٚك یان بۆ هۆزیٚك ناردرابیٚ، کەچی هەر بەم تەواوکاریە

بوه، بەڵام لە شێوەیەکی گونجاوی وا کە بۆ ئەو قۆناغە بشێ کە گوندەکە یان هۆزەکە تێیدا دەژێت.

لێرەشدا ئەو تەواوکاریە لە هەر سێ دینی مەزنی یەهودیو نەصرانیو ئیسلام دەخاتە رو، لەم ئایەتانەی ئێستاکە لە دیداری داین یەکەم جار بە تەورات دەست پێ دەکات:

﴿إِنَّا أَنْزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ: تەوراتمان دابەزاندوە رێنوێنی و روناکی تێدایە﴾ المائدة/٤٤.

تەورات-ئەوەی خوا دایبەزاندوە-ئەو پەرتوکەیە کە بۆ رێنوێن بونی بەنوئیسرائیل و روناك کردنەوەی رێگایان بەرەو خوا و رێگای ژیانیان هاتوە.. تەورات بیروباوەری یەکتاناسی و چەندین دروشمی پەرستنکاری جۆراو جۆری لەگەڵ خۆی هێنا.. هەروەها بەرنامەو پێرەویشی هێنا: ﴿يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُوا لِلَّذِينَ هَادُوا وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ﴾ المائدة/٤٤.

خوا کە تەوراتی دابەزاندوە بۆ ئەوە نەبوە بیروباوەرو پەرستنکاریەکانی ببێتە رێنوێن و روناکی ویژدان و دڵ بەس، بەڵکو بۆ ئەوەش بوە تا بەرنامەو پێرەوەکەشی ببێتە فەرمانرەوای ژیانی واقیعی و بە پێی رێوشوێنەکانی بڕوات و ژیان لە چوارچێوەی ئەم رێوشوێنانە بپارێزێ، تاوەکو پێغەمبەرانیش حوکمی پێبکەن کە خۆیان گەردەنکەچی خوا کردوە، کە هیچ نیازێکیان بۆ خۆیان نیە بەڵکو هەرهەموی بۆ خوایە، کە هیچ ویست و دەسەڵات و بانگەشەیەکی تایبەتمەندیەکانی خواوەندێتیان نیە -ئیسلام لە بنەڕەتدا ئەو

واتایەی هەیە- تا حوكمی جولەكەكانی پیٚ بكەن -كە بەرنامەیەكی تایبەت بوە بەوان و لە سنوری ئەوان بە پێی ئاكارەكانیان دابەزیوە-هەروەك چۆن ئەحبارو رەبەنەكانیان فەرمانڕەواییان پیٚ دەكرد كە دادوەر و زاناكانیان بون، ئەوەش چونكە ئەركی پاراستنیٚ پەرتوكی خوایان خرابوە سەرشان و بەوە ئەركبار كرابون ببنە گەواهیدەر لەسەری، گەواهیەكە لە خۆیانەوە بدەن بەو شێوازەی كە ئاڕاستەكاریەكانی ژیانی تایبەتیان دەیانخوازیٚ، هەروەها گەواهی بدەن بۆ هۆزەكەیان بەوەی كە بەرنامەكەیان لە نێودا جێبەجیٚ بكەن.

هەڵبەت بەبیٚ بونی پەیامی ئاسمانی مرۆڤایەتی سەرگەردان و پەرتەوازە دەبێت و لە ڕێبازێك كۆنابنەوە: ﴿كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللَّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِيَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ فِيمَا اخْتَلَفُوا فِيهِ﴾ البقرة/٢١٣.

## دومم: پەیامی گشتی و پەیامی تایبەتی:

پەیامە ئاسمانیەكانی پێشو تەنها بۆ نەتەوەو گەلەكانیان دابەزیوە و تایبەت بوە بەوان، بەڵام پەیامی كۆتایی كە بۆ پێغەمبەری كۆتایی دابەزیوە پەیامێكی گشتی و بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیە، كەواتە دەبیٚ ئەم پەیامە لەگەڵ هەمو پەیامەكانی تر جیاوازی هەبیٚ و بۆ هەمو شوێنكاتێك بگونجیٚ، خوا ئەم ئاكارەی بەم پەیامە بەخشیوە، بەر لە مردنی پێغەمبەرﷺ خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند و فەرموی: ﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا: ئەمڕۆ دینم بۆ ئێوە تەواو كرد و بەخششی خۆم بۆ ئێوە تەواو كرد و خۆشنودم ئیسلام دینتان بیٚ﴾ المائدة/٣.

سەید قوتب(بەر میهری خوا بێت) لە تەفسیرەکەیدا واتای ئەم ئایەتە رون دەکاتەوە و دەڵێ: (بڕوادار کە لە دیداری تەواوبونی ئەم دینەدا رادەوەستێ، کاروان دەبینێ، کاروانی بڕوا، کاروانی پەیامان، کاروانی پێغەمبەران، کاروانێك کە لەگەڵ سپێدەی مرۆڤایەتی هەر لە ئادەمی یەکەم پێغەمبەرەوە(عليه السلام) تاوەکو پەیامی کۆتایی، پەیامی پێغەمبەری نەخوێندەواری سەرجەم مرۆڤایەتی، رێی گرتبێ.. چ ببینێ؟ کاروانی دور و درێژ و یەك لە دوای یەك، کاروانی رێنوێنی و روناکی بە درێژایی رێگا مەشخەڵی رێ دەبینێ، بەڵام دەبینێ سەرجەم پێغەمبەرانی پێش دواهەمین پێغەمبەر بۆ گەل و نەتەوەی خۆیان نێردراون، دەبینێ سەرجەم پەیامەکانی پێش پەیامی کۆتایی بۆ قۆناغێکی دیاریکراوی رۆژگار دابەزیون، پەیامێکی تایبەتی و بۆ کۆمەڵێکی تایبەتی و لە ژینگەیەکی تایبەتی بوە.. هەروەها هەر یەك لەم پەیامانە لە رکێفی بارودۆخەکەیدا بوەو لەگەڵ ئەو بارودۆخەدا گونجاوە، هەرهەمویان بانگەوازی بۆ لای یەك خوا دەکەن-کە بریتیە لە یەکتاپەرستی-هەرهەمویان بانگەوازی بۆ هەمان پەرستنی ئەو خوایە دەکەن-کە بریتیە لە ئیسلام-بەڵام هەریەکەیان بەرنامەو پێڕەوێکی بۆ ژیانی واقیعی هەبوە کە لەگەڵ ژیواری کۆمەڵ و ژینگەو رۆژگار و بارودۆخەکەیدا گونجاو بوە.

ئەم کاروانە بەم جۆرە دەڕوا تا دەگاتە پەیامی کۆتایی کە خوا دواهەمین پێغەمبەری بۆ سەرجەم مرۆڤ ناردوە، پەیامێکی بۆ (مرۆڤ) بۆ ناردوە نەك بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی ژینگەو رۆژگارو بارودۆخێکی تایبەتی.. پەیامێکە لەگەڵ (مرۆڤ) دەدوێ، بارودۆخ و ژینگەو کاتەکانی هەڵبواردوە چونکە لەگەڵ رێختی مرۆڤ سازە کە نە دەگۆڕێ و نە بەراوەژو دەبێتەوەو قەت گۆڕانکاری بەسەردا نایێت: ﴿فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ: خوا مرۆڤی لەسەر رێختی ئیسلام و خواناسی رەخساندوە کە ئافەریدەکردنی خوا

گۆڕانی بۆ نیه، لەسەر ئیسلام بمێننەوە، ئیسلام دینی راست و دروستە﴾ الروم/٣٠.

هەروەها لەم پەیامە کۆتاییەدا زۆر بە وردی بەرنامەو پێڕەوێکی داڕشتوە کە هەمو بوار و لایەنێکی چالاکی ژیانی (مرۆڤی) گرتۆتەوە، ڕێبیری گشتی و هێلی بنچینەیی بۆ ئەم بابەتانە کێشاوە کە لەگەڵ گۆڕانی شوێنکاتدا پەرە دەستێنن، هەروەها ئەحکامی رون و رەوان و یاسای وردی وای داڕشتوە کە بە گۆڕانی شوێنکات ناگۆڕێن و پەرە ناستێنن.. بەم جۆرە ئەم بەرنامەو پێڕەوە لەبەر ئەوەی ڕێبیری گشتی و هێلی بنچینەیی کێشاوە و ئەحکامی رون و رەوان و یاسای وردی داڕشتوە، بۆیە هەر لە سەرەتای هاتنی ئەم پەیامەوە بگرە تاکو رۆژی پایان هەمو رێکخەر و ئاراستە و بەرنامەرێژی و رێکخستنێکی پێویستی ژیانی (مرۆڤ)ی تێیدایە، بۆ ئەوەی بتوانێ لە دەوری ئەم تەوەرە و لە ناو ئەم چێوەیەدا بەردەوام بێت و گەشە بکات و پەرەبسێنێ و نوێ بێتەوە).[٢٤٨]

خوا لە چەندین شوێنیتری قورئاندا باسی تەواوێتی و هەموگرێتی ئیسلام دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ: قورئانمان ناردوە کە رونکردنەوەی هەمو شتێکی تێدایە﴾ النحل/٨٩، ﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ: لەم قورئانەدا هیچ شتێکمان نەپەڕاندوە﴾ الأنعام/٣٨.

پەیامی کۆتایی هەمو چاکیەکانی پەیامەکانی پێشوی لە خۆی گرتوە، هەرچی پێویست و گەرەك بێ زۆر بە تێروتەواوی تێیدایە، حەسەنی بەسرایی(بەر میهری خوا بێت) دەڵێ: (خوا سەدو چوار پەڕتوکی دابەزاندوە، زانستی

[٢٤٨] في ظلال القرآن (٤٨٢/٦).

هەموانی لە تەورات و ئینجیل و زەبور و قورئان کۆکردۆتەوە، پاشان زانستی هەرسێکیانی لە قورئان کۆکردۆتەوە)[٢٤٩].

## سێیەم: پاراستنی پەیامەکان:

پەیامەکانی پێشو بە رۆژگار و کاتێکی دیاریکراو تایبەت بون، بۆیە هەمیشەیی نەبون و خوا پاراستنیانی دەستەبەر نەکردوە، بەڵکو ئەرکی پاراستنەکەیان بە زانایان سپاردرا بو، ئەرکی پاراستنی تەورات بە رەببانی و ئەحبارەکان سپێردرابو: ﴿وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُوا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ وَكَانُوا عَلَيْهِ شُهَدَاءَ﴾ المائدة/٤٤، بەڵام رەببانی و ئەحبارەکان نەیانتوانی بیپارێزن، هەندێکیان ناپاکییان تێدا کردو تەوراتیان گۆڕی و دەستیان تێوەردا، کە تەورات دەخوێنیەوە هەست دەکەی چتۆ گۆڕانکاریان تێ خستوە، نەك هەر بابەتە لاوەکیەکان، بەڵکو لە بابەتە بنەڕەتیەکانیشدا، تەنانەت شتی وایان بە خوا هەڵبەستاوە پیاو موچڕکی بە لەش دادێ، شتی وایان بە پێغەمبەران هەڵبەستاوە تەنانەت بێنمود و هەرزەترین کەسیش شەرمی پێ بێ"[٢٥٠].

---

[٢٤٩] الإكليل للسيوطي (أضواء البيان ٣٣٦/٣).

[٢٥٠] لە بەشی یەکەمی ئەم زنجیرەیەدا (بیروباوەڕ بون بەخوا) هەندێك لەو تۆمانج و هەڵبەستۆکانەمان رون کردۆتەوە کە جولەکەکان بە خوایان هەڵبەستاوە، لە دەروازەی پێشوشدا هەمدیسان ئەو تۆمانج و دەلەسانەمان رۆن کردۆتەوە کە بە پێغەمبەرانیان هەڵبەستاوە، لێرەشدا تەنها یەك نمونە دێنمەوە کە دەقە بنەڕەتی و رەسەنەکەی تەوراتیان گۆڕیوە، ئەم گۆڕینە نەسازی و هاودژێتی خستۆتە نێو تەوراتەکەیان، دەقە بنەڕەتیەکە دەڵێ: (کوڕە تەنیا و خۆشەویستەکەت بگرە و سەری ببڕە) ئەم کوڕە ئیسماعیل بوە، بەڵام جولەکە پێیان نزمی بوە ئیسماعیل و نەوەکانی کە عەرەبەکان دەگرێتەوە، بەم پایەو پلەیە بناسێن، بۆیە وشەی (ئیسحاق)یان تێ ترنجاندوە، بەو مەبەستەی پایەو پلەکە بۆ ئەوان بێت.

بەڵام ئەم پەیامە کۆتاییە خوا بە خۆی دەستەبەری پاراستنی کردوە و بە مرۆڤی رانەسپاردوە، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ: ئێمە خۆمان قورئانمان ناردوە و خۆشمان دەیپارێزین ﴾ الحجر/٩.

سەرنج دە ئەمرۆکە لە جیهاندا، لە رۆژئاواو لە رۆژهەڵاتدا خەڵکێکی بێ ئەژمار هەن قورئانیان سەرلەبەر لەبەرە[٢٥١] بەجۆرێك ئەگەر خوانەناسێك یا جولەکەیەك یا دیانێك بیەوێ یەك پیتی لێ بگۆڕێ ئەوا دەستبەجێ منداڵێك یان کەیخودانێك یان پیرێکی کوێر دەتوانێ هەڵەو زیادوکەمەکەی لێ وەدەر بخات.. ئەدی ئەو زانایانەی ئەزبەریان کردوەو لە واتاکانی گەیشتون و لە زانیاریەکانی تێربون!. سەرنجدە مێژوی ئەم پەرتوکە مەزنە، چتۆ بایەخ و دیدەوانی بۆ کراوە و چتۆ نوسینەوە و تەفسیر و ئیعرابی بۆ کراوە، چیرۆك و سەرگوزەشتە و ئەحکامەکانی چەندین پەرتوکی لەسەر نوسراوە، ئەگەر خوا ویستی لە سەر نەبوا ئەوا قەت ئەو هەمو شاکارانەی بۆ ئەنجام نەدەدرا، بۆیە ئەم قورئانە تا دنیا دنیایە هەر دەمێنێ.

---

دەقی تەوراتە گۆڕاوەکەیان بەم جۆرەی لێ هاتوە: (کوڕە تەنیا و خۆشەویستەکەت کە ئیسحاقە بگرەو سەری ببڕە)–سیفری تەکوین–ئیسحاحی دوەم–بڕگەی (٢)، بەڵام ئەو کەسەی ئەم گۆڕانەی ئەنجام داوە لەوە بێ ئاگابوە کە نەسازیەکی نەشیاوی لەگەڵ دەقەکانی تری تەوراتدا کردوە، لە تەوراتدا هاتوە کە ئیبراهیم ئیسماعیلی بوە تەمەنی ئیبراهیم هەشتاو شەش ساڵ بوە–ئیسحاحی شازدەی سیفری تەکوین–، کەواتە ئیسماعیل تاقە کوڕی بوە، بەڵام ئیسحاق کە لە دایك بوە تەورات دەڵێ: (ئیبراهیم ئەو کاتەی ئیسحاقی بوە تەمەنی سەد ساڵ بوە)–ئیسحاحی یازدەی سیفری تەکوین–بڕگەی (٥).
بزانە! خوا چۆن نەخشەیان لێ دەکاتە نەخشی سەر ئاو و چۆن ریسوایان دەکات، هەروەها لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی (مژدەکان)دا هەندێکم لەو گۆڕانکاریانە باس کردوە.

[٢٥١] چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ﴾ القمر/٢٢.

## چوارەم: شوێنە کۆك و ناکۆکەکان لە پەیامە ئاسمانیەکاندا:

### هەمان ئاین:

ئەو پەیامانەی پێغەمبەران رایانگەیاندوە هەموی لە لایەن خوای زانا و لێزان و کاربەجێ دابەزیون، بۆیە سەرجەمیان راستە رەوازێکی بێ کەند و کۆسپیان پێکهێناوە کە پێشین و پاشین بتوانن بە ئاسانی گوزەری پێدا بکەن. ئەگەر لە بانگەوازی پێغەمبەران رامێنی، بۆت دەردەکەوێ هەر هەمویان بۆ هەمان ئاین بانگەوازیان کردوە کە ئەویش ئیسلامە: ﴿إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللَّهِ الإِسْلاَمُ: دین لەلای خوا ئیسلامە﴾ آل عمـــــران/١٩، لە زمانی قورئاندا ئیسلام دینێکی تایبەتی ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو ئاینە هاوبەشە دەگرێتەوە کە سەرجەم پێغەمبەران بانگەوازیان بۆ کردوە، ئەوەتانێ پێغەمبەر نوح عليه السلام بە گەلەکەی دەڵێ: ﴿وأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنْ الْمُسْلِمِينَ: فەرمانم پێکراوە یەکێك بم لە موسڵمانان﴾ یونس/٧٢، ئیسلام ئەو ئاینەیە کە خوا فەرمانی بە ئیبراهیم؛ بابی پێغەمبەران کردوە پەیرەوکاری بێت: ﴿إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ: کە خوا پێی فەرمو ئیسلام بە، گوتی ئیسلامی پەروەردگاری جیهانیان بوم﴾ البقـــرة/١٣١، هەروەها ئیبراهیم و یەعقوب ئامۆژی منداڵەکانیان کردوە کە بە موسڵمانی نەبێ نەمرن: ﴿فَلا تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾ البقرة/١٣٢، کورانی یەعقوبیش وەڵامیان داوەو گوتیان: ﴿نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ: خواوەندی تۆ دەپەرستین کە خواوەندی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقی باوانتە،

خوایەکی تاك و تەنیایەو ئێمە بۆی موسڵمانین ﴾ البقرة/١٣٣، پێغەمبەر موسا ﷺ به گەلەکەی دەڵێ: ﴿یاقَوْمِ إِنْ كُنْتُمْ آمَنْتُمْ بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُسْلِمِينَ: ئەی گەلی خۆم ئەگەر ئێوە بڕواتان به خوا هێناوە پشت بەوی ببەستن ئەگەر موسڵمانن.﴾ یونس/٨٤، یارانی پێغەمبەر عیساش به عیسا دەڵێن: ﴿آمَنَّا بِاللَّهِ وَاشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ: بڕوامان هێناوە، گەواهی بدە که ئێمە موسڵمانین ﴾ آل عمران/٥٢، کاتێك کۆمەڵە نامەوەرێك گوێیان له قورئان بو وتیان: ﴿قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ: گوتیان بڕوامان هێنا، پەیامەکەت راست وهەقە و لەلای پەروەردگار دابەزیوە، ئێمە بەر لەمە موسڵمان بوین ﴾ القصص/٥٣.

کەواتە ئیسلام هەر لە دێرینترین سەردەمەوە تا سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دروشمی سەرزاری پێغەمبەران و شوێنکەوتوانی بوە.

### ئیسلامبون چۆن دێتە دی؟:

ئیسلامبون[٢٥٢] بریتیە لە فەرمانبەری و پەیڕەو لێ کردن و ئەژنەوا بون بۆ خوای پەروەردگار، بەو جۆرەی فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێ و بەرهەڵستیەکانی واز لێ بهێندرێ، کەواتە لە سەردەمی پێغەمبەر نوحدا ﷺ ئیسلامبون بریتی بو لە شوێنکەوتنی ئەو پەیامەی نوح هێناویەتی، لە سەردەمی پێغەمبەر موسادا ﷺ بریتی بو لە شوێنکەوتنی ئەو بەرنامەو پێڕەوەی موسا هێناویەتی، لە سەردەمی پێغەمبەر عیسادا ﷺ بریتی بو لە

[٢٥٢] لێرەدا وشەی ئیسلام بەواتا زمانەوانیەکەی بەکارهاتوە کە واتاکەی ملکەچبون دەگەیەنێ. وەرگێڕ

شوێنکەوتنی ئینجیل، لە سەردەمی پێغەمبەرمان موحەممەدیشەوەﷺ تا ڕۆژی دوایی بریتیە لە شوێنکەوتن و پەیڕەوکردنی ئەو پەیامەی هێناویەتی.

ناواخنی بانگەوازی پێغەمبەران:

ناواخنی بانگەوازی پەیامبەران و گەوهەری پەیامە ئاسمانیەکان بریتی بوە لە بانگکردنی خەڵك بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنیا و وازهێنان لە پەرستنی بەناو خواکان، قورئانی پیرۆز لە چەندین جێگەدا ئەم دۆزەی دوپات کردۆتەوە؛ یادی نوح دەکاتەوە کە بە گەلەکەی گوتوە: ﴿يَاقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ الأعراف/٥٩، ئیبراهیم بە گەلەکەی گوتوە: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ: خوا بپەرستن و لێی بترسن، ئەوە چاکترە بۆ ئێوە ئەگەر بزانن.﴾ العنكبوت/١٦، هود بە گەلەکەی گوتوە: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ الأعراف/٦٥، صالح بە گەلەکەی گوتوە: ﴿اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ﴾ الأعراف/٧٣، هەروەها دەفەرموێ هەمو پێغەمبەران بۆ هەمان ئەرك و ئامانج ناردراون: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلاَّ نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا فَاعْبُدُونِ: هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ سروشمان بۆ دابەزاندوە کە جگە لە من هیچ خواوەندێکیتر نیە، جا کەواتە بمپەرستن﴾ الأنبياء/٢٥.

لە جێگایەکی تردا سەرگوزەشتەی پێغەمبەران رادەنوێنێ و هەرهەمویان دەخاتە یەك تانوپۆ و بە یەك نەتەوەی خاوەن یەك خوا هەژماریان دەکات: ﴿إِنَّ

هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ: ئەوە نەتەوەکەتانە کە یەك نەتەوەیە، منیش پەروەردگارتانم، بۆیە بمپەرستن ﴾ الأنبيـــــاء/٩٢، لە جێگەیەکی تردا پەیڕەوکردن و پابەندبون بە ڕێباز و ئاین بە لەخۆهێنانەدی بەندایەتی و وەلأمدانەوەی خوا حسێب دەکات، ئەو کەسەش ملکەچ نەبێ بە گومڕاو هەرزەی هەژمار دەکات: ﴿وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلاَّ مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ: چما کێ لە ڕێبازی ئیبراهیم لاڕێ دەبێ مەگەر هەرزە و نادانێك ﴾ البقرة/١٣٠.

لە ئایەتی‌تردا ڕێبازی ئیبراهیم ڕون دەکاتەوە و دەفەرموێ: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ: بە ملکەچی ڕوم کردە خوای ئافەریدگاری ئەرزو ئاسمانان، من لە هاوبەشپەرستان نیم ﴾ الأنعام/٧٩.

لە جێگەیەکی‌تردا دەفەرموێ سەرجەم پەیامبەرو پێغەمبەران ئامۆژگاری دوای خۆیان کردوە پابەندی ئەم ناواخنە بن: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنْ بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا: نامەوەران! ئایە ئێوە لەوێ بون کە یەعقوب هاتە سەر مردن و بە کوڕەکانی وت: دوای من کێ دەپەرستن؟ ئەوانیش گوتیان: خوای تۆ و خوای باب و باپیرانت کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقە، دەیپەرستین کە یەك خوایە و ئێمە فەرمانبەری ئەوین ﴾ البقرة/١٣٣. [٢٥٢]

[٢٥٢] لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر نوح بە هەمان ئامۆژ ئامۆژگاری کوڕەکەی کردوە، عەبدوڵڵای کوڕی عمر(ڕەزای خوای لێبێ) دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: کە پێغەمبەر نوح﷤ لەسەرەمەرگدا بو بە کوڕەکەی گوت: بە دو فەرمان و بە دو بەرهەڵستی ئامۆژگاریت دەکەم: فەرمانت بە لا إلە إلاّ الله

لە جێگەیەکی‌تردا یەکایەتی ئەو ئاینە وەدەر دەخات کە بۆ پێغەمبەرە مەزنەکانی دارِشتوە: ﴿شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلاَ تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ الشورى/١٣.

## پەیامەکانی پێشو هۆیەکانی خوا پەرستی رون دەکەنەوە:

پەیامەکانی پێشو وەنەبێ رەق و روت بە خەڵکیان وتبێ خوا بپەرستن، بەڵکو ئەو هۆیانەیان رون کردۆتەوە کە مایەی راستێتی بانگەوازەکەیان بوە، باسی تایبەتمەندیەکانی خواوەندێتیان کردوە، باسی بەهرەو بەخششەکانی خوایان کردوە، ژیری و ئاوەزیان هانداوە بیر لەو گەردونە پانوپۆڕ و پڕ لە سەمەرەیە بکاتەوە کە هەر خاڵێکی لێ بگرێ نیشانەیەکی مەزنی پەروەردگارێتیە.

ئەوەتانێ پێغەمبەر نوحﷺ روی ئامۆژگاری لە گەلەکەی دەکات و دەفەرموێ: ﴿مَا لَكُمْ لاَ تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا، وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا، أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا، وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا، وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنْ

---

پێ‌دەکەم کە ئەگەر هەر هەفت ئاسمان و زەوی لە تای تەرازوێك دابنێی و (لا إلە إلاّ الله)ش لە لاکەی‌تر، هێشتا تای لا إله إلاّ الله تاسەنگ و قورستڕە، ئەگەر ئەرزو ئاسمانەکان بونە قەفێکی داخراو ئەوا یادی لا إله إلاّ الله سبحان الله وبحمده دەیشکێنێ چونکە ئەمە وێردی هەمو شتێکە، ئافەریدان بەسای ئەم یادەوە بژێویان دەدەرێتێ، هەروەها هاوبەشپەرستی و فیزبەرزیت نەهێ-رواه البخاری في الأدب المفرد ل ٥٤٨، وأحمد (١٦٩/٢، ١٧٠، ٢٢٥)، والبيهقي في الأسماء (٧٩ هندية) (سەرنج بدە سلسلة الأحاديث الصحيحة فەرمودەی ژمارە ١٣٤.

الأَرْضِ نَبَاتًا، ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا، وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ بِسَاطًا، لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلاً فِجَاجًا: ئەوە بۆچی لە گەورەیی خوا ناترسن؟ کە دە چەندین قۆناغ ئافەریدەی کردون، ئایە نابینن کە خوا چۆن حەفت ئاسمانی یەك لەسەر یەکی ئەفراندوە، مانگی گێڕاوە لە ناویانا بە روناك و رۆژیش بە چرا، خوا ئێوەی رواندوە لە زەوی بە رواندن، پاشان دەتانخاتەوە ناو زەوی و ئەنجا دەرتان دێنێتەوە، خوا زەوی بۆ راخستون تا هاموشۆ بکەن بە رێگە کراوەکانی﴾ نوح/١٣-٢٠.

هەمان واتا لە پەڕاوەکانی ئیبراهیم و پێغەمبەر موسادا هاتوە، هەروەکو قورئان دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ إِلَى رَبِّكَ الْمُنْتَهَى، وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى، وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا، وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالأُنْثَى، مِنْ نُطْفَةٍ إِذَا تُمْنَى، وَأَنَّ عَلَيْهِ النَّشْأَةَ الأُخْرَى، وَأَنَّهُ هُوَ أَغْنَى وَأَقْنَى، وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَى، وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عَادًا الأُولَى، وَثَمُودَ فَمَا أَبْقَى، وَقَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَى: سەرەنجام هەر بۆلای خوایە، هەر خوا خەڵکی گریاندوەو پێیکەناندون، هەر خوا مراندوێتی و ژیاندوێتی، هەر خوا جوتی نێرو مێی ئەفراندوە لە دڵۆپە ئاوێك کە دەفیچقێتە ناو منداڵدان، هەر لەسەر خواشە زندوکردنەوەی ئەم جارەش، هەر خوا خەڵکی دەوڵەمەند و نائاتاج کردوە، هەر خوا پەروەردگاری هەسارەی شیعرایە، هەر خوا هۆزی عادی تەفرو توناکرد، هەروەها ثەمودیشی لە ناوبرد کە ئاسەواریان برایەوە، هۆزی نوحیش بەر لە وێرانبونی هۆزی عاد و ثەمود ستەمکارترو یاخی‌تر بون.﴾ النجم/٤٢-٥٢.

## ڕێبیرە هەمیشەییەکان (بابەتەکانی بیروباوەڕ):

بانگەوازی پێغەمبەران تەنها لەوەدا کە بانگەوازیان بۆ خوا پەرستی کردوە یەکیان نەگرتۆتەوە، بەڵکو لە زۆر شتی تریش یەکیان گرتۆتەوە، یەك لەوانە بابەتەکانی بیروباوەڕ بوە کە سەرجەم پێغەمبەران یەك تێروانین و یەك بنچینەیان دامەزراندوە.

ئەوەتانێ یەکەمین پەیامبەر یادەوەری گەلەکەی خۆی بە ڕۆژی دوایی و زندوبونەوە دەکاتەوە، پێیان دەڵێ: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الأَرْضِ نَبَاتًا، ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا﴾ نوح/١٧-١٨.

هەروەها پێی ڕاگەیاندون کە فریشتەو جنۆکە وجودیان هەیە، بۆیە بێبڕواکان وتویانە: ﴿مَا هَذَا إِلاَّ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَنْ يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لأَنزَلَ مَلاَئِكَةً مَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الأَوَّلِينَ، إِنْ هُوَ إِلاَّ رَجُلٌ بِهِ جِنَّةٌ: گەورە پیاوانی هۆزەکەی گوتیان: ئەویش هەروەکو ئێوە مرۆڤە، دەیەوێ لافتان لەسەر لێ بدا، ئەگەر خوا مەبەستی بوایە فریشتەی دەنارد، لە ئەو جۆرە بانگەوازەمان لە باب و باپیران نەیستوە! شێتی لێی داوە و نازانێ چ دەڵێ﴾ المؤمنون/٢٤-٢٥.

لە بانگەوازی پێغەمبەر ئیبراهیم‏ﷺ دا بڕوابون بە ژیانەوە زۆر بە ڕونیەوە دیارە: ﴿وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ قَالَ وَمَنْ كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ: خوایە! بژێوی خەڵکی مەککە بدە لە میوەی جۆراو جۆر، ئەوانەی کە بڕوایان هەیە بە خواو بە ڕۆژی دوایی، خوا

فەرموی: ئەوەی بێبڕواش بێ ماوەیەك بژێوی دەدەمێ بەڵام پاشان دوچاری ئاگری دۆزەخی دەکەم کە خراپترین سەرەنجامە﴾ البقرة/١٢٦.

لە بانگەوازی پێغەمبەر موسادا ئاشکراتر دیارە بۆیە جادوگەران کە بۆ خوا سوژدەن بە فیرعەون دەڵێن: ﴿إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَمَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ وَاللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَى، إِنَّهُ مَنْ يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ لاَ يَمُوتُ فِيهَا وَلاَ يَحْيَا، وَمَنْ يَأْتِهِ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ الصَّالِحَاتِ فَأُولَئِكَ لَهُمُ الدَّرَجَاتُ الْعُلاَ، جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ جَزَاءُ مَنْ تَزَكَّى: ئێمە بڕوامان بە خوا هێناوە تا لە گوناه و ئەو جادوانەمان ببورێ کە تۆ بە خورتی پێت کردوین، پاداشتی خوا لە هی تۆ باشتر و هەرماوەترە. ئەوەی بە تاوانباری بچێتە بەردەستی خوا دەخرێتە ناو دۆزەخ و نەدەمرێ و نە دەژێ، ئەو کەسەش کە بە بڕواداری بچێتەوە دیداری خوا و چاکەکانی کردبێ ئەوا چەندین پلەی بەرزی لەلای خوا هەیە، بەهەشتی عەدن کە ئەو هەمو روبارو جۆگەیەی بەبن دارو درەختەکانی تێدەپەڕێ پاداشتی بڕوادارانە کە لە کوفرو گوناه خۆیان پاك کردۆتەوە﴾ طه/٧٣-٧٦.

لە پەڕاوەکانی ئیبراهیم و موسادا هاتوە کە دەڵێ: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، وَالآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى: بەڵام ئێوە ژیانی دنیا هەڵدەبژێرن، کەچی ژیانەوە باشتر و پایەدارترە﴾ الأعلى/١٦-١٧.

هەروەها هەمو پێغەمبەران نەتەوەکانیان لە هاتنی جەجال ئاگادار کردۆتەوە، ئیبنو عومەر(ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرﷺ دەگێڕێتەوە کە

فەرمویەتی: ((ما بعث الله من نبي إلاّ انذر امته الدجال، انذره نوح والنبيون من بعده: خوا هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ گەلەکەی خۆی لە هاتنی جەجال وریا کردۆتەوە، نوح و هەمو پێغەمبەرانی دواتر باسیان کردوە)) رواه البخاري[٢٥٤].

بنچینە گشتیەکان:

پەڕتوکە ئاسمانیەکان چەندین بنچینەی گشتیان باس کردوە کە لە هەمو سەردەمێکدا پێویستە مرۆڤایەتی لێی هوشیار بێ، بۆ وێنە بنچینەی سزا و پاداشت کە مرۆڤ بەهۆی بەدکاریەکانی خۆیەوە نەك بەهی کەسانیتر سزا وەردەگرێ، هەروەها بەسای چاکەکاریەکانی خۆی نەك بەهی کەسانیتر پاداشت وەردەگرێ: ﴿أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى، وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى، أَلاَّ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى، وَأَنْ لَيسَ لِلإِنسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى، وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى، ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الأَوْفَى: وادیارە هەواڵی نوسراوی پەڕاوەکانی موسای پێ نەگەیشتوە، هەروەها نوسراوی پەڕاوەکانی ئیبراهیمیش کە فەرمانەکەی پێ تەواو بو؟ کە هیچ کەسێك گوناهی کەسی تر هەڵناگرێ، مرۆڤیش تەنها کرد و کۆشی خۆی دادی دەدات، کردو کۆشەکەشی لە رۆژی ژیانەوەدا بۆ دەخرێتەوە رو، پاشان پڕبەپڕی خۆی سزا وەردەگرێ﴾النجم/٣٦-٤١.

هەروەها رزگاربونی راستەقینە لە ئەنجامی مشتومالکردنی ناخ و بەندایەتیکردن بۆ خوا و ژیانەوەخوازی دێتە دی: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى، وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى، بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا، وَالآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَى، إِنَّ هَذَا لَفِي الصُّحُفِ الأُولَى،

---

[٢٥٤] صحيح الجامع (١٣٣/٥)، (فتح الباري ٣٧٠/٦).

صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى: ئەوەی خۆی مشتوماڵ کرد رزگاری بو، کە ناوی خوای هێناو پاڕایەوە، بەڵام ئێوە ژین هەڵدەبژێرن، کەچی ژیانەوە باشتر و پایەدارترە، بێگومان ئەوەی وتمان لە پەڕاوەکانی پێشودا هەیە، لە پەڕاوەکانی ئیبراهیم و موسا﴾ الأعلى/١٤-١٩.

بنچینەیەکیتر ئەوەیە کە ئەوانەی شایستەی بەمیراتگرتنی زەوین چاکەکارانن: ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ: لە زەبوردا لە دوای تەوراتدا نوسیومانە چاکەکاران میراتی زەوی وەر دەگرن.﴾ الأنبياء/١٠٥.

جارێکیان ئەبو ذەر(ڕەزای خوای لێبێ) لە پێغەمبەرﷺی پرسی ئاخۆ پەڕاوەکانی ئیبراهیم و موسا چییان تێدابو، ئەمەش فەرمودەکەیە کە ئیبنوحیببان و حاکم لە ئەبو ذەر دەگێڕنەوە کە دەڵێ:

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا پەڕاوەکانی ئیبراهیم چ بون؟

فەرموی: ((هەموی پەندو قسەی نەستەق و دانسقە بون، دەیوت: هۆ فەرمانڕەوای گرفتاری فیزبەرز، بۆ ئەوەم ئافەریدە نەکردوی کاڵاوپاڵای دنیا لە سەریەك کۆبکەیەوە، بۆ ئەوەم داناوی مافی ستەمدیدە بستێنی، من لێی ناستێنمەوە ئەگەر چی بێبڕواش زەفتی کردبێ.

مرۆڤی هۆشمەند و ژیر دەبێ چەند کاتێکی هەبێ: کاتێکی بۆ پاڕانەوەو نزا بێ، کاتێکی بۆ لەخۆ پرسینەوە بێ کاتێکی بۆ بیرکردنەوە بێ، لە ئەفراوەکانی خوا، کاتێکی بۆ خواردن و خواردنەوە بێت.

ژیر و هۆشمەند دەبێ تەنها بۆ سێ شت سەری خۆی هەڵگرێ: بۆ پاشەکەوتی رۆژی ژیانەوەی، بۆ بژێوی، بۆ چێژێکی حەڵاڵ.

ژیر و هۆشمەند دەبێ رۆژگاری خۆی بناسێ، روی لە شتە چاکەکان بێ، زمانی بپارێزێ، هەر ئەوەندە بدوێ کە کاری پێیە.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا پەڕاوەکانی موسا چۆن بون؟

فەرموی: هەموی ئامۆژگاری بون: سەیرم بەو کەسە دێت کە دڵنیایە دەمرێ و شادمانە، سەیرم بەو کەسە دێت کە بڕوای بە دۆزەخ هەیە و پێدەکەنێ، سەیرم بەو کەسە دێت کە بڕوای بە قەزاوقەدەر هەیە و سەر جەنجاڵە، سەیرم بەو کەسە دێت کە دەوران دەورانی دنیا و خەڵکانی دەبینێ و دڵی بە دنیا خۆشە، سەیرم بەو کەسە دێت کە لە لێپرسینەوەی بەیانی دڵنیایەو کردۆکۆش ئەنجام نادات.))

هەروەها قورئان پێمان رادەگەیەنێ کە هەمو پێغەمبەرەکان تەرازوی داد و دادگەرییان هەڵگرتوە: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ: پەیامبەرانمان بەخۆ بە کۆمەڵە نیشانەیەکەوە ناردوە هەروەها پەڕتوك و تەرازومان لەگەڵدا ناردون تا خەڵك دادپەروەرانە ژینیان بەرێوە ببەن﴾ الحديد/٢٥.

فەرمانیان پێکراوە بژێوی حەڵاڵ پەیدا بکەن: ﴿يا أيها الرسل كلوا من الطّيبات واعملوا صالحاً: ئەی پێغەمبەران! لەو بژێویە پاکانە بخۆن کە پێمان بەخشیون و کردەوەی چاك ئەنجام بدەن﴾ المؤمنون/٥١، زۆر پەرستنکاری هەبوە لەلای

**پێغەمبەرانی پێشوش ناسراو بوە: ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَةَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ: سروشمان بۆ پێغەمبەران کردوە کە کردەوەی چاك بکەن و نوێژ بکەن و زەکات بدەن.﴾ الأنبیاء/٧٣، ئیسماعیل پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی بە خانەوادەکەی کردوە نوێژ بکەن و زەکات بدەن: ﴿وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ﴾ مریم/٥٥، خوا فەرمانی بە موسا کردوە بیپەرستێ و نوێژ بکات تا یادی خوا بکاتەوە: ﴿فَاعْبُدْنِي وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي﴾ طه/١٤، عیسا ﷺ دەڵێ: ﴿وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا: خوا فەرمانی پێ کردوم تا ماوم نوێژ بکەم و زەکات بدەم﴾ مریم/٣١، هەروەها ڕۆژو وەك چۆن لە سەر ئێمە واجب کراوە ئاوەهاش لەسەر گەلانی پێشو واجب کرابو: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ: بڕواداران! ئێوەش وەکو گەلانی پێشو ڕۆژوتان لەسەر نوسرا، جا لە خوا بترسن و ئەژنەوا بن﴾ البقرة/١٨٣.**

**ئیبراهیم ﷺ حەجکردنی واجب کردوە، دوای ئەوەی کەعبەی دروست کرد بانگەوازی بۆ حەج کرد: ﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا﴾[٢٥٥] الحج/٢٧، هەر**

---

[٢٥٥] لە دوای ئەمەدا پێغەمبەران یەکێك لە سونەتەکانیان حەج کردن بوە، موسا و یونس حەجیان کردوە، لە صەحیحی موسلیم هاتوە کە ئیبنو عەبباس دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا بە نێوان مەککەو مەدینەدا ڕابورین، بەلای دۆڵێکدا تێپەڕین فەرموی: (ئەم دۆڵە چیە؟) گوتیان دۆڵی ئەزرەقە، فەرموی: (وەك بڵێی موسا ببینم) (پەنجەکانی ئاخنیوەتە گوێیەکانی و بە دەنگی بەرز و درێژ لەبەیکە دەکا و بەم دۆڵەدا تێدەپەڕێ). دەڵێ: پاشان ڕۆیشتین تا گەیشتینە پێچێك، فەرموی: (ئەمە چ پێچێکە؟) گوتیان: هەرشایە یان لەفتە، فەرموی: (وەك بڵێی یونس دەبینم لەسەر وشترێکی سور بێ و جببەیەکی خوری

نەتەوەیەك جۆرە قوربانیەكی تایبەتی هەبوە: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَى مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ﴾ الحج/٣٤، ﴿لِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ﴾ الحج/٦٧.

هەروەها هەمو پەیامەكان كارە نارەواو ناپەسندەكانیان رون كردۆتەوەو بانگەوازیان كردوە دژایەتی بكرێن، جا ناپەسندكاریەكان بتپەرستی بوبێ، یاخۆ كەشوفشكردن بوبێ بەسەر زەویدا، یان لە رێخت لادان بوبێ وەكو گەلی لوط، یان دەست درێژی كردنە سەر مافی خەڵكان بوبێ وەكو رێگری و تەرازو بازی.

## جیاوازی بەرنامەكان:

وەكو رونمان كردەوە دینی تەواوی پێغەمبەران یەك دین بوە كە ئیسلامە، بەڵام بەرنامەی پێغەمبەران لەگەڵ یەكتریدا جیاوازن، بۆ وێنە بەرنامەی پێغەمبەر عیسا لە هەندێك شتدا لەگەڵ بەرنامەی پێغەمبەر موسا جیاوازە، بەرنامەی پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ لەگەڵ بەرنامەكانی موسا و عیسا جیاوازە، خوا دەفەرموێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا: بۆ هەر كامێكتان-مەبەستی لە نەتەوەكانە-بەرنامەو پێڕەوێكی تایبەتیمان داناوە﴾ المائدة/٤٨، مەبەست لە (شرعة) رێبازو رێوشوێنە، بەڵام ئەو واتایە ناگەیەنێ كە جیاوازیەكی هەموەكیان لەگەڵ یەكتردا هەبوبێ، ئەگەر یەكێك لە بەرنامەكان رامێنێ دەبینێ لە بابەتە بنچینەییەكاندا وەكو یەك و كۆكن، پێشتریش ئەو

---

لەبەردا بێ، مەهاری وشترەكەی لە پوشی خولبە بو بەم شێوەدا دەرزێی) (تەماشای مشكاة المصابیح (١١٦/٣) بكە.

دەقانەمان هێناوەتەوە کە باس لە بەرنامەی نەتەوەکانی پێشو دەکەن وەکو نوێژو زەکات و حەج و خواردنی خۆراکی حەلاڵ، بەلاّم لە بواری چەند و چۆنێتیدا جیاوازن، ژمارەی نوێژو مەرج و پایەکان و ئەندازەی زەکات و شوێنی پەرستنکاریەکانی حەج و ئەو جۆرە شتانە لە بەرنامەیەکەوە بۆ بەرنامەیەکی‌تر دەگۆڕێ، یان رەنگە خوا لە بەرنامەیەکدا لەبەر حیکمەتێك شتێکی حەرام کردبێ، بەلاّم لە بەرنامەیەکی‌تردا حەلاّلی کردبێ.

بۆ ئەم مەبەستە سێ وێنە دێنینەوە:

یەکەم: رۆژو: رۆژوەوان لەگەڵ خۆرئاوابون بەربانگی دەکردەوە، خواردن و خواردنەوە و سەرجێیی ئەگەر نەنوستبا تا وەکو بەیانی بۆی دروست بو بەلاّم ئەگەر بەر لە بەیانی بنوستبا ئەوا تا خۆرهەلاّتی رۆژی دوەم خواردن و خواردنەوە و سەرجێیی لێ حەرام بو، بەلاّم خوا باری ئەم نەتەوەیەی سوك کردو لە خۆرئاواوە تا بەیانی شتی بۆ حەلاڵ کردوە، ئەنجا لەم ماوەیەدا بخەوێ یان نا: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ﴾ البقرة/١٨٧.

دوەم: داپۆشینی شەرمگە لەکاتی خۆشوشتندا بۆ بەنوئیسرائیل واجب نەبو، لە فەرمودەیەکدا کە بوخاری و موسلیم گێڕایتیانەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((کانت بنو إسرائیل یغتسلون عراة ینظر بعضهم إلی بعض و کان موسی

يغتسل وحده: بەنو ئیسرائیل بە روتی خۆیان دەشوشت و تەماشای یەکتریان دەکرد، بەڵام موسا بە تەنیا و دور لە خەڵکی خۆی دەشوشت))[٢٥٦].

سێیەم: چەند شتێکی حەرام، یەك لەوانەی کە خوا بۆ ئادەمی حەلاڵ کردبو پاشان بە یەکجاری حەرام کرا مارەکردنی کچەکانی بو لە کورەکانی، هەروەها لە شەریعەتی پێغەمبەر ئیبراهیمدا (التسري على الزوجة) رەوا بو کە پێغەمبەر ئیبراهیم بەخۆشی ئەو (التسري)یەی بۆ هاجەری خێزانی لەسەر سارەی خێزانی جێبەجێ کرد، خوای گەورە شێوەی ئەمەی لەتەوراتدا لەسەر بەنیئیسرائیلیش حەرام کرد، هەروەها خێزانداریکردنی دو خوشك لە یەك کاتدا شتێکی رەوا بو، تەنانەت یەعقوب ﷺ دو خوشکی خێزان بوە، بەلام پاشان لە تەوراتدا لێیان حەرام کراوە، هەروەها یەعقوب ﷺ گۆشت و شیری وشتری لە خۆ حەرام کردبو[٢٥٧]، هۆی ئەمەش لەم فەرمودەیەدا باسکراوە: (ئیسرائیل (یەعقوب) توشی نەخۆشیەکی سەخت بو، نەخۆشیەکەی درێژەی کێشا، نەزری بۆ بەست کە ئەگەر خوا لەم نەخۆشیەی چاك بکاتەوە خۆشترین خواردن و خواردنەوە لە خۆی حەرام دەکات، خۆشترین خواردنیش لەلای ئەودا گۆشتی وشتر بو، خۆشترین خواردنەوەشی پێی شیری وشتر بو)[٢٥٨]، ئینجا ئەوەی ئیسرائیل لە خۆی حەرام کردبو خوا لە نەوەی ئیسرائیلیشی حەرام کرد: ﴿كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِنْ قَبْلِ أَنْ تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُوا بِالتَّوْرَاةِ﴾ آل عمران/٩٣.

[٢٥٦] صحيح الجامع الصغير ٤/١٦٠.

[٢٥٧] تفسير ابن كثير ٢/٧٣.

[٢٥٨] رواه أحمد في مسنده (تفسير ابن كثير ٢/٧١).

خوا له سورەتی ئەنعامدا ئەو شتانە باس دەکات کە لە جولەکەکانی حەرام کردبو: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٍ وَمِنَ الْبَقَرِ وَالْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَا إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَا أَوِ الْحَوَايَا أَوْ مَا اخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ: له سەر جولەکان گۆشتی هەمو باڵندەو ئاژەڵێکی نینۆکدار(سمدار)مان حەرام کرد کە پەنجەکانی پێیان بە یەکەوە لکاو بن (نەك وەك وشترو مەڕ و بزن و قاز و قورینگ کە پەنجەکانیان نەلکاوە و حەڵاڵ بون) هەروەها بەز و چەوری گا و مەڕ و بزنمان حەرام کرد، مەگەر ئەوانەی لەسەر پشتیان بێ یا لە لابەلای ریخۆڵە بێ، یاخۆ تێکەڵی ئێسقان بوبێ، ئەم حەرامکردنەش لە سزای ستەمەکانیان بو، ئێمە راست بێژین﴾ الأنعام/١٤٦.

ئەم حەرامکردنە بەهۆی پیس و ناخاوێنی حەرامکراوەکان نەبو، بەڵکو بە هۆی ئەوە بو کە یەعقوبی باوکیان ئیلتیزامی بەم حەرامانە کردبو، بۆیە نەوەکانیشی پێ ئیلتیزام کرد، هەندێ حەرامکراوی‌تر لەبەر ستەمی بەنو ئیسرائیل بو: ﴿ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِبَغْيِهِمْ﴾ الأنعام/١٤٦، ﴿فَبِظُلْمٍ مِنَ الَّذِينَ هَادُوا حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَاتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ كَثِيرًا: لەبەر ستەمی جولەکان و رێبەستکردنی بانگەوازی خوا زۆر شتی پاك و خاوێنمان لێ حەرام کردن کە پێشتر بۆیان حەڵاڵ بو﴾ النساء/١٦٠، پاشان پێغەمبەر عیسا هات ﷺ هەندێ حەرامی بۆ حەڵاڵ کردن: ﴿وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ﴾ آل عمران/٥٠، ئەنجا دواین جار پەیامی کۆتایی هات و یاسای حەڵاڵێتی پاك و حەرامێتی پیسانی دامەزراند.

## پێغەمبەران کوڕی یەك باوكن:

پێغەمبەرﷺ وێنەیەكی بۆ ئەم حاڵەتە هێناوەتـەوە كـە ئـاینی پێغەمبـەران هەمان شتن بەڵام شەریعەت و بەرنامەیان جیاوازە، دەفەرموێ: ((الأنبياء إخــوة من علاّت أمهاتـــهم شتّى ودينهم واحـــد: پێغەمبەران برای یـەك بـاوكن، بەڵام دایك جیاوازن، دینیان چون یەكە))[259]، ئەم فەرمودەیە ئەم واتایەی مەبەستە كە بنەڕەتی ئاینی پێغەمبەران هەمان شتە كە یەكتاناسیە، ئەگەرچی لە لقەكانی شەریعەتدا جیاوازن.[260]

## پێنجەم: كورت و درێژی و كاتی دابەزین:

قورئانی پیرۆز درێژترین و بەرهـەراوترین پـەڕتوكی ئاسمانیە، پێغەمبـەرﷺ دەفەرموێ: ((أعطيت مكان التوراة السبع الطوال وأعطيت مكان الزبور المئـــين وأعطيت مكان الإنجيل المثاني وفضّلت بالمفصّل: لە باتی تەوڕات حەفت سورەتە درێژەكەم پێ بەخشراوە و لەباتی زەبور دوسەدەكەم پێ دراوە، لەباتی ئینجیل فاتیحەم پێ دراوە، بە سورەتە موفەصصەلەكانیش سەربار كراوم -كە هـەندێك دەڵێن لە سورەتی حوجوراتەوە تا سورەتی ناس دەگرێتەوە-))[261].

هەموئـەو پەڕتوكـە ئاسمانیانـەی ئێمـە دەیانناسـین لـە مـانگی رەمـەزاندا دابەزیون، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((أنـــزلت صحف إبراهيم أوّل ليلـــة مـــن

---

[259] رواه البخاري ومسلم وأحمد وأبو داود (صحيح الجامع ٢/١٤).

[260] فتح الباري ٦/٤٨٩).

[261] رواه الطبراني فى الكبير (صحيح الجامع الصغير ١/٣٥٠) وقال المحقق اسناده صحيح.

شهر رمضان وأنـــزلت التوراة لست مضين من رمضان وأنـــزل الإنجيل لثلاث عشرة مضت من رمضان وأنـــزل الزبور لثمان عشرة خلـــت مـــن رمضـــان وأنـــزل القرآن لأربع وعشرين خلت من رمضـــــان: پەڕاوەكانی ئیبراهیم لە یەكـەم شـەوی رەمــەزاندا دابـەزیون، تـەورات دوای تێپـەڕبونی شـەش رۆژی رەمەزان دابـەزیوە، ئینجیـل دوای تێپـەڕبونی سـێزدە رۆژ لـە مـانگی رەمـەزان دابـەزیوە، زەبـور دوای تێپـەڕبونی هـەژدە رۆژ لـە مـانگی رەمــەزان دابـەزیوە، قورئانیش دوای تێپەڕبونی بیست و چوار رۆژ لە مانگی رەمەزان دابەزیوە))[٢٦٢].

## هەڵوێستی پەیامی كۆتایی لە ئاست پەیامەكانی پێشودا:

خوا لە چەند ئایەتێكدا ئەم هەڵوێستە رون دەكاتـەوە و دەفـەرموێ: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ: پەڕتوكێكی راست و رەوامان بۆ دابەزاندوی كە بە راستخەرەوەی پەڕتوكەكانی پێشوە و بەسەریاندا بالأدەستە﴾ المائدة/٤٨.

## قورئـان لـە چـەند روێكــەوە پەڕتوكـەكانی پێشـوی بـــە راســـت خستۆتەوە:

یەكەم: یاد و ستایشی قورئان و دابەزینی بۆ سەر مەحەممەدﷺ هەر هەموی لە پەڕتوكە ئاسمانیەكانی پێشودا یادیـان كـراوە، جـا كـە قورئـان بـە هـەمان شێوەی ئەوان باسـی لێوە كـردون بـۆ ئەوەیـە پەڕتوكـەكانی پێشـو بـە راسـت

---

[٢٦٢] رواه الطبراني، صحيح الجامع الصغير (٢٨/٢) وقال الألباني إسناده حسن.

بخاتەوە، هەڵبەت ئەمەش بۆتە مایەی ئەوەی کە ئەو کەسانەی خاوەن هۆشن و بڕوایان بە پێغەمبەران هێناوەو ملکەچی بەرنامەکانی خوان؛ پتر ڕاستێتی قورئانیان بۆ دەرکەوێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّدًا، وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً: بلێ ئێوە بڕوا بێنن یان نا زیاد و کەم ناکات، ئەوانەی پەڕتوکەکانی پێشویان خوێندۆتەوە ڕاستێتی قورئانیان بۆ دەرکەوتوە، بۆیە کە ئایەتەکانی قورئانیان بۆ دەخوێندرێتەوە سوژدە دەبەن و دەڵێن: پاکی بۆ پەروەردگارمان بەڵێنی خوا کارایە﴾ الإسراء/١٠٧-١٠٨، واتە ئەو بەڵێنەی کە خوا لە پەڕتوکەکانی پێشوی نوسیوەو لەسەر زاری پەیامبەران ڕایگەیاندوە کە قورئان دادەبەزێنێ و موحەممەد بە پێغەمبەر دەنێرێ، کارایەو دەبێ بێتە دی[٢٦٣].

دوەم: قورئان هەندێ لەم شتانەی باسکردوە کە لە پەڕتوکەکانی پێشودا باسکراون: ﴿وَمَا جَعَلْنَا أَصْحَابَ النَّارِ إِلاَّ مَلاَئِكَةً وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلاَّ فِتْنَةً لِلَّذِينَ كَفَرُوا لِيَسْتَيْقِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ وَيَزْدَادَ الَّذِينَ آمَنُوا إِيمَانًا: فریشتەمان کردۆتە کاربەدەستی دۆزەخ، ژمارەی فریشتەکان مایەی گرفتاری و سەرگەردانی بێبڕواکانە، بەڵام بۆ نامەوەران مایەی دڵنیایی و ئاوەردار بونە، بۆ بڕوادارانیش مایەی پتربونی بڕوایە﴾ المدثر/٣١، دڵنیابون و ئاوەردار بونی نامەوەران بە هۆی ئەوەیە کە هەمان ئەو زانستەیان لە پەڕتوکەکانیان خوێندۆتەوە کە قورئان باسی کردوە.

سێیەم: قورئان هەوڵی داوە کە پەڕتوکە ئاسمانیەکان لەلایەن خواوە دابەزیون، فەرمانی کردوە بڕوایان پێ بهێندرێ، لە زمانی عەرەبیدا (المهیمن:

---

[٢٦٣] تەفسیری ئیبنو کەثیر (٥٨٦/٢) بە کەمێك دەسکاریەوە.

بالادەستێتی) چاودێری و راگرێتی پێ مەبەستە[٢٦٤]، ناوێکە لە ناوەکانی خوا، چونکە خوا چاودێر و راگری ئەم بونەوەرەیە و مشوریان دەخواو تـەگبیریان دەگێڕێ و چاودێرییان دەکات.

قورئان بۆیە بەسەر پەڕتوکە ئاسمانیەکان بالادەستە چونکە فەرمان دەکات بڕوایـان پـێ بـهێندرێ، هـەروەها راسـتەکانی پەسـند دەکـات و گۆڕیـن و دەسـتتێوەردانەکان وەدەر دەخـات، قورئـان بەسـەر سـەرجەم پەڕتوکـە خواییەکانیتر فەرمانڕەوایـە، چونکـە پـەیامی کۆتـای خواییـە و سـەرەنجام و دادوەری دەبێ بۆ لای ئەو بێ، هەر شتێکیش لە پەڕتوکەکانی پێشودا هـەبێ و پێچەوانەبێ لەگەڵ قورئـان، ئـەوا یـان گـۆڕاو و دەسـت تێـوەردراوە یـان رەش (نەسخ) بۆتەوە.

ئیبنو کەثیر(بەر میهری خوا بێت) دوای ئەوەی وتەی پێشینانی چاك دێنێتەوە لە بارەی واتای (المهيمن)ـەوەو دەڵێ: (ئەم وتانە هەموی لە یـەکتری نزیکن، ناوی ئەلموهەیمین هەمو ئەو واتایانە دەگرێتە خۆ، قورئان بەسـەر هـەمو پەڕتوکـەکان ئەمین و گەواهیدار و فەرمانڕەوایە، خـوا ئەم قورئانـەی-کـە دواهـەمین پەڕتوکە دایبەزاندوە-کردۆتە کۆتاهەمین و تەواوترین و مەزنترین و هەموگرترین پەڕتوك کە هەرچی چاکیەکانی پێشوە لە خۆی گرتوە، تەواومـەندێتی زیـاتری وای پـێ بەخشیوە کە لە هیچکامێکیـاندا نیە، بۆیـە خـوا کردۆتیـە ئـەمین و گـەواهیدار و فەرمانڕەوا بەسەر هەر هەموویاندا)[٢٦٥].

کەواتـە ئـەم قورئانـە دەبـێ بکرێتـە ژێـدەری هـەوەڵ و ئەخیر بۆناسـینی ئـەو ئاینەی کە خوا لە ئێمـەی دەخوازێ، بۆشمـان دروسـت نیـە رەفتـاری جولەکـە و

[٢٦٤] لسان العرب ٨٣٣/٣ مادەی (هـ م ن).

[٢٦٥] تفسير ابن كثير (٥٨٧/٢).

گاوران پەیڕەو بکەین و پەنا ببەینە بەر پەڕتوکە ئاسمانیەکانی پێشو، بەڵکو دەبێ تەنها لە قورئانەوە دادوەری وەرگرین: ﴿وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ، لاَ يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلاَ مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ: ئەوانەی بێبڕواییان بە قورئان کرد سزای خۆیان وەردەگرن، قورئان پەڕتوکێکی بێباکە و بە تەوسی ئەوان لەکەدار نابێ، نە لە پەڕتوکەکانی پێشو و نە لە ئایندەشدا کەم و کورتی و پوکەڵی تێدا نادۆزرێتەوە، چونکە لەلای خوایەکی داناو ستایشکراو دابەزیوە﴾ فصلت/٤١-٤٢.

## دواهەمین شەریعەت ئاتاجی بە شەریعەتی تر نیە:

کۆتاهەمین شەریعەتی خوایی ئاتاجی بە شەریعەتێکی پێشەخۆی یان دوای خۆی نیە، بە پێچەوانەی شەریعەتی موسا کە شوێنکەوتوانی زۆربەی جاران بۆ شەریعەتی تەورات دەگەڕاندەوە، پێغەمبەر عیسا هات شەریعەتی تەوراتی تەواو کرد، لەبەر ئەوە گاورەکان پێویستیان بە پێشبینیەکانی پێشو هەبو کە دەربارەی پێغەمبەر عیسا وترابون وەکو تەورات و زەبور، هەروەها نەتەوەکانی پێش ئێمە پێویستیان بە (موحەددیث) هەبو، بەڵام نەتەوەی موحەممەدﷺ بە هاتنی پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ نە پێویستیان بە پێغەمبەری تر و نە بە (موحەددیث) نەماوە[266].

---

[266] بگەڕێوە بۆ مجموع فتاوى ابن تيمية (١١/٢٢٤).
موحەددیث: ئەو کەسەیە خوا شتی دەخاتە ناو دڵ-وەرگێڕ-.

# ژێدەرەکان


١) الإسلام في عصر العلم لمحمد احمد الغمراوي-طبعة دار الكتب الحديثة- القاهرة.

٢) اضواء البيان لمحمد الأمين الشنقيطي- مؤسسة المدني- القاهرة الطبعة الأولى.

٣) اعلام النبوة للماوردي- نشر مكتبة الكليات الأزهرية- القاهرة.

٤) الإمامة عند الجمهور د.علي احمد السالوس-مكتبة ابن تيمية- الكويت.

٥) انجيل برنابا- طبعة دار القلم بالكويت.

٦) البداية والنهاية لأبن كثير مكتبة المعارف بيروت- الطبعة الثانية.

٧) بصائر ذوي التميز للفيروز آبادي- لجنة احياء التراث الإسلامي- القاهرة.

٨) تفسير ابن كثير- طبعة دار الأندلس- بيروت.

٩) تفسير الألوسي- طبعة المطبعة المنيرية.

١٠) تفسير القرطبي- دار الكتاب العربي- بيروت.

١١) التورات السامرية- طبع دار الأنصار بالقاهرة.

١٢) جامع الأصول لأبن الأثير- مطبعة السنة المحمدية- بالقاهرة- الطبعة الأولى.

١٣) الجواب الصحيح لمن بدل دين المسيح لأبن تيمية- طبع مؤسسة المدني- القاهرة.

١٤) الحكومة الإسلامية للخمينى- نشر الحركة الإسلامية في إيران- وطبع مطبعة الخليج في الكويت.

١٥) حياة محمد لمحمد حسنين هيكل- طبعة دار المعارف- بيروت.

١٦) زاد المسير لأبن الجوزي- طبعة المكتب الإسلامى- بيروت.

١٧) زاد المعاد لأبن القيم المطبعة المصرية ومكتبها- القاهرة.

١٨) الزهر النظر في نبأ الخضر لأبن حجر طبعة المنيرية.

١٩) سلسلة الأحاديث الصحيحة للشيخ محمد ناصرالدين الألبانى طبع المكتب الإسلامى -الأولى.

٢٠) شرح العقيدة الطحاوية لمحمد بن ابي الغزّ الحنفي المكتب الإسلامي- بيروت- الرابعة.

٢١) صحيح البخاري متن فتح الباري- السلفية- القاهرة.

٢٢) صحيح جامع الصغير للشيخ ناصرالدين الألباني- المكتب الأسلامي- بيروت- الأولى.

٢٣) صحيح مسلم بشرح النووي- المطبعة المصرية- القاهرة.

٢٤) صحيح مسلم متن النووي على مسلم.

٢٥) عالم الجن والشياطين للمؤلف- مكتبة الفلاح- الكويت.

٢٦) عالم الملائكة الأبرار للمؤلف- مكتبة الفلاح- الكويت.

٢٧) عقائد الإمامية لمحمد رضا دار الغدير- بيروت.

٢٨) عقائد الإمامية الأثنىعشرية لإبراهيم الموسوي الزنجاني مؤسسة الأعلمي للمطبوعات- بيروت.

٢٩) العقيدة الإسلامية لعبدالرحمن حبنكة الطبعة الأولى- دمشق.

٣٠) العقيدة في الله للمؤلف- مكتبة الفلاح- الكويت.

٣١) فتح الباري شرح صحيح البخاري لأبن حجر العسقلاني- طبع السلفية.

٣٢) في ظلال القرآن لسيد قطب- طبعة دار الشروق.
٣٣) لسان العرب لأبن منظور- اعداد يوسف خياط ونديم مرعشلي، دار لسان العرب- بيروت-الأولى.
٣٤) لوامع الأنوار البهية للسفاريتي- طبع على نفقة حكومة قطر.
٣٥) مجموع فتاوى شيخ الإسلام جمع ابن قاسم- طبع الرياض-الأولى.
٣٦) مجموعة رسائل المنيرية- طبعة مصورة ببيروت.
٣٧) محمد نبي الإسلام.
٣٨) مختصر التحفة-الأثنى عشرية- لمحمود شكري الألوسي- طبع المطبعة السلفية-القاهرة-١٣٧٨.
٣٩) مختصر صحيح مسلم- المكتب الإسلامي- بيروت.
٤٠) مسند الإمام احمد- تصوير المكتب إسلامي- بيروت.
٤١) مشكاة المصابيح- للتبريزي- طبعة المكتب الإسلامي- دمشق- الأولى.
٤٢) المصباح المنير للفيومي- طبعة دار المعارف- القاهرة.
٤٣) معجزات المصطفى لخيرالدين وائلي- مؤسسة ومكتبة الخافقين-دمشق.
٤٤) مفتاح دار السعادة لأبن القيم- طبعة صبيح- القاهرة.
٤٥) الملل والنحل للشهرستاني-دار المعارف- بيروت.
٤٦) نبوة محمد من الشك الى اليقين- د.فاضل السامرئي. مكتبة القدس- بغداد.
٤٧) نظرات في النبوة لصلاح الدين مجيد- مكتبة القدس- بغداد.
٤٨) نيل الأوطار للشوكاني- طبعة الحلبي- القاهرة- الطبعة الثانية.
٤٩) هداية الحيارى لأبن القيم- ضمن مجموع بعنوان: الجامع الفريد- نشر دار الأفتاء- الرياض.

# فەرهەنگۆك

خوێنەری بەڕێز..

واتای زۆربەی ئەم فەرهەنگۆکەیەم لە فەرهەنگان دەرهێناوە، هەر فەرهەنگەشم بە پیتێك هێما کردوە:

(خ): فەرهەنگی خاڵ، شێخ محمدی خاڵ.

(هـ): هەمبانە بۆرینە، هەژار موکریانی.

(م): فەرهەنگی مەهاباد، گیوی موکریانی.

(ق): قاموسی زمانی کوردی (ع،ب)، عبدالرحمن امین زەبیحی.

| ئەلف | |
|---|---|
| ئابوتاب | وان و ڕێك و پێك (هـ). |
| | ڕازاوەو بە ڕەونەق (ق). |
| ئاتاج | چاو لە کۆمەڵ، موحتاج (هـ). |
| ئاپۆرە | کۆمای خەڵك پێکەوە (هـ). |
| ئاخنین | تێپەستاوتن، بەزۆرتێڕاکردن (هـ). |
| ئاوارتە | شتی دەربڕاو (مستثنی) (خ). |
| ئاسەوار | شوێنەواری کەون، پاشماوەی ڕەچەڵەك (هـ). |
| ئاوەر | باوەڕو یەقین، دڵنیایی (خ). |
| ئاوەز | هۆش، فام (العقل) (هـ). |
| ئافەریدە کردن | (الخلق) (م). |
| ئافەریدە | (المخلوق) (م). |
| ئافەریدگار | (الخالق) (م). |
| ئاهەڕا | کوێرەوەری (هـ). |
| ئامێز | باوەش (هـ). |
| ئالودە | گیرۆدە، خۆپێگرتو (هـ). |
| ئاساسمێن | ئاسا: باو، عادەت |
| | سمین: کونکردن (هـ)، الخرق |
| | ئاساسمین: خارق العادة |

## ئەلف

| | |
|---|---|
| ئاسا | وەکو (هـ). |
| ئەبڵەق | مۆلەق بونی چاو (هـ). |
| | چاوی داپچڕاو کە تەماشای جێگایەکی تایبەتی نەکات (خ). |
| ئەسپەردەکردن | سپاردن (خ). |
| | هەر شتێکی بە کەسێك درابێ بە ئەمانەت (ق). |
| ئەفراندن | (الخلق) (م). |
| ئەژنەوابون | گوێڕایەڵی، بەرفەرمانی (الإطاعة، السمع والطاعة). |
| ئەنگێزە | هۆ، مایەی سەرەکی (هـ). |
| | هەر شتێکی کەسێك هان بدا بۆ کردنی کارێك، (الباعث، الدافع) (ق). |
| ئەفسوس | وتەی دەربڕینی خەفەت، داخ و خەفەت (خ). |
| ئەرکبار | ئەرك: التكليف. |
| | ئەرکبار: المكلّف. |

## ب

| | |
|---|---|
| باتی دانەوە | لە بری، جیات (هـ)، التعويض. |
| | بات: هەرکار یاشتێکی وەبەر شتێ یا کارێکی‌دیکە بکەوێ یا وەبەری بخرێ(ق) کەفارەت. |
| باك | ترس (هـ.خ.ق) پەروا (ق). |
| بەرتوان | لە تواناداهەبون (القابلية). |
| بەرچاوەکی | ئەو شتانەی بەچاو دەبینرێن جیهانی بەرچاوەکی (العالم المشهود) |
| بەڵگەخوازی | بەڵگە هێنانەوە (الإستدلال). |
| بەژ | بەشی وشکایی لە زەوی (خ). |
| بەند | الفصل. |
| بڕست | وزە، هێزو توانا (هـ). |
| بڕوا | الإيمان. |
| بریکار | وەکیل (هـ). |
| بنچینە | (القاعدة). |

## ب

| | |
|---|---|
| بولێڵە | ماوەیەك پاش ئاوابونی رۆژ لە ئاسۆ کە دنیا نە بەتەواوی روناك بێ و نە تەواویش تاریك (ق). |
| بێژین | وتن. |
| بێژیار | المروي عنە |
| بێژانەوە | وتنەوە (الروایة) فەرمودەناسی. |
| بێژەرەوە | الراوي |
| بیانوبڕین | بیانو نەهێشتن (إقامة الحجة). |
| بیروباوەڕ | العقیدة. |
| بێرون | چۆڵ و بیابان (هـ). |
| بێسروشتی | سەردەمی بێسروشتی: الفترة |
| | ئەوسەردەمەی هیچ پێغەمبەرێکی تێدا نەهاتوە. |

## پ

| | |
|---|---|
| پابەند | المقید |
| پاچڤە | وەرگێڕان (هـ) الترجمة. |
| پارێزراوێتی | العصمة. |
| پاکی کردن | تسبیح |
| پاشاگەردانی | تێکەڵ و پێکەڵی و هەرکەس هەرکەسی (هـ). |
| | بێ سەروبەری (الفوضی). |
| پا | بەرانبەر (هـ). |
| پاشینان | الخَلَفْ. |
| پاکانە کردن | البراءة. |
| پاساودان | تعلیل (م). |
| پەرتەوازە | پەرت و بڵاو |
| پەری | حۆری |
| پەرگەندە | التشتت (م). |
| پەرژان | دەست گەیشتن بۆ کردنی کارێك (خ). |
| پەرکەم | فێ (خ)، خوداری (هـ)، الصرع (م). |

## پ

| | |
|---|---|
| پەنامەكی | نادیار، جیهانی پەنامەكی: عالم الغیب. |
| پەرستكار | العابد. |
| پەیڕەو | بەرنامە، دەستوری كار (المنهج)(ھ). |
| پەی بردن | تێگەیشتن، زانین (ھ). |
| | (الإدراك) (م). |
| پەڵە | لەكە (ھ). |
| پەیداكردن | هێنانەدی (الإیجاد). |
| پیادە | پێ ڕۆیشتن، پراكتیزە كردن، (تطبیق). |
| پێخوست | بەرپێ دراو (ھ). |
| | شوێنێكە زۆر بەسەریدا ئاموشۆ بكرێ (خ). |
| پێشەنگ | سەرجەڵەی كاروان (القدوة، الأسوة)(ھ). |
| پێكان | لەشتدان بە تێگرتنی شتێك بۆی (الإصابة)(خ). |
| | هەنگاوتن (ھ). |
| پێز | كێش‌و هێز (ھ). بەرەكەت. |
| پێشینان | پیاوچاك‌و زانایانی پێشان (السلف). |
| پێودانگ | ئەندازە، ڕێوشوێن‌و دەستور (ھ). |
| پێناو | خاتر، هۆ، ڕێگە (الوسیط)(ھ). |
| پوكەڵ | بەتاڵ‌و ناوخاڵی، پوچ (باطل)(ھ). |

## ت

| | |
|---|---|
| تامەزرۆگاری | الترغیب. |
| تاسە | حەزرەت. |
| تاو وتوێ | سەنگ‌و سوك كردنی دو دەفر كە شتێكیان تێدابێ تا بەقەد یەكیان لێ بێ (خ). |
| تانە | پەڵەی سەر گلێنەی چاو (ھ). |
| تارومار | پەرش‌و بڵاو (خ). |
| | تێك‌و پێك، لەناوچو (ھ). |
| تاڵۆكە | پەلەپەل و دەست و برد.(خ) |

## ت

| | |
|---|---|
| تەوس | پلارهاویشتن (خ). |
| | قسەی بە تێکوڵ (هـ). |
| تەکینەوە | دورکەوتنەوە، کشانەوە لەکاریٚ (هـ). |
| تەواوەمەندێتی | الکمال. |
| تەنتەنە | سەنسەنە، جەلال و شکۆ (هـ). |
| ترۆپ | ترۆپك: دوندی کێو بڵندترین شوێن لە دار (هـ). |
| توانج | سەرکۆنە، تانە (هـ). |
| تۆمانج | بوختان. |
| توناوتون | بەیەکجاری فەوتان و ئاسەوار نەمان (هـ). |
| توك | دوعا لێکردن، نزای خراپ (هـ). |
| تکاخوازی | الشفاعە. |
| توێکل | توێژی تەنکی سەر شتان (خ). |
| تۆکمە | شتی ناوپڕی قایم (هـ). |
| تۆزکاڵ | کەمترین ئەندازە (هـ). |
| تۆژینەوە | بە بەنج و بنەوانی کارێکدا رۆیشتن (هـ). |
| تێپەڕی | المبالغە. |
| تێسرەواندن | لێدان لە پڕو لە ناکاو (هـ). |
| تیرۆژ | ئەو تیشکانەی لەکلاوڕۆژنە دێنەژوری. |
| تێڕوانین | التصوّر. |

## ج

| | |
|---|---|
| جەنجاڵ | هەراو هۆریا، زەنازەنا (هـ). |
| جڵەو | هەوسار، رەشمە، قامچی لغاو (هـ). |
| جنین | وردکردن بە چەقو (هـ). |
| جێباوەڕ | باوەڕپێکراو (الپقە). |
| جمە | بەسەریەکدا کەوتنی مەردوم لە شوێنێکدا (ج) |

| | |
|---|---|
| **ج** | |
| **چاوگ** | سەرچاوە، مصدر (خ). |
| **چەندوچۆن** | التفصيل. |
| **چەمك** | مەفهوم. |
| **چەوێڵ** | شتی چەوتی لار (خ). |
| **چزاندن** | پێوەدانی چزودار (خ). |
| | داغ پێوەنان (ه). |
| **چنگاڵ** | نانی لەرۆن گوشراو (ه). |
| **چوستی** | چالاکی (الكفاءة) (ه). |
| **چیغ** | پەردەی لە قامیش کە بەدەوری رەشماڵدا رای دەنگێون (ه). |
| **چین** | ریزێك لە شت (طائفة) (خ). |
| **خ** | |
| **خەڵەفاو** | هۆش نەماو لەبەر پیری (ه). |
| **خەفتان** | خەفتانی سروش، الفترة |
| | سەردەمی بێسروشی. |
| **خرۆشان** | ئوران، هیجان (م). |
| **باسوخواس** | هەواڵ و دەنگوباس. |
| **د** | |
| **داڵدە** | پەنا. |
| **داخوازی** | مقتضی. |
| **داکۆکی** | پشتیوانی، لاگیری، تەقەلا، کۆش (ه). |
| **دانستە** | تایبەتی (ه). |
| **دانسقە** | کەم وێنەو نایاب (ه). |
| **دەستور** | ودم. |

| د | |
|---|---|
| دەستەبەر | زامن ، کەفیل. |
| دەروازە | دەرگای گەورە (الباب) (هـ). |
| دڕدۆنگ | بە گومان،دودڵ (هـ). |
| | کەسێکە لە یەکێك دڵگیر بوبێ (خ). |
| دژمەند | دژکار، نقیض، ضد. |
| دژوار | سەخت (هـ). |
| دزێو | ناحەز، ناشیرین (هـ). |
| دنە | هانە، هەڵخراندن (تحفیز) (هـ). |
| دۆز | مەبەست، ئامانج (هـ.خ) القضیة. |
| دیان | گاور، فەلە، خاچپەرست. |
| دیزە | دەفری گڵ شیو تێدا لێنان (هـ). |
| دیدەوان | چاودێر، ئێشکگری بان قەڵا. |

| ر | |
|---|---|
| رابون | هەستان (خ.هـ). القیامة |
| راداشتن | ئاماژە، إشارة (م). |
| راگواستنەوە | نقل. |
| راجفرین | راچەنین، راجلفین. |
| راستاڵی | الإستقامة. |
| رادەداری | التفاوت. |
| رام | کەوی (هـ). |
| راستەڤان | راست و بێ‌لاری‌و خواری، راستەقینە (هـ). |
| رەها | ئازاد، مطلق. |
| رەگاژۆ | رەگ داکوتان. |
| رەتبردن | لەرێ هەڵەنگوتن. |

| ر | |
|---|---|
| رەمەكی | مرۆڤی كەس نەناس و لە چینی بەرەوژێر، ئاسایی (هـ). |
| رەزم | إیقاع. |
| رەچاوكردن | لەبەرچاو گرتن (مراعاة). |
| رەوش | الوضع. |
| رەوت | تەرزی رۆیشتن، سیاق. |
| رەخ وڕو | لا. |
| رەبەن | رەهبان. |
| رەواز | شوێنێ كە زۆر رێگەی هاتوچۆی خەڵكە (هـ). |
| رەتان | ماندوبونی گیاندار لەبەر زۆر لنگدانی (خ). |
| ركێف | دەسەلات. |
| رەوزن | وتەیەكە گیانداری ئێسك قورسی پێ دەچوێندرێ (خ). |
| رێوشوێن | دەستوری كار، (النهج). |
| رێبیر | بیروباوەرێكە كە مەردوم لەسەری بێ (مبدا) (خ). |
| رێسمان | گوریس، پەت، كندر. |
| رێخت | سروشت (الفطرة) (خ). |

| ز | |
|---|---|
| زەیستان | ژنێ كە تازە منداڵی بوبێ. |
| زایەڵە | دەنگدانەوە (هـ). |

| ژ | |
|---|---|
| ژەمەنبوردە | ژەمبوردە: كەسێكە لە پاش نەخۆشی و نەخواردنێكی زۆر ئارەزوی خواردنی كرابێتەوە (خ). |
| ژنەوتن | بیستن (خ.هـ). |

## ژ

| | |
|---|---|
| ژێدەر | بنەما، رەگەزی وشە، (منشا، مصدر) (ه). |
| ژیوار | باری ژیان، چۆنیەتی ژیان (حاڵەت) (ه). |
| ژێربێژی | منطق. |
| ژین وژیانەوە | دنیاوئاخیرەت. |

## س

| | |
|---|---|
| ساز | ئامادە، کۆك. |
| سازان | رێکەوتنی یەکێك لەگەڵ یەکێکی تردا (خ). |
| ساڵۆزی | التجاهل (م). |
| سەرانسوێ | سوچ، گۆشە، قولینچك، الزاوية. |
| سەرپاك | تێکرا (مجمل) (ه). |
| سەرزەنشت | لۆمە (ه). |
| سەرپشك | الإختيار. |
| سەروساخت | ئاسیاوی‌و ئاشنایی لەگەڵ یەکێك (خ). |
| سەنگرانەوە | سڵ کردن، پرینگانەوە، تەکینەوە. |
| سەرەنگرێ | رەت بردە، هەڵەنگوتە (ه). |
| سەرمەشق | نمونە بۆ فێرکردن (ه). |
| سەیرمان | التعجب. |
| سا | (لەبەر) بۆ هۆی پەسەند. |
| سەبارەت | هۆ. |
| سەرگوزشتە | چیرۆکی رابوردە (ه). |
| سەنسەنە | کەش وفش، تەنتەنە. |
| سەرومڕ | هەمیشە (خ). |
| سەرگەرد | بەلا گەردان، قوربان (ه). |
| سەراسیمە | داماو، سەرگەردان (ه). |

| س | |
|---|---|
| سەرکۆنە | سەرزەنشت (العتاب) (هـ). |
| سەقام | ثابت، القرار. |
| سفت | چنراوێکە کە شاش نەبێ (خ). |
| سۆ | گومان. |
| سۆما | هێزی دیتن (هـ). |
| سۆراخ | بە دوی شتی گومبودا گەڕان (المبحث) (هـ). |
| سیمورغ | باڵدارێکی چیرۆکی‌و خەیاڵی، العنقاء. |
| سروش | الوحي. |
| سیغناخ | شتی پڕی ئاخنراو (خ) |

| ش | |
|---|---|
| شاقاو | هەنگاوی زل (هـ). |
| شاند | ر ەوانەکراو، الوفد. |
| شەتەکدان | داپێچانی توند (هـ). |
| شەمزان | ژاکان، ڕەنگ پەڕیو (هـ). |
| شەیپور | زوڕنای لەشکر، بۆڕی (هـ). الصور |
| شرۆڵ | مەردومی ڕیپاڵی شڕپۆخ (خ). |
| شڕوشیتاڵ | شتومەکی شڕی هەلا هەلا (خ). |
| شنینەوە | لەرین لەبەربا (هـ). |
| شینبون | سەوزبونی گیاودار (هـ). |
| شێمانە | الإحتمال. |
| شیرازە | بن درونی پەڕەکتێب پێکەوە (النظام) (هـ). |
| شوێنپایە | المقام. |

| ف | |
|---|---|
| فەراهەم | ئامادە، تەیار (ھ). |
| فەروفیت | خێروبەرەکەت (ھ). |
| فراژو | بەخۆداهاتن و گەشەکردن (خ). |
| فرمزان | زۆرزان (ھ). |
| فزە | سرتەی کەم، دەنگی بەحال، نکە (ھ). |
| فیز | الکبر. |
| فێ | خو، پەرکەم، صرع. |
| فروسمان | الایحاء. |

| ق | |
|---|---|
| قەرەبو | التعویض. |
| قەڵەمڕەو | دەسەڵات |

| ک | |
|---|---|
| کارا | زۆرئیشکەر، فعال. |
| کارامە | مەردومی دەرهاتوی کارزان (خ). |
| کاکڵ | ناوەڕۆکی بادام و گوێزو هەردەنکێك. |
| کاوێژ | جونەوەی ئاژاڵ شتی ناو سکی خۆی بەیەق کردنەوەی بۆ ناو دەمی. |
| کاکیبەکاکی | دەشتی پانی دوورودرێژی چۆل وهۆل. |
| کەمایەسی | کەم و کوری و ناتەواوی (ھ). |
| کەوشەن | سنور (ھ). |
| کەلو | بورج. |
| کەشم و نەشم | جوانی و نازوعیشوە (ھ). |
| کەشەنگ | شەکەت (المرهق) (ھ). |
| کەرەنا | جۆرێ شەیپوری زل(ھ) الصور. |

## ك

| | |
|---|---|
| كه يخودان | پیاوی عاقڵ و بەمشور (ە)، رب البیت. |
| كلۆڵ | چارەرەش (ە). مەردومی بەدبەخت (خ). |
| كرۆك | ناواخن. |
| كردگار | الصانع. |
| كۆدەنگی | الإجماع. |
| كۆك | ساز، نێوان خۆش (ە). |
| كۆپارە | دوگی وشتر (ە). |
| كۆسكەوتو | بەدبەخت بون (ە). ئاتاج بون و بێ یاریدە مانەوە. |

## گ

| | |
|---|---|
| گاڵە | داخستن (ە). |
| گاڵدان | داخستنی دەرگاو پەنجەرە (ە). |
| گاور | فەلە، خاچ پەرست (ە). |
| گەندەڵ | رزیو (فاسد) (ە). |
| گەمژە | گەوج، گێژ (ە). |
| گەوزان | تل خواردن لەسەر تەنیشت (ە). |
| گزی | فێڵ (ە) (خیانەت). |
| گوزارە | واتا، نیاز، قسەیەك، رونكردنەوە (ە). هەواڵ. |
| گوزارشت | تعبیر. |
| گۆرەوشار | فشارو پێكهاتنەوەی گۆڕ بۆ مردو. |
| گوشاد | فرەوان (ە). |
| گوزەر | رابردن، بورین (ە). |
| گوناهپۆشی | كفارة الذنوب. |
| گیرسانەوە | بەندبون لە شوێنێ (ە). |
| گیرۆدە | گرفتار (ە). |

| | |
|---|---|
| **ل** | |
| لارێیون | لەرێ لادان (الإنحراف) (ه). |
| لالوتی | کەسێ کە دەنگی لە یەکێك گۆڕیوە (الإنکار) (ه). |
| لامل | عیناد. |
| لارێیون | لەفەرمان دەرچون (ه). |
| لاکەلا | بزاوی سەربەخۆی لە دەسەڵات بەدەر. |
| لەمپەر | بەرگر، کۆسپ (ه). |
| **م** | |
| مامۆتك | زۆرعاقڵو زانا (ه). |
| | گزیرو دەمڕاستی دێ یان گەرەك (خ). |
| مایە پوت | نابوت (ه). (مفلس، بدون رصید). |
| مەرەد | حاڵ، بار (ه). |
| مەن | کێشانەیەکە (صاع) (ه). |
| متەق | حرکة، حس (م). |
| مشتوماڵ | خاوێن بونەوەی تیرو کانزا (التزکیە) (ه). |
| مشور | تەگبیروڕا (ه). |
| مشورخۆر | سەرپەرشت، ئاگاداری کار (ه). |
| مۆتەکە | کابوس |
| مۆریلە | خوران و تەزی پێست (ه). |
| مۆژدەبەخش | البشیر |
| مۆژدەگار | البشیر |
| مورژدەگاری | |
| **ن** | |
| ناخ | ژورەوەی هەر شتێك (النفس) (ه). |
| ناسۆر | برینێکە درەنگ چاك بێتەوە (خ). المعاناة |
| ناگزور | دەستەنگ (ه). |

## ن

| | |
|---|---|
| نامەوەر | خاوەن نامەكان (اهل الكتاب). |
| ناساز | ناكۆك، ناگونجاو (المتناقض). |
| ناوێزە | بژاردە، تایبەتی (الفرید) (هـ). |
| ناوزەد | ناونان. |
| ناودێر | ناونراو، بەناوبانگ (هـ). |
| ناكام | كەسێكە بە كامو خواستی خۆی نەگەیشتبێ (خ). (ناكاملی بروا). |
| نامۆ | بیانی، بێگانە، غەوارە، غەریبە (هـ). |
| ناواخن | شتێكە ئاخنرابێتە دو توێی شتێكی ترەوە (خ). |
| نەتەوەی ئیسلام | امة الاسلام |
| نەرێ | النفي. |
| نەژاد | رەسەن، رەچەڵەك، بنچینە (هـ). |
| نەشم | الأسلوب (م). |
| نغرۆبون | تغوّر (م). |
| نكوڵی | الإنكار. |
| نێردە | البعثة. |

## هـ

| | |
|---|---|
| هەموگر | الشامل. |
| هەڵبەت | بێگومان، بێ سۆ (هـ). |
| هەڵبواردن | خۆلێ لادان (هـ). |
| | بواردن و پەراندنی شتێك لەناو چەند شتێكدا ناوبەناو (خ). |
| هەرمێن | رمێن، برەو (هـ). |
| هەژماركردن | حیساب كردن. |
| هەوادار | لاگر (هـ). لایەنگیر. |
| هەماهەنگی | التنسیق. |
| هەموار | رێك وپێك كەوتو (هـ).رێی خۆش. |
| هەزارمزیلە | كۆمەڵێ زۆر لە منالە ورتكە(هـ)(ازدحام، ضوضاء: للناس والحشرات)( |
| هەڵبەستراو | (الموضوع)ی فەرمودەناسی. |

## هـ

| | |
|---|---|
| هەڕشەگار | النذير. |
| هەڵوستە | وێستانێکی کەم بە دیار شتێکەوە (خ). |
| هەندەکی | الجزئي. |
| هەمومکی | الكلّي. |
| هەرد | شوێنی هەڵەتو بەردەلانی (خ). |
| | عارد، زەوی، شاخی سەختو پڕبەرد (هـ). |
| هەرمومزی | گەلەکۆمەکی. |
| هەنگی | هەنگێ: ئەوسا، ئەودەم (هـ). |
| هەنوکە | ئێستا (هـ). هەوکە. |
| هەوار | وار، زستانەوار (هـ). |
| هەنگامە | هەراوهۆریا (هـ). |
| هەرزە | سەرسەختو لاسار (سفیه)(هـ). |
| هزر | بیر، فکر (هـ). |
| هێکرا | |

## ی

| | |
|---|---|
| یارانی ڕێبازو کۆمەڵ | أهل السنة والجماعة. |
| یادگە | الذاكرة. |
| یەکتا | تەنیای بێ وێنە (الأحد) (ه). |
| یەکخواناسی | یەکخواپەرستی، یەکتاناسی، خوابەیەکناسین، (التوحيد). |
| یەکڕاست | یەکەوسەر، دەستبەجێ. |
| یەکالا | ڕەهایی تاڵی ئاڵۆزو تێکەلاو (هـ) التشريح. |

# ڕشتەی بابەتەکان

**بەندی سێیەم: ئەرکی پەیامبەران**



**بەندی چوارەم: سروش**



**بەندی پێنجەم: سیفاتی پێغەمبەران**

**بەندی شەشەم: پارێزراوێتی پەیامبەران**

**دوه م : موژدەی نەتەوەکانی پێشو**

## دەروازەی دووەم: پەیامە ئاسمانیەکان

